# ئایین و قۆرخکردنی حەقیقەت



نوسینی : واسق غازی
وەرگێرانی: زێبارعەزیزخان مهاجیر
پێداچوونەوەی : مەسعود عبدالخالق

ناسنامەی

ناوی کتێب : ئایین و قۆرخکردنی حەقیقەت

نووسینی : واسق غازی

پێداچوونەوەی : مسعود عبدالخالق

وەرگێڕانی : زنبار عەزیز خان م. لمهیر

بابەت : ئایینی

دیزاین : محمد حسێن خەتی

بەرگ :

چاپ : یەکەم - هەولێر - ٢٠١٦

نرخ :

بڵاوکراوەی : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

کتێبخانەی
**حاجی قادری کۆیی**
دیزاین - چاپکردن - بڵاوکردنەوە
٠٦٦ ٢٢٢٢٨٦٨
٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧
عێراق - کوردستان - هەولێر



**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٢٥ ) ی ساڵی ( ٢٠١٦ )ی پێدراوە**

**Mdmaktaba@gmail.com**

# ئایین و قۆرخکردنی حەقیقەت

## چەند ڕا و بۆچوونێک لەبارەی ڕەخنەگرتن لە بیرکردنەوە و ڕەفتاری ئایینی


نووسینی: واسق غازی

بەکوردی کردنی: زنبار عەزیزخان مهاجیر

پێداچوونەوەی: مەسعود عبدالخالق



کوردستان ــ ٢٠١٦

## پێشکەشە :

بەوانەی پرسیار دەکەن لەبارەی مانای حەقیقەت و ڕاستی؛ هەوڵ و کۆشش دەکەن بۆ پەیی بردن بە لق و پۆپەکانی.... بەوانەش کە بڕوایان وایە حەقیقەت قۆرخ ناکرێ، بەڵکو موڵکی هەمووانە... ئەوانەی پێیان وایە دانایی و دادگەری هەیە لە پاڵ فرە ئاینی، ئاینێك نییە لێرەدا ڕاستی قۆرخ بکات... بەوانەی ڕێز دەگرن لە گشت ئاینەکان و دەیانەوێ هەموو ئاینەکانیش ڕێزیان لێ بگرن... ئەوانەش باوەڕیان وایە بیرۆکەی قۆرخ کردنی حەقیقەت، سەر و لوتکەی گشت تووند و تیژی و دەمارگیری و تاوان و هەڵەیەکە.

ئەم کتێبە پێشکەشی گشت ئەوانە دەکەم.

# نـــاوەڕۆك

## پرسیارێك

نـاكرێ هـزر دەسـتی بەسـەردا بگـیرێ، ئەسـتەمە بیروبـاوەڕ بەنـد بكـرێ، توونـدوتیـژی تـەنها توونـدوتیـژی بەرهـەم دەهـێنێ، ئایـا بـەزەیی و ڕەحم بەخۆمان نەكەین، تا شایستەی میهرەبـانی خوا بین، ئەوانی دیكەش زیاتر بەزەییان پێمانـدا بێتەوە؟

(ئالها حوسێن، ساڵی ١٩٧٣)

## پێداچوونەوەو هەڵسەنگاندن

(الدين واحتكار الحقيقه) کتێبەکە بە عەرەبی دەرچووە تیایدا بە ووردی باسی لەو هەموو هەڵەو هۆکارانەی دواکەوتنی جیهانی ئیسلامی دەکا ، پرۆژەی کتێبی (حاجی قادری کۆیی) پێ ی باش بووە خوێنەری کورد لەو زانیارییانە بێ بەش نەبن ، هەڵساوە بە وەرگێڕانی و ئەو کارەشی بە (زێبار عەزیز خان) سپاردووە ئەویش وەرگێڕانەکی زۆر سەرکەوتووانەی بۆ کردووە ، سروشتی وەرگێڕان هەر ئەوە نیە لە هەردوو زمانی وەرگێڕان شارەزابیت ، بەڵکو دەبێ لە بابەتەکەشی باش قووڵ بییەوە ، (وەرگێر) لە هەردوو ئاستدا بە سەرکەوتوویی لێ ی دەرچووە ، بەلاّم بابەتەکە خۆی زۆر هەستیارە ، هەڵبەتە لەگەڵ زۆربەی ئەو بابەتانەی نووسەری کتێبی (الدين واحكتار الحقيقه) داین ، گرنگە ئەو بابەتانە ببیتە مادەی گفت و گۆی ڕەوشەن بیران و نووسەرو مامۆستای ئایینی کوردستانم ، بەلاّم لەگەڵ زۆر لای نووسەر نیم لە بۆچوونەکانی ، لە دەست نیشان کردن و وەسف و عنوان و ... زۆر لای تر . زۆر بە کورتی هەڵسەنگاندێك و خوێندنەوەیەکی بۆ دەکەین .

هەڵبەتە هەڵسەنگاندن مانای هەردوو دیوی سەلبی و ئیجابی دەگرێتەوە ، تەقەلای نووسەرو وەرگێڕو پڕۆژەی (حاجی قادری کۆیی)یش زۆر بە گرنگ

دەنرخێنین ، لەوەش گرنگتر هەوڵی هەمووومان ئەوەیە ئیجابیەكانی ئەو كتێبە بگەیەنینە خوێنەرانی كوردو سەلبیاتەكانیشی دەرخەین :

<u>ئیجابیاتی</u> : ئەوەی كەمێك شارەزایی هەبێت بە ڕوونی هەست بەوە دەكات جیهانی ئیسلامی لە بارودۆخێكی زۆر دواكەوتوون لەچاو پێشكەوتنی جیهان ، سەرەڕای ئەو دواكەوتنە دیمەنیشی زۆر ناشیرین بووە لەبارەی كاری دژ بەم مرۆڤانە بەناوی ئایین ، ئەم بارودۆخە زیاتر جیهانی عەرەبی بەتایبەتر دەگرێتەوە نەك هەموو میللەتانی ئیسلام .

ئێمە چارەمان نییە ئەم بارودۆخە دواكەوتەییەی جیهانی ئیسلامی لە نێوان ئایین و ئایینپەروەران هەر دەكەوێتە ئەستۆی ئایین پەروەران ، نەك ئایین ، ئایین بەمانای دەق و پەیامەكانی خوایی ، كە قورئان و فەرموودە ڕاستەقینەكان دەگرێتەوە ، هەرچی كارو فكری ئایین پەروەرانیشە ئەوا فیقهو فكرو عەقیدەو ... هەموو ئەوانە دەگرێتەوە كە تێگەیشتنی ئاینین ، واتە ئایین و تێگەیشتنی ئایینی لێك جیایە ، لەو كتێبەش دەیەوێ پێت بڵێ فقهو فكری ئیسلامی و عەقیدەی ئیسلامی خودی ئایین نیە ، بەڵكو تێگەیشتنە لە ئایین ، دەكرێ ئەو تێگەیشتنە سەلامەت بێت ، دەشكرێت هەڵەو پەڵەو زێدەڕەوی بێت .

یەکێ لە هۆکارەکانی دواکەوتن ئەوەیە فقهو فکرو خودی ئایین تێکەڵ کراوە ، هەموویان بە سەوابت و پیرۆز وەردەگیرێ ، لەکاتێکدا فقهو مەزهەب و تایفەو تێگەیشتنی بەشەری بۆ ئایین ، ئایین نیە ، تێگەیشتنێکە بۆ سەردەمی خۆی ، تێگەیشتن بەپێ ی بارودۆخی کۆمەلآیەتی سەردەمی خۆی ، کاتێ سەردەم و کۆمەڵگە دەگۆڕێت زۆربەی ئەو تێگەیشتنە ئێکسپایەر دەبێت ، بەلآم ئایین هەر سەوزو زیندوو و نەمرە ، بۆیە تێگەیشتنێکی نوێ ی دەوێ ، ئەو پرۆسەیە پێ ی دەووترێ (نوێ کردنەوە —تجدید) یان جاریش وایە پێ ی دەووترێت (چاکسازی) کەواتە نوێ کردنەوەو چاکسازی لە ئایین ناکرێت ، لە تێگەیشتنی ئایینی دەکرێت ، لە فقهو فکرو عەقیدەو ... هتد ، ئەوەیان نەکراوە ، لەو کتێبە هەوڵدراوە ئەو مەیدانە داخراوە بکاتەوە ، دەربازێك بۆ ئەو هەموو قەیرانە بێنێتەوە ، بەهۆی چارەسەرکردنی ئەو پرس و دۆسیانەی خوارەوە :

١) هەوڵیداوە هەر سێ چەمکی (ئایین و ئاییندار و ئاینگەرا) لێك جیا بکاتەوە ، ئەو لەو عنوانە زۆر سەرکەووتوانانە بووە بەلآم لە ناوەرۆك تەقەلآی باشیداوە بۆ ئەوەی هۆکاری دواکەوتن بخاتە ئەستۆی پۆلەکانی دوو و سێ ، هەتا لەوانەشی لێك جوودا کردنەوەیەکی کردووە لە نێوان (ئایندارو ئاینگەرا) .

نووسەر پیٚ ی وایە نابێت لە ئایین گومان بکەی ، بەڵام لە بەرهەمی ئاینداران گومان وەك منهج پێویستە کە بزوێنەری فکرو زانستە ، دەشڵێت مەرج نیە ئاینداری باب و باپیرانمان و (سەلەفی پێشوو) ئایندارییەکی ڕاستەقینە بێت ، ئەو وای نووسیە کە (ئاینی باب و باپیران) لە ڕاستیدا واباش بوو بیگۆتبایە ئاینداری باب و باپیران ، بەڵام مەبەستەکەی دیارە لەگەڵ ئاینداریێتی لەگەڵ فقهیەتی ، نەك لەگەڵ خودی ئاینەکە ، لەو ڕووەوە دەبێ خوێنەر ئاگادار بێت لە زۆر شوێن لەو هەڵەدا چووە .

٢) باسی لە بیروبۆچوونی پێشینە کردووەو پیٚ ی وایە بە هەڵە بە پیرۆزی بزانین ئەو پیٚ ی وایە (٥) پیرۆزی ڕێزکراوە پێکەوە (پیرۆزی دەق — پیرۆزی پیاوانی ئایینی پیرۆزی شوێنە ئایینییەکان — پیرۆزی ئەوقاف — پیرۆزی یادە ئایینییەکان) ئەو پیٚ ی وایە هەموویان پیرۆز نین ، کاتی هەموو ئەوانە پیرۆز دەکریٚ زانست و زانیاری دەوەستیٚ و ستەم دیکتاتۆریش دێتە کایەوە ، ئەو پیٚ ی وایە دەقی ئایینیش پیرۆزە بۆ شوێن کەوتوانی ناکریٚ دەقی ئایینی یەهودی بۆ غەیرە یەهودی بە پیرۆز بکەی ، هەروەهاش دەقی ئایینی ئیسلامی بۆ غەیرە ئیسلامیش .. ئەگەر وات کرد مانای لێبوردەیی و ئازادیت نەزانی ، مانای لە ئایینی خۆشت نەگەیشتی .

٣) دێتە سەر بابەتێکی گرنگ بەناوی (ئایین و کوشتنی مرۆڤ) ئەو پێ ی وایە ئایین بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی هاتووە ، ناکرێ مرۆڤ بکوژی لە پێناو ئاییندا ، ئایین پێویستی بە خوێن ڕشتن نیە ، بەو بەلای ئەوەدا نەهاتووە بڵێین لە ئەسڵدا ئایین دژی ستەم و زوڵم هاتووە ، نەك بۆ کوشتن و جینۆسایدی غەیرە دین ، کافر ، مەسیحی ... وەك ئێستا نەك غەیرە دین ، بەڵکو غەیرە مەزهەبیش دەکوژێ .

٤) لە بەشێکی تر باس لەوە دەکات هەموو ئاین و مەزهەبەکان تەنها خۆیان پێ ڕاستە ، خۆشیان پێ بەهەشتی و خواییە ، باقیەکەی تر بە ناڕاست و نەفام و جەهەنەمی هەژمار دەکەن ، ئەوەش نا تەبایی ئایینی دەخولقێنێ ، لەکاتێکدا ڕاستی ئەوەیە مرۆڤەکان هەموو براین.

٥) باسی لە فەرهەنگی ژیان و ژیان و مردن دەکات توندڕەوی ئایینی ئەوەندەی هۆشیاری مردنی هەیە ئەوەندە فەرهەنگ و هۆشیاری ژیانی نیە .

زۆر جار لە گوتاری هەینیش گوێمان لێ دەبێت کەوا کارەساتێك هات هەمووومان دەمرین ، زیاتر باسی مردنە نەك ژیان لەکاتێکدا خودای گەورە ئێمەی بۆ ژیان ناردووە ، ئەو پێ ی وایە فەرهەنگ و هۆشیاری مردن و ناسەرچاوەکەی ئایین نیە ، بەڵکو ئاینپەروەرانن.

٦) باسی لە پیاوانی ئاینی و زانست دەکات ، پێ ی وایە کێشەیان ئەوەیە کەمتر سەرقاڵی توێژینەوەی زانستی و داهێنان و تەکنیکن ، بەڵکو لەناو شارستانییەکن هەمووی لە دروست کراوی غەیرە ئیسلامیە ، کەچی بەدژواریش باسیان دەکەن ، بەو شێوەیە پیاوانی ئایینی لە بێ زانستیا پەنا بۆ دوا ڕۆژو (مهدی) و (عیسا) و ڕزگارکەرێك بۆ مردنیان ببا ، پێشی وایە بەو دۆخە زانستەی پیاوانی ئایینی سەرەنجامێکی لۆژیکیە کە دیکتاتۆرو خۆویست بن ، باوەڕیان بە دیالۆگ و بەڵگەی زانستی نەبێت ، بەهەمان شێوە دەبێتە دیلی مێژوو و ڕابووردوو بێ ئەوەی زانیاری سەردەمی هەبێت ، بۆیەش زۆربەی ناکۆکی و کێشەکانیان مەرجەعیەکەی ڕابووردوە ، وەك کێشەی سوننەو شیعەو مەزهەبەکانی تر .

لەگەڵ زۆر بابەتی تری گرنگی لەو کتێبە باسی کردووەو خوێنەری بن بە ڕێگای تایبەتی خۆت بێ ئەوەی خۆت ڕادەستی تەواوی بۆچوونەکانی بکەی .

<u>هەندێ ڕاست کردنەوەی بۆ ئەو کتێبە :</u>

دوای خوێندنەوەیەکی سەرتاسەری بۆ ئەو کتێبە بە ڕوونی دەردەکەوێ کە نیازەکانی شکاندنی ئەو بەربەستانە لەبەرامبەر عەقڵی موسڵمانان ، دەیەوێ لەو قەیرانە ڕزگاری بکات ، ئەوەش تەقەلایەکی زۆر گەورەیە بێ کەم و کوڕی

نابێت ، پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەكانی و ڕاست كردنەوەی هەندێ زانیاری تر پێویستە بۆ ئەوەی خوێنەر بە سانایی لەو دۆگما فكرییەی دەرچێ كە دووچاری بووە ، وای كردووە كەسێكی دواكەوتوو و دابڕاو بێت لە كۆمەڵگەو لە شارستانی ، تەنانەت دابڕاوە لە ئاینە ئەسڵیەكەی خۆشی بێ ئەوەی هەست بەخۆی بكات ، گرنگترین ئەو خاڵانەش بریتیە لە :

١) ئەسڵی ئایین (هەموو ئایینەكان) بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی هاتوون ، خودی ئایین (پەیام) پێویستی بە خزمەتی مرۆڤ نیە ، خۆی گەورەیە ، تەواوە ، موتلەقە ، لەوەوە بنەمای تۆبزی نیە لە ئایین ئەگەر تۆبزی هەبوو ئەوا ئایین پێویستی بە مرۆڤە ..؟؟؟ بۆیە پێویست ناكات خوێن ڕشتن و ئەزیەت دانی خەڵكی بكەی لەو پێناوە ، بەڵكو ئەو كارە بكە دژی ستەم و زوڵم ، خودی ئایینیش كێشەی لەگەڵ زوڵم و ستەم هەیە نەك لەگەڵ كافرو مولحیدو ... ، كافرێكی باش لە موسڵمانێكی ستەمكار باشترە ، (كافر عادل خير من مسلم الجائر) ئەوە ڕێسای (ابن طاوس)ە ، واتە بە ئاسایی دەردەكەوێ كە ئاین و مەزهەب و تایفەكان دەتوانن بەهۆی فراوانی ئاینەوە پێكەوە بژین ، دان بە بوونی یەكتر بهێنن ، مامی پێغەمبەرو هاوسەری پێغەمبەرێكی ترو باوكی پێغەمبەرێكی تر ... ئاینی تریان هەبوە

كەچی پێكەوەش ژیاون ، یارمەتیدەری یەكتریش بووینە بەرێزەوە ، بۆچی موسڵمانی ئێستا وا تووشی دەمارگیری بووە بەرامبەر ئایین و مەزهەبەكانی تر ، نابی كاردانەوەو كاری خەڵكی تر بكاتە پاساوی ئەو كارەی خۆی ئەگەر تەواو پابەندە بە ئایینەكەی خۆی ، تەنانەت بەرامبەر هەندێ مەزاهیبی ئیسلامیش ، كوا لەناو حزبەكانی شیعە سونەیەكی تێدا بێت ، كوا لەناو حیزبە ئیسلامیە سونیەكان شیعەیەكی تێدا بێت ، كوا جێ ی خەڵكی تری غەیرە دین ، ئەو بۆچوونانە لە مەزهەبیش بچووكترە دێتە خوارەوە بۆ تایفی ، ئینجا دەمارگیری و ئینجا ناكۆكی و خوێن ڕشتن ، لەدوای ئەو هەنگاوە سەقەتانە دێت دروشمی (ئیسلام و چارەیە بۆ هەموو كێشەكانی جیهان) دەدات بەر گوێ ی جیهان ، ئەوانیش بە خێرایی وەڵامیان دەدەنەوەو دەڵێن ئەگەر ڕاستە (ئیسلام چارەیە) با چارەی كێشەكانی ناوەخۆی مەزهەبیەكانی پێ چارەسەر بكرێت ، ئیتر دەم قوت دەوەستێ و ، لەكاتێكا دەبینین دوو ئایینی لێكچیای وەك مەسیحی و یەهودی هەستاو هەردوو كتابی ئینجیل و تەوراتیان لەناو یەك كتێب بەناوی (كتابی پیرۆز) كۆ كردۆتەوە ، یەكەمیان بەناوی (عهد الجدید) و دووەمیان بەناوی (عهد القدیم) ، كەچی لەناو موسڵمانان چەند مەزهەبێكی یەك ئایین ئاوایان پێ ناكرێ .

٢) مەزهەب و تایفەو فقهو عەقیدەو تفسیرو فکری ئیسلامی ... هەمووی تێگەیشتنە لە ئایین نەك خودی ئایین ، دەکرێ ئەو وا لە ئایین گەیشتبێ دەکرێ ئێستا بە جۆرێکی تر ، مادام ئەو تێگەیشتنەش بەشێکە لە علومی بەشەری ئەوا پەیوەندیدار دەبێ بە علومی فیزیاو کیمیاو بیرکاری و فەلسەفەو زانستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری ، ئیتر لەگەڵ گەشەی ئەو زانیاریانە گەشەی (فقهو عقیدەو فکری ئیسلامی) پێویستی بە نوێ بوونەوەو دارشتنەوە دەبێت ، ئەوەی نەگۆڕو سابتە دەقەکانی ئاینە ، چونکە ئەوانە نە کۆن دەبن نە دەمرن نە دەگۆڕێن ... بەڵام فقهو عەقیدەو تەفسیر کۆن دەبن ، بۆیە زۆر ئاساییە ئەو زانایانەی لەو سەردەمە زۆر زیاتر لە ئایین گەیشتبن لە زانایانی کۆن ، ئەوە نوقستانی نیە ئەوە یاسای گەشەکردنی عەقڵی مرۆڤە ، نابێ و ناکرێ زانای دوێنێ لە زانای ئەورۆ پڕ زانیاری تر بێت ، ناکرێ زانایانی سبەینێ لە ئەورۆ زیرەك ترو پڕ زانیاری تر نەبن ، ئەگەر تووشی دۆگما نەبین .

ئاساییە زانایانی ئێستا لە ئیمام و موفەسیرو سەرمەزهەبەکانی کۆن پڕ زانیاری تر بن ، ئەوە مانای ئەوە نیە ئیلغای مەزهەب و مێژوو و فقهو فەرموودە بکەین تەنها بڵێین قورئان ، نەخێر ئەو مەبەستە نیە ، ئەو زاناو ئیمام و سەرمەزهەبانە پێگەی زانستیان بەهێز بووە ،

خزمەتى خۆيان كردووە بۆ سەردەمى خۆيان كردووە ، ڕاو فتواكانيان بەپێ ی بارى كۆمەلأيەتى و سياسى و ئابوورى سەردەمى خۆيان بووە ، ئاساييە پڕ بێت لە هەڵە ، ئەوە ئاساييە بەلأم ئەوەى ئێمە نا ئاساييە كە وا دەزانين هەموو ئەوانە پيرۆزن بوارى دەستكارى و هەموارو پێداچوونەوە نەبێت ، ئەو نائاساييە وا بزانين ئەوە ئاينە ، وابزانين لەوانەمان زيرەكتر پڕ زانيارى تر بێ پەيدا نابێت .

ئەوانە كوشتنى عەقڵەو زيندانى ئايينيشە ، لەوەش سەرەنجامێكى لۆجيكييە كە كۆمەڵگەيەكى دواكەوتووت پێشكەش بكات ، وەك ئەوەى ئێستا هەيە .

٣) هەموو ئەوانەى لە خاڵى دوو باس كرا ، بە هەموو مەزهەب و فكرو تەفسير ناكاتە ٥٪ى ئايين ، ئايين بريتى يە لە هەموو بوونەوەرو گەردوون و سروشت و جهان و كۆمەڵگەو هێشتا زياتر ، كەچى مەزهەب و تەفسيرو فكرو فلسەفەكانمان دلۆپێكە لەدەرياى ئايين ئايين ئەوەيە (لو كان البحر مدادا لكلمات ربى لنفدت البحر يتل ان تنفدوە) كەچى ئێمە هەڵدەستين ئەو دەريايە بەجێ دەهێڵين خۆمان قەتيس دەكەين لەو دلۆپە ، ٩٥٪ بەجێ دەهێڵين خۆمان بچوك دەكەينەوە لەناو ٥٪و دەست دەكەين بە ململانێ ی مەزهەبى و تايفى و خوێنى لە پێناو دەڕێژين ، بەپێ ی ئەو ٥٪ حوكم لەسەر

مەزهەبەكان دەدەین ، سوننە ڕەفزی شیعە دەكا ، شیعەش بەو ٥٪ دەڵێتە سوننە ئیسلامی بەڵام ئیماندار نین . ئەوە چ غەفڵەتێكە ئەگەر شێتایەتیش نەبێت ، ئەریٚ ئێمە لەدواڕۆژ بە شریعەتی مەزهەب دادگای دەكرێین یان بە شریعەتی دین ، سەرمەزهەبەكانیشمان لەڕێزی ئێمە ڕادەوەستن چاوەڕێ ی دادگایی دەبن و وەك ئێمە زەندەقیان چووە ، دەشیٚ ئەتوو بچیە بەهەشت ئەو بۆ دۆزەخ ، دەشیٚ وانەبیٚ .

لەدوای ئەو كورتە ڕوون كردنەوانە ئێستا دەچینە نێوەڕۆكی كتێبەكە لەسەر هەندیٚ لایەنی هەڵوەستە دەكەین ، یان دوور وتر وای ڕاست دەكەینەوە كە خوێنەر بە باشی ئامانجەكانی ئەو كتێبەی (ئایین و قۆرخكاری) پیٚ هەرس بكرێت ، بەكورتی ئەو خالانەیە :

١) عنوانی كتێبەكە بریتی یە لە (ئایین و قۆرخكاری) ئەوە عنوانێكی دروست نییە ، چونكە ئایین قۆرخی ڕاستی ناكات ، بەڵكو خۆی ڕاستییە ، ئەوەی مەبەستیەتی نووسەر وەك لە خوێندنەوەی دوای دەردەكەویٚ ، مەبەستی ئاینپەروەران و فقهو تەفسیرو مەزهەب و پیاوانی ئایینیە ، لەوانەشی بە موتلەقی نیە بەشێك وا دەكەن ، ئایین

دەڵێ من ڕاستم بەلاَم ئەم ڕاستییە بەسەر بەشەریەت ناسەپێنێ بە تۆبزی .

لەوەوە بنەمای ئازادی و ئیختیار دەكەوێتە دەست مرۆڤ خۆی ، پاداشت و سزاو چارەنووسی لەدەستە خۆیتی ، سەبارەت بە (ڕاستی — حقیقە) خۆی لە شوێنی خۆی چ لە بوونەوەرو سروشت چ لە ئایین موتلەق و نەگۆڕە ، كەچی دێتە لای مرۆڤ دەبێتە نسبی و ڕێژەیی .

واتە لە كۆتاییدا هیچ مرۆڤ و لایەن و دام و دەزگایەك بانگێشەی هەڵگرتنی ڕاستی موتلەق بكات ، دەبێ بڵێ بەشێكم لایە ، لێرەوە بناغەی پێویستی بوونی بەشەریەت بەرجەستە دەبێت ، پەیوەندییەكانی بەشەریەت لەسەر ئاستی دەڤەری و دەولی بناغەی دروست دەبێت ، كە پەیوەندییەكی برایەتی و هاریكاری و ئاشتیە نەك توندو تیژی و خوێناوی ، ئیمامی عەلی دەڵێت هەر یەكێكت بینی ئەوا (إما اخ لك في الدين او نظيرا لك في الخلق) .

٢) لە زۆر شوێنی تر باسی لە (اسلام جديد) ، (دين الصحيح) (دين العلمانی) (اصلاح الدينی) ئاوانیەو خۆشی مەبەستەكانی وانیە ، ئیسلامی نوێ و كۆن نیە ، ئاینی عەلمانیش نیە ، ئاینیش چاكساز ناكرێت ، ڕاست كردنەوەكە ئەوەیە (تێگەیشتنی ئیسلامی نوێ) دەبێت ، چاكسازی لە فقهی ئاینی نەك لە خودی ئاینی ، هەرچی

تێکەڵ کردنی هەلمانی و ئانییە ئاوا نابێت ، چونکە سیستەمی عەلمانی حەڕام و حەلاڵ و ڕێگای ژیانی جیایە لەگەڵ ئایین ، ئەوەشی لای ئایین ئاساییە ، بەڵام ئەوەی ئاسایی نیە تێکەڵی بکەی بەناوی (ئاینی عەلمانی) ئەوە نابێت ، هەر چەندە نوسەر مەبەستێکی تری هەیە ئەو عەلمانی بە کۆمەڵگەی مەدەنی و جم و جوڵی دیموکراسی و ئازادی و دادگەری و مافی ئافرەت و مافی مرۆڤ ... ئەوانە کێشەیان نیە لەگەڵ ئایین ، تەنانەت کۆمەڵگەی مەدەنی دەکرێ بڵێین قۆناغێکی نزیك ترە ئایین نەك لە کۆمەڵگەی عەوامی عەشایری نامەدەنی ، ئەو خاڵە بە جوانی لێك نەکراوەتەوە .

٣) وەك پێویست پێناسەو ئەرکی ئایینی باس نەکردووە ، دەڵێت (دین حاجە عقلیە) هەرئەوەندە نیە ، ئەوە پێناسێکی سەرپێی لائیکیە ، ئەوەی یارمەتیدەری ئەو پێناسەشە خودی ئایین پەروەرانن لە جیهان ، بەشی زۆری ئەوەندە دەکەن ، ئەگینا لە بنەچەدا ئایین بۆ ئەوە هاتووە شاریتانی لێ بەرپا بکەی لەو زەمینە ، وەك وەبەرهێنان وایە لەگەڵ خودا بیکەی ، ئەو زەوی و یاساو ئامرازت بۆ تەرخان دەکات تۆش بیناو دەوڵەت و یاساو ژیانت لێ داوا دەکا ، بەڵام بە دادگەری ، ئەوەی ئێستا دەبینین لە زۆربەی زاناو دام و دەزگاکانە کەمتر ڕووی لەجێ بەجێ کردنی ئەو سەودا گەورەیەیە لەگەڵ خودا ، سەودای

بەرپاکردنی شارستانی ، کە پێویستی بەوە دەکا لە فقهو فکرو فلسفەو مەعریفەو زانست دەست پێ بکات ، زانستەکانی فیزیاو کیمیاو فەلەك و ئابووری و سیاسی و یاسایی و ... ئینجا تەکنیك و تەکنەلۆجیا و پیشەسازی و .. تاد .

جاران (دار الصناع و دار السفن و ...) تەکنەلۆجیا لە جیهانی ئیسلامی بوو ئێستا ئەو تەوەجوهە فقهیە کە دەیەوێ عەقل فەرامۆش بکات یان جار وایە تومەت باری بکات بە (عقلانی) و (فوول بوونەوەو) تا بەو ئەنجامەی ئێستا گەیشتن.

٤) باس لە ئایینی باو و باپیران کردووە ، تا ڕادەیەك بە سەلبی هەژمار کردووە ، لە ڕاستیدا ئەوەی باب و باپیرانمان لەسەری بووینە زیاتر فقه بووە ، لێرەوە وەسفەکەی ڕاست دەردەچێ ، ئێمە مەرج نیە لەسەر فقهی باب و باپیران بڕۆین ، بەڵام خراپ نیە لەسەر ئاینی باپ و باپیران بڕۆین ، هەر چەندە خودی ئاینییش میراتی نیە ، ئەویش لە کۆمەڵە فاکتەرەکانی ئاسۆییە نەك ستونی ؟؟؟؟

٥) لە بەشێکی تر ڕەتی دەکاتەوە کە یاسای پیرۆز هەبێت و دەڵێت (لا یوجد قانون مقدس علی الاطلاق —ص٣٨) دیسان ئەوە ڕاست کردنەوەی دەوێ ڕاست دەکا یاسای وەزعی پیرۆز نیە ، بەڵام یاسای ڕاستەقینەی (خوایی) سروشتی و کۆمەڵایەتی و بایۆلۆجی و ... . ئەو

پایەیەی هەیە ، وەسفی (یاسای تەواو) وەك وەسفی ڕاستیە نەگۆڕە ، ڕێژەی نیە ، سەروەری هەیە .... تاد .

٦) بەگرنگیەوە ڕایەکی سەلامە موسای تۆمار کردووە گوایە ئایینی هەردەم نیگەرانی بەردەوامە (قلق دائم ص٤٢) لەکاتێکدا دەقمان هەیە ڕێك پێچەوانە ، (الا بذكر الله تطمئن القلوب) .

٧) لە زۆربەی باسەکانی زۆر بەسەر (فەرهەنگی ژیانی) دا گۆتوە و دژی (فەرهەنگی مردن ثقافة الموت) قسەی کردووە ، زۆریش سەرزەنشتی تیرۆرو توندو تیژی کردووە ، ئەوە ڕاست کردنەوەی دەوێ ، ڕاستە ئاشتی و تەبایی و دیالۆگ بنچینەی پێکەوە ژیانی تێکڕای مرۆڤایەتین و ئەسڵن لە ئایینیشدا ، بەلاّم لە هەموو بارێك و لە هەموو دۆخێك توندو تیژی و ئیرهاب ڕەت ناکرێتەوە ، ئەگەر ولاّتت داگیر کرا ، ئەگەر ستەمێکی زۆرت لێکرا ، ئەگەر بە دیکتاتۆریانە مافت خورا ، ئەگەر جینۆساید کرای ئەوە گوناح نیە ئەتۆش بەرگری لەخۆت بکەی ، کاتێ (جمال پاشا)یان تیرۆر کرد لە ئەلمانیا ، هەموو جیهان دەستخۆشیان لێ کرد ، تیرۆریش بوو .

٨) لە (ل٧٤) دێتە سەر باسی بەکارهێنانی ئایین بۆ هەڵبژاردن و کاری سیاسی و ئیداری حوکمی ، ئەو بە مەترسی هەژمار کردووە ، ئەوە مەترسی نییە ئاساییە حزب پشت بە مەدرەسەیەکی فکری و سیاسی

وەزعى ببەستىٚ ، خەڵكيش پشت بە ئايين ببەستىٚ بۆ هەڵبژاردن و حوكمدارى ... ئەوە بۆ مەترسييە.

٩) لە (ل٨٧) دەگاتە سەرەنجامێك و دەڵێت گەورەترين ديموكراسى خواز لە گەردوون خودايە ... هەرچەندە ويستوويەتى وەسفێكى ترى خودا بكا ، بەلاّم واى بۆ چووە ، ئەوە رِێك رِاى (موفتى كارلۆ) ..؟؟؟ لەبارەى ديموكراسى ئيجابى هەيەو سەلبى كارى خواى سەلبى تێدا نيە ..؟؟؟

١٠) زۆر جاريش نووسەر كەوتۆتە گشتاندنێك بۆ كۆمەڵگەى ئيسلام كەچى زياتر ئەو سيفەتانە هى دنياى عەرەبە ، تايبەتە بە كەلتوورو عەقڵى عربى ، مەرج نيە ووتاربێژو بزوتنەوە ئيسلاميەكانى جيهانى ئيسلامى وەك ئەوەى عالمى عەربى بێت ، واتە گەنجى ئايينى هەمووى مەترسى نين لەسەر نيشتيمان ، تا رِادەيەك رِاستە جۆرێك لە دەمارگيرى ناسيوناليزمى و كەلتوورى بە موسڵمانى عەرەب ديارە (أزمه العقل العربى والمسلم ؟؟؟) .

١١) لەبارەى ئافرەت (ئەوە بخرێتە پێشەوە ...) لە نێوان قورئان و فقهدا ؟؟؟

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی وەرگێڕ

حەقیقەت شتێکە گشت مرۆڤەکان هەوڵ دەدەن پێی بگەن، بەڵام دەستخستنی ئەم حەقیقەت و ڕاستییە ڕێژەییە، لە کەسێکەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی تر، بە ڕێژەی زیاد و کەم، بۆیە مرۆڤ بۆی هەیە بڵێت و بانگەشەی ئەوە بکات حەقیقەتی لایە، بەڵام بۆی نییە بانگەشەی ئەوە بکات حەقیقەتی قۆرخ کردووە، بەو مانایەی تەنها ئەو لەسەر حەقە و ئەوانی تر هیچ تاڵەمویێکیان لە حەق و ڕاستی لەلا نییە.

ئەم کتێبەی بەردەستمان کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرمگێڕاوە بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، پێم وایە سوود و کەڵێکی دەبێت بۆ زیاتر کرانەوە و عەقڵ فراوان بوون. لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە بەندە لەگەڵ گشت ڕا و بۆچوونەکانی نووسەردا بێ.

هیوای تەمەن درێژی و سەرکەوتن بۆ نووسەری بەڕێز دەخوازم، هیوادارم بەندە لەم کارەیدا توانیبێتی ڕەزامەندی خوا دەستبخات.

لـە کۆتاییـدا دەمـەوێ سوپاسـی ڕێـزدار: "سـەرهەنگ عبدالواحید" بکەم، کە ئەرکی پێداچوونەوە و هەڵەچنینی ئەم بەرهەمەی گرتەئەستۆ[1].

سەرکەوتن تەنها لە خواوەیە، هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو لایەك.

زرێبار عەزیزخان

مها جبر

(١) بۆ ڕاڤەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز سوودم بینیوە لە: تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، نووسینی بورهان محمد أمین. (وەرگێڕ).

# پێشەکی نووسەر

## قۆرخکردنی حەقیقەت :

لەوانەیە بارودۆخە تاڵەکان، کە قورسایی خۆیان دەخەنە سەر تێکڕای گەلانی جیهان، ئەوەش کە لە نێوان هەر دوو جیهانی خۆرهەڵات و خۆرئاوادا ڕوودەدات، لە کێشمەکێش و ڕاکێشان، لەلای هەندێك کەسەوە بە ململانێ، لەلای هەندێکی ترەوە بە گفتوگۆ وەسف بکرێ، ئەمەش ئێمەی هانداوە بۆ نووسین سەبارەت بەم بابەتە، ئاسان نییە لە جیهانێکدا بژین، لەکاتێکدا هەر یەکە بانگەشەی ئەوە بکات، ئەو حەقیقەتی قۆرخ کردووە، ئەوانی تریش تەنها گومڕاییان هەیە، بەهەشت موڵکی ئەوان و دۆزەخەیش موڵکی ئەوانی ترە.

بە کورتی بابەتی ئەم کتێبە، بریتییە لە ڕەخنەگرتن لە بیرۆکەی قۆرخکرانی حەقیقەت لەلایەن ئاینەوە، ئەمەش ئەو بیرۆکەیەیە ژمارەیەك لە پیاوانی ئاینی و پۆلێك لەو دیندرانەی شوێنیان کەوتوون ڕەواجی پێدەدەن، سەرباری ژمارەیەك لە پیاوانی ئاینی سیاسی، چ جولەکە یان مەسیحی یاخود موسڵمان یان جگە لەوانە بن. لەوانەیە تاوتوێ کردنی ئەم بابەتە کارێکی مەترسیدار و سەخت بێ لە هەمان کاتدا، چونکە پەیوەندی هەیە بە تێڕوانینە جێماوەکان لەبارەی ئایین، کە گۆڕین و دەستکاری کردنیان سەختە، چونکە ڕەگیان داکوتاوە لە ناخ و دەروونەکان و گەلان لەسەری ڕاهاتوون. ئایین لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا، هەردەم گوزارشت ناکەن لە هزر و بیروباوەڕ، بەڵکو زۆربەی جاران گوزارشت لە داب و نەریت و دروشم دەکەن، بەو مانایەی هەردەم بەستراوە نییە بە عەقڵ و لۆژیکەوە، بەڵکو بە هەست و سۆزەوە وابەستەیە، ئەمەش خەڵك پاڵ

دەنێ بۆ ئەوەی گشت ئەو شتانە ڕەت بکەنەوە، کە دەگرێ متمانە لەق بکەن بەم داب و نەریت و دروشمانە.

کێشەی مەزن لە بیرۆکەی قۆرخکردنی حەقیقەت لەلایەن ئاینەوە، ئەوەیە سەردەکێشێ بۆ چەند قۆرخکاریەکی تر، لەوانە: قۆرخکردنی ڕەوشت و چاکە و دانایی، هەندێك لە پیاوانی ئاینی بانگەشەی ئەوە دەکەن تەنها سەرچاوەکەی ئاینیە، لە کاتێکدا دژەڕاکانی ئەوان بۆچوونیان وایە، بەرهەمی کۆششی دوور و درێژی مرۆڤە، ڕەگەزی مرۆڤ هەولی بەدەستهێنان و بەرجەستەکردنی داوە، لەوەتەی هاتۆتە سەر زەوی، بەو مانایەی تەنها بەرهەمی ئایین یان هزری ئاینی نییە، بەڵکو بەرهەمی فەلسەفە و داب و نەریت و هونەر و زانستەکانیشە بەهەمان شێوە. پێمان وایە ئەم قۆرخکردنەی ڕەوشت و چاکە و داناییە، زۆر کێشەی دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری لەسەر کەڵەکە دەبن، ئەمەش گەشەی سەلامەتی مرۆڤ و کۆمەلگە پەکدەخات.

## ئەم کتێبە :

زۆر کتێب دەرکەوتن، ئاماژەیان بە قۆرخکردنی حەقیقەتدا، لەلایەن ئاینەوە یان لەمە نزیك ببوونەوە، بەڵام هەردەم خاسیەتێکیان تێدابوو، هەندێك کەس و بەتایبەت گەنجان پێیان وابوو شێوە دەربڕینێکی سەخت و ئاڵۆزیان هەیە، بەتایبەت کە هاودەم بوو لەگەڵ زاراوە و چەمکی پسپۆری ورد، ئەمە سکاڵایەکە دەیبیستم لە لاوی زانکۆوە، هەر کاتێك قسە دەکرێ لەبارەی ئەم جۆرە کتێبانە. ئەمەش منی هاندا بۆ نووسین سەبارەت بەم بابەتە گرنگە، بەشێوازێك کە ئاسانکاری و سادەیی و پوختیم تێدا پەیرەو کرد، بێ فەرامۆش کردنی لایەنی

ئـەكاديمى پێويست، كـه دەبـێ لـه نموونـەى ئـەم بابەتـەدا پـەيرەو بكـرێ. ئـەو سادەكاريەى كە لەم كتێبەدا بانگەشەى دەكەم، له چوار خاڵدا دەدرەوشێتەوە:

١- نووسينى بابەتەكان بەشێوەى وتارى كورت و چڕ و پڕ، هەر وتارێك بۆ چەند ناونيشـانێكى لاوەكـى دابەشـكراوە، يارمـەتى خوێنـەر دەدات بـۆ وەرگرتنـى بيرۆكە و كۆكردنەوەى ماناكە. پێم وابوو ئەم وتارانـه لـه پێـنج بەشـدا ڕێـك بخـەم، بـۆ دەسـتەبەركردنى يـەكێتى بابەتەكـە، ئـەم بەشانه بايـەخيان بـەم بابەتانـەى خـوارەوە داوە: يەكـەم، ڕوونكردنـەوەى مانـاى ئـايين و دينـدارى و پەيوەنـديان بـه هـزرى پـيرۆزەوە. دووەم، ئـايين و توونـدوتيـژى و چـۆنيەتى قۆستنەوەى ناوى خوا له حەڵاڵ كردنى كوشتنى مـرۆڤ بـه بەڵگەى جەنگە پيرۆزەكانەوە. سێيەم، پياوانى ئاينى و دينـداران و ڕەخنـەگرتن لـه هەنـدێك ڕەفتـار و ڕيوشـوێن و ڕێگـەى بيركردنـەوەيان، كـه پشـتى بەسـتووە بـه قۆرخكردنى ئاينەوە. چوارەم، پياوانى ئاينى و ئافرەت، كه ماف و حورمەت و ڕێزى پێشێل دەكرێ، بەناوى ئەوەى ئـايين ڕەوشت و چاكەى قـۆرخكردووە. پێنجەم، نوێسازى ئاينى و بيرمەندە هاوچەرخەكان لـه دەرەوەى دامـەزراوەى ئاينى و كاره بەردەوامەكەيان له دامەزراندنى چەمك و بنـەماكانى ئيسلامى تازە و ئەو كۆسپانەى دەكەونە سەر ڕێگەيان.

٢- بەكارهێنانى زمـانێكى سـادە، بـۆ تێگەيشـتن ئاسـان بـێ، لەگـەڵ هەوڵـدان بـۆ ڕوونكردنەوەى مانـاى وشـه پسـپۆڕيەكان، كـه پێمـان وايـه پێويسـتە ڕەواجى پێبـدرێ، بـۆ ئـەوەى ببێتـه بەشـێك لـه ڕۆشـنبيرى گـەنج و لاو، واتـه ئـەو ئاسانكاريەى هەوڵمانداوە پێى هەڵبستين، لايەنە مەزنەكەى خۆى دەبينێتەوە

لە هەوڵدان بۆ هاندانی گەنجان بۆ قوڵبوونەوە لە قوڵایی بابەتە پسپۆڕیەكان، نەوەك بێز لێبوونەوە و هەڵاتن لەبەریان.

٣- پشت بەستن بە هەر شتێك، كە دەكرێ بەهۆیەوە بیرۆكەكە بگوازرێتەوە بۆ خوێنەری گەنج، تەنانەت ئەگەر چامە یان فیلمێكی سینەمایی یاخود ڕۆمانیش بێ، واتە ئێمە تەنها پشتمان بە سەرچاوە پسپۆڕیەكان. سەربارى هەوڵدان بۆ پەیی بردن بە ویژدانی مرۆیی، كە پێمان وایە گرنگترین شتە بۆ قبولكردنی بەرامبەر، ئەمەش ئێمەی هاندا بۆ قسەكردن لەبارەی تۆڵستۆی و غاندنی و سەلامەتی موسا.

٤- خستنەڕوویێكی سادەی چەمك و زاراوەكانی ژمارەیەك لە نووسەرە دیارەكان، ئەوانەی پێمان وایە پێویستە گەنج و لاوەكان بیرۆكە و ڕا و بۆچوونیان بزانن، بۆ ئەوەی ئەم خستنەڕووە ببێتە ئەو دەرگایەی لە میانەیدا گەنجان بگەن بە جیهانی تێگەیشتنی كەسانی تر و قبولكردنی، ئەگەر جیاوازیش بێ لە هی ئێمە، دواتر بناغە دانان بۆ بیرۆكەی نا دروستی قۆرخكردنی حەقیقەت. هەوڵمانداوە ئەمە بكەین لە بەشی پێنجەم و كۆتایی ئەم كتێبە، بەهەمان شێوە تیایدا بیرۆكە و بۆچوونەكانی نەسر حامدی باوی زەید و عەبدولكەریم سروش و محەمەد سەعید عەشماوی، عەلی وەردی و سەید مەحمود قمنی خراوەتەڕوو، وەك چەند نموونەیەكی هزری، كە هەوڵیانداوە بیرۆكەی قۆرخكرانی حەقیقەت لەلایەن ئاینەوە فڕێ بدەن.

بە كورتی، دەكرێ بوترێ ئەم كتێبە زیاتر بایەخی بە خوێنەری گەنج داوە زیاتر لەوانی تر، بە گوێرەی توانا و بێ فەرامۆشكردنی خوێنەرانی تر، بە ئاستە جیاوازە ڕۆشنبیری و زانستیەكانیانەوە، هەروەك تەنها قسەی نەكردووە لەسەر

بيرۆكەى قۆرخكرانى حەقيقەت لەلايەن ئاينەوە، بەلكو تاوتوێى ژمارەيەك بابەتى ترى كردووە، كە پەيوەستن پێيـەوە، هـەر بۆيـە ناونيشانى لاوەكى كتێبەكە بـەم گوزارشتە هاتووە (چەند ڕا و بۆچوونێك لە بارەى ڕەخنـەگرتن لـە بيركردنـەوە و ڕەفتارى ئاينى).

## تێبينى و ئاگاداريەك :

لەوانەيە خوێنـەر تێبينـى ئـەوەى لەسـەر ئـەم كتێبـە هـەبێ، كـە سـەربارى ئـەوەى كتێبێكـە لـەبارەى ئـايين و دينداريـەوە، ئـەوا لەگـەڵ ئەوەشدا باسى هـيچ دەقێكى ئاينى نـەكردووە، جا چ دەقێـك بـێ لـە كتێبێكى ئاسمانى (تـەوڕات يـان ئينجيل ياخود قورئان) يان دەقێكى فەرمووده ياخود كەلەپور بێ. ئەمەش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە: يەكەميان، بڕواى ڕەهامان بەوەيە ناكرێ كە دەقـەكان پشتى ڕا و بۆچـوونێك بگـرن يـان ڕەتـى بكەنـەوە، هـەر يـەكێكمان لـە دەق تێـدەگات و بەكاردەهێنێ بەشێوازێكى جياواز لەوەى تر. دووەم، ويستمان ئەركى بەراوردكردنى ئەو بيرۆكانـەى لـە دەقەكانـدا هـاتوون و لەبـەرى كـردوون بـۆ خوێنـەر جێبهـێڵين ئەگەر بيەوێ، تا لەگەڵماندا بەشدار بێ لە دانانى كتێبكەدا، لە جياتى ئەوەى تەنها خوێنەر بێ، ئەمەش يارمەتى دەدات لەسەر وەرگرتنـى بيرۆكە پێشنياركراوەكە و فراوانكردن و لێڕامانى، دواتـر بڕيـار لەسەردانى بـە قبـوڵكردن يـان ڕەتكردنـەوە ياخود بێ لايەنى هەڵبژاردن.

لەوانەيە پێويست بێ لە كۆتايى ئەم پێشەكيەدا ئاماژە بە دوو بابەتى گرنگ بدرێ، ئەويش ئەمانەن: يەكەم، ئاينێك نييە حەقيقەت قۆرخ بكات، هـيچ ئاينێـك نييە بانگەشەى كردبێ يان بانگەشە بكات ئەو حەقيقەتى قۆرخ كردووە، بەڵام بە

دنیایەوە پیاوانی ئاینی هەن ئەم بانگەشەیە بکەن، هەر لەبەر ئەمەیە هەندێك کەس پێی وابوو، وا گونجاو بوو ناونیشانی ئەم کتێبە بەم شێوەیە بێ (پیاوانی ئاینی و قۆرخکردنی حەقیقەت) لە جیاتی (ئایین و قۆرخکردنی حەقیقەت)، ئەمە ڕا و بۆچوونێکی دروستە، بەڵام ئێمە ویستمان ناونیشانێك دابنێین لەگەڵ دیدی پیاوانی بۆ حەقیقەت بگونجێ، پیاوی ئاینی خۆی بە قۆرخکەری حەقیقەت نابینێ، بەڵکو خۆی بە خزمەتکار و پارێزەری حەقیقەت دەبینێ و پێی وایە حەقیقەت خودی ئاینە. شایەنی باسە هەر ڕەخنەیەك ئاڕاستەی پیاوانی ئاینی کراوە، لەم کتێبەدا کە خوێنەر دەیبینێ، ئەوا ڕەخنەگرتنە بە تەنها لەو پیاوە ئاینیانەی حەقیقەتیان قۆرخکردووە، بەڵام ئەوانەی باوەڕیان وایە دەکرێ حەقیقەت لەلای دژەڕای خۆشیان هەبێ، ئەوا ئێمە ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتمان بۆ هەیە. دووەم، هەموو ئەوەی لەم کتێبەدا هاتووە تەنها چەند بیرۆکە و بۆچوونێکە پێمان وایە ڕاستن، دەکرێ کەسانی تر پێیان وابێ هەڵەن، تەنانەت وشك و نا حەق یان نا دادپەروەرانەن، لەوانەیە هەندێکی تر بۆ دوورتر لەمەش بڕۆن و وەسفی بکەن بەوەی بێ باوەڕ یان ئیلحادن، پەنا بەخوا. هەر بۆیە بە پێویستی دەزانم بڵێم ئەمانە تەنها چەند بیرۆکە و بۆچوونێکن، پێم وایە ڕاستن و بەشدارن لە چاك کردنی بارودۆخی مرۆڤ و بەرزکردنەوەی ژیان و گوزەرانی، هەر یەکێکی تر مافی ئەوەی هەیە بۆچوونی پێچەوانەی هەبێ.

# سەبارەت بە مانای ئایین و دینداری

## جیاوازی نێوان ئایین و دینداری :

له زۆرێك لەو لێكۆڵینەوانەی لەبەرەستدان سەبارەت بە بابەتی ئایین و دینداری، تێكەڵاوی جیانەكردنەوە هەیە لە نێوان ئەم دوو وشەیە، هەر بۆیە شتێكی گونجاوە ئاماژە بكرێ بە جیاوازی نێوانیان، چونكە دیاریكردنی مانای وشەكان، یەكەم هەنگاوە لە هەنگاوەكانی ڕێڕەوی لێكتێگەیشتنی مرۆڤایەتی. گرنگترین جیاوازی له نێوان ئایین و دینداری، بریتییە لەوەی ئایین پێویستیەكی عەقڵی هزری فەلسەفییە، بەڵام دینداری پێویستیەكی دەروونی كۆمەڵایەتییە.

ئایین (دین) كۆمەڵێك هزر و بەها و بیروباوەڕە، ئینگەراكان باوەڕیان پێ هەیە، بەڵام دینداری كۆمەڵێك دروشم و پیادەكردن و پەرستش و سیمای پەیوەستە بە ئاینەوە، دیندارەكان پەیوەستن پێیەوە. ئاینەكان هەر چەندە فرە جۆر بن، ئەوا ناوەڕۆكەكەیان یەكە، هەر بۆیە ئاینگەراكان هاوشێوەن، دیندارەكانیش جیاوازن، چونكە پیادەكراوە ئاینەكان له ئاینێكەوە بۆ یەكێكی تر جیاوازن.

بەمەش ڕوون دەبێتەوە ئاین و دیندار لێرەدا هەن، ئاینگەرا و دیندارەكانیش هەن. ئاینگەراكان باوەڕیان بە بیروباوەڕێكە، ناوەڕۆكی ڕێنماییەكانی ئاینە، كە دەدرێنە پاڵ. بەڵام دیندارەكان دروشمەكانی ئایین جێبەجێ دەكەن و پەیوەستن بە شتە ڕووكەشییەكانیەوە. پێویستە دان بنێن بەوەی دیندارەكان لە گشت سەردەمێكدا زیاترن لە ئاینگەراكان، چونكە

پیادەکردنی دروشم و پەرستشەکانی هەر ئاینێك، زۆر ئاسانترە لە باوەڕبوون بە هزر و بیروباوەڕەکانی ئەم ئاینە.

لەوانەیە گونجاو بێ بوترێ: ئەرکی ئێمەیە دیندار بین، لە هەمان کاتدا ئاینگەراش بین، بەو مانایەی بگەڕێین بە دوای پیادەکردن و لێکۆڵینەوەش لەبارەی بیروباوەڕ و هزرەوە، کارکردن بەبێ بوونی بیروباوەڕێکی ڕوون و ڕەوان تیاچوون و گەوزینە. لەوانەیە لە یەك ئایندا چەندین ئاڕاستەی هزری بەدی بکەین، ئایا کامەیان هەڵبژێرین؟ پێم وایە پێویستە ئەوە هەڵبژێرین، کە هەردەم عەقڵ و ڕۆحمان بەرز بکاتەوە و ئاڕاستەمان بکات بۆ خۆشەویستی و ئاشتی و خێر و فڕێدانی توندوتیژی و دەمارگیری و پەڕگیری.

## ئاین و چەند پرسیارێکی سەرەکی :

توێژینەوەی هەر ئاینێك، ئیسلامی یان مەسیحی یاخود جولەکەیی یان بوزی یاخود زەردەشتی یان هیندۆسی... تاد، یەکێکە لە ڕێگەکانی وەڵامدانەوەی پرسیارە سەرەکییەکان، کە هەر مرۆڤێك دەیانکات و پەیوەستە بە بنچینەی بوون و هۆ و ئامانجەکەی، ئەویش ئەمانەن: کێ منی بەدیهێناوە؟ ئایا بۆچی من هەم؟ لە دوای مردنی من چی هەیە و چی دەبێ؟ ئەم پرسیارانە گشت تاکێك لە خۆی دەیکات، لەوانەیە بەشێکی زۆر لە ژیانی خۆی یان هەموو تەمەنی بەڕێ بکات بە دەم کردنی ئەم پرسیارانە و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی وەڵامەکەیان.

زۆرێك لە ڕێچبازە فەلسەفی و هزریەکان بایەخیان داوە بە دۆزینەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە، بوونگەرایی و مارکسییەت لەم بابەتانەی کۆڵیوەتەوە، چەند

وەڵامێکیـان لـەبارەوە خستۆتەڕوو، ئەوانـەی ئـەم وەڵامانـەیان لـەباوەش گرتـووە باوەڕیان پێهێناوە و کردوویانەتە ئەو ئاینەی کە باوەڕیـان پـێ هەیـە، چونکە بـۆ هیچ مرۆڤێك نییە بەبێ ئایین بژیـەت، ناشتوانێ بـە بەختـەوەری بژیـەت بـەبێ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە بوونیانـە، ئەگـەر وەڵامی ئـەم پرسـیارانە لـە ئاینیـە نەریتیەکانـدا نەبینێتـەوە، ئـەوا لـە نێـو ڕێبـازە فەلسـەفی و هزریەکانـدا بەدوایـدا دەگەڕێن. هەر بۆیە وتراوە مرۆڤێك بەبێ ئایین بریتییـە لـە مرۆڤێـك کـە ڕێـز و شەڕەفی نییە، مانای ڕێز و شەڕەف لێرەدا، بریتییە لە ڕێـز و شـەڕەفی بیروبـاوەڕ و هزر و ئامانج لەم ژیانەدا. ئایین بریتییە لە کۆمەڵێك وەڵام، کە هەڵمانگرتووە لـە گوێچـکەکانماندا لـەبارەی پرسـە بوونیــەکان و هــۆ و ئامانجەکـەی، مــەرج نییــە سەرچـاوەی وەڵـامی ئـەم پرسـیارانە ئـاینی بـاوان بـێ. ئەگـەر ئـەو وەڵامـەی لـە گوێچکەکانماندا هەڵمانگرتووە لەبارەی ئەم پرسیارانە پاڵمان بنێن بـەرەو بـەرزی، ئەوا ئەم وەڵامانە پایەدار و بەرزن، بەڵام ئەگەر پاڵی پێمانەوەنا بەرەو دواکەوتن، ئەوا وەڵامی نزم و پەستن. لەوانەیە من زیادەڕەوی نەکەم ئەگەر بڵێم: بـەرزی و نزمی مرۆڤ بەستراوەتەوە بە بەرزی و نزمی بیروباوەڕەکەیەوە.

## ئایین پێویستیەکی دەروونیە :

ئایین لە پێویسـتییە سـەرەکییەکانە بـۆ مـرۆڤ، هیـچ کۆمەڵگەیـەکی کـۆن و تـازە، بـەتاڵ نییـە لـە ئاینێـك کـە بـاوەڕی پـێ هەیـە، تەنانـەت مولحیـدەکانیش ئیلحادیان وەك ئایینێك بۆ خۆیان دانـاوە، هـەر بۆیـە زانایـانی دەروونزانـی پێیـان وایە ئایین و دیندار لـە پێویسـتییە سـەرەکییەکانی مـرۆڤن. ئـایین لـە تێڕوانینـی ئەوان پێویسـتییەکی غـەریزی (سروشـتی)یە، نـاوی دەنـێن غـەریزەی ئـاینی، وەك گشت غەریزەکانی تر، وەك: غەریزەی حەز کردن لە مانەوە، غەریزەی بەدیهێنانی

خود و غەریزەی خۆسەپاندن و جگە لەمانەش. وتراوە غـەریزەی ئـاینی بـریتییـە لە سنووری جیاکەرەوە لە نێوان ئاستی بوونی مرۆیی و ئاستی بوونی ئاژەڵی، واتە غەریزەی ئاینی جیاکەرەوەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵە. زانایانی دەروونزانی پێیان وایە ئەم غەریزەیە شیاوی گەشە و نەشونما پێدانە، هەر کاتێ بەهێزتر بێ، ئەوا مرۆڤ زۆرتر بەرەو بەرزی و بڵندی دەبات. ئەم غەریزەی ئاینیە یان ئەوەتا گوزارشت لە خۆی دەکات بـە گوزارشـتێکی ئـاینی ڕاشـکاو، لـە میانـەی پیـادەکردنی دروشـم و پەرستشـەکانی پەیوەسـت بـە هـەر ئاینێکـەوە، یـان گوزارشـت لـە خـۆی بکـات بـە شێوازێکی فەلسەفی، لە میانەی بایەخدان بە پرسەکانی بوون و مرۆڤ.

ئێمە پێویستمان بە ئـایین و دینـداری هەیـە بەیەکـەوە، بـە مانـای فراوانـی ئایین، ئایین عەقڵەکانمان بەرز دەکاتـەوە، دینـداریش ڕەفتارەکانمـان بڵنـد دەکـات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ پێویستە لەسەر ئایین جیا نەبێتەوە لە دینداری، چونکە ڕەفتـار بەرهـەمی بیرکردنەوەیـە. ئـەم وتەیـە لەلایـەنی تیۆریـەوە ڕاسـتە، بـەڵام لەلایەنی کرداریەوە جیاوازە، بۆ نموونە، زۆرێك بەناوی ئاینەوە قسەمان بۆ دەکەن لەبارەی ڕەوشت و بەها و خۆشەویستی و ئاشتی، بەڵام دەیانبینین ئاشوب و جەنگ هەڵدەگیرسێنن. ئەمەش پرسە ترسناکەکەیە، کـە تکـام وایـە هـەمووان، بەتایبـەت گەنجان و لاوان، ئاگاداری ئەمە بن و بیکەنە پێوەری هەرە گـرنگ لـە دیـاریکردنی ئایین و دینداریەکەیان، ئەگەر لێرەدا کۆمەڵێك یان بۆلێك یاخود دەستەیەك هەبێ بە ناوی ئاینەوە بدوێ، هـانی شـوێنکەوتووانی بـدات بـۆ بوغزانـدنی خـەڵك، ئـەوا لەسـەر هـەمووومان پێویسـتە نیشـانەی پرسـیاری لەسـەر دابنـێین. ئـەو پێـوەرەی سیفەت و خاسیەتەکانی هەر ئاینێك لە جیهاندا پێـی دەپێـوین، پێویسـتە هـەنگاو بهاوێژێ لە ئەنـدازەی ئـەوەی ئـەم ئاینـە دەسـتەبەری دەکـات لـە سـوود بـۆ تـاك و

کۆمـەڵ. ئـەو پرسـیارەی پێویسـتە هـەردەم بیپرسـین ئەوەیـە: ئایـا ئـەم ئاینـە کۆمەڵگەیەکی سەرکەوتوو بنیـات دەنـێ، کـە تاکـەکانی ڕووبکەنـە چاکە و خێـر و خۆشەویستی یـان کۆمەڵگەیـەکی داڕوخـاو دروسـت دەکـات، تاکـەکانی ڕوو دەکەنـە خۆویستی و خراپە و یەکتر بوغزاندن؟

## گومان هەنگاوی یەکەمە :

خستنەڕووی چەند پرسیارێك، گەڕان بە دوای وەڵامەکان، ئەمە ئەو شـتەیە مرۆڤ جیـا دەکاتـەوە لـە بـەدیهێنراوەکانی تـر. گـرنگترین پرسـیار مـرۆڤ دەیکـات، بریتییـە لـە سـەختترین پرسـیار: ئایـا کـێ دروسـتی کـردووم؟ بۆچـی مـن هـەم؟ پێویستە چۆن بژیم؟ ئەمە پرسیارە بوونییە سەختەکانن، ئەگەر وەڵامەکانیان لـە کۆمەڵەیەکی زانیاری و مەعریفیدا کۆ بکەینەوە، ئەوا ئاینێکمان لـەلا بـۆ دروسـت دەبێ، هەروەك باسمان کرد. ئایین ئەوە نییە باوەڕ بە ئاینی باوانت بکـەی، بـەڵکو ئەوەیە گومان لە گشت پرسێك بکەی، تا ڕاست یان چەوتیەکەی دەسەلمێنی. ئـایین بریتییـە لـە ئیمـان و بـاوەڕ، ئەمـەش بـۆ تـاك دەسـتەبەر نـابن، تـەنها لـە دوای گەشتێکی دوور و درێژ نەبێ، تیایدا لە پرسیار و گومان و لێکۆڵینـەوە و پەسـەند کردن بگاتە ئیمان و باوەڕ، لەوانەیە هەرگیز پێی نەگات، بەڵام ئەگـەر پێـی بگـات ئەوا ئیمانەکەی قوڵ و جێگیر و ڕەگ داکوتاو دەبێ.

بە کورتی، ئەوەی گومان نـەکات بـاوەڕ نـاهێنێ، ئـەوەش کـە گومـان دەکـات، لەوانەیە بە ئیمان بگات. بەڵام چی لەبارەی ئەوانەوە بڵێین کە بـۆ یـەك ڕۆژیـش گومانیان نەناسیوە، ئەگەر لە یەك ساتیشدا گومانێکیان بە خەیاڵدا هات، ئەوا تۆبە دەکەن و داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەن؟ ئایا ئەوان باوەڕدار نـین؟ بەبۆچـوونی من ئەوان دینداری دڵسۆز، باوەڕدار نین.

ئەگەر یەكەم هەنگاو لە ناسینی ئایندا، بریتی بێ لە گومان، كە چەندین هەنگاوی زۆری تری بەدوادا دێ، ئایا دەبێ باوەڕمان وابێ گەیشتنەكە بە هەمان دەرەنجامی نەگۆڕ دەبێ؟ بە دڵنیایەوە نەخێر... ئەمەش وامان لێدەكات بڵێین دەكرێ زیاد لە ئاینێك هەبێ حەقیقەتی تێدا هەبێ و قۆرخی نەكات، یان بە دەربڕینێكی وردتر لە حەقیقەت نزیك دەبێتەوە و دەست لە هەندێكی دەدات و بەڵام بە تەواوی نیەتی. بە دڵنیایەوە ئەمە ڕێگری ناكات لەوەی مرۆڤ بانگەشەی ئەوە بكات حەقیقەتی لایە، هەستكردن بەمە هۆكاری ئاسوودەیی دەروونە، كە دیندارەكان هەستی پێدەكەن.

ئایین بریتییە لە گشت هەوڵێك، كە تاك خەرجی دەكات بۆ زانینی ئامانجی ژیان و چۆنیەتی ژیان. ئەوانەی تەنها پشت نابەستن بەو وەڵامانەی، كە باو و باپیرانیان یاخود پیاوانی ئاینی پێشكەشی دەكەن لە سەردەمی ئەواندا، سەبارەت بە پرسیارە هەربوو (ئەزەلی)یەكان، تەنها ئەوانە بە ڕێگەی ئایندا دەڕۆن، بەڵام ئەوانەی بەم پرسیارانە ڕازی دەبن، ئەوا دیندارەكانن. ڕاستی وامان لێدەخوازێ بڵێین: دیندارەكان حەساوەترن لەوانەی لێكۆڵینەوە لەبارەی ئایین و ئیمان دەكەن، بەڵام لایەنی مرۆڤایەتیان كەمترە، مرۆڤ مرۆڤێكی بایلۆژی بەرهەم دێنێت، بەڵام نابێتە مرۆڤێكی ڕاستەقینە، تەنها دوای ئەوەی هەست بە ئامانجی ژیان دەكات، بەخۆی فێری چۆنیەتی ژیان دەبێت.

## ئاینێك ناسنامەی كەسێتییە :

من و تۆ ئاینەكەمان هەڵنەبژاردووە، بەڵكو ئێمە باو و باپیرانمان لەسەر ئەم ئاینە بینیوە، هیچ یەكێكمان نییە شارەزایی هەبێ لەسەر گشت ئاینەكان لەم

جیهانەدا، بە وردی لێی کۆڵیبێتەوە، دواتر ئەو ئاینەی لێ هەڵبژێرێ کە ویستی لەسەرە. کەواتە بۆچی بانگەشەی ئەوە دەکەم حەقیقەتم قۆرخ کردووە؟ ئەی بۆچی تۆ بانگەشەی ئەوە دەکەیت کە حەقیقەتت قۆرخکردووە؟ نە من و نە تۆ حەقیقەتمان قۆرخ نەکردووە. هیچ کەسێك حەقیقەتی قۆرخ نەکردووە، بەڵام دەکرێ ئەو کەسە بانگەشەی ئەوە بکات حەقیقەتی لایە، کە لێی بکۆڵێتەوە.

خوای گەورە ئێمەی لە زگی دایکانماوە هێناوەتە بوون، ئێمە هیچمان نەزانیوە، بەڵام باوانی ئێمە ئاینی ئێمەیان هەڵبژاردووە، یان چاکترە بڵێین ئەوان ئاینی خۆیان بۆ ئێمەیان هەڵبژاردووە، زارۆك هیچ شتێك نازانێ. ئەگەر باوانی موسڵمان بن، ئەوا لە ناسنامەی کەسێتیەکەیدا دەنووسرێ (موسڵمان)، بەڵام ئەگەر باوانی مەسیحی بن، ئەوا لەسەر ناسنامەی منداڵەکە دەنووسرێ (مەسیحی)، بەهەمان شێوە سەبارەت بە گشت ئاینەکان. لەوانەیە زێدەڕەوی نەکەم، ئەگەر بڵێم شتێکی ڕاست نییە ئاینی هیچ تاکێك لە ناسنامەکەیدا بنووسرێ، چونکە ئایین لە تێڕوانینی ئێمەدا بریتییە لە هەڵبژاردنێکی کەسی، کە بەهۆی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و ڕامان و دوای کۆششێکی زۆر یان کەم بەدەستی دەخەین، ئەمە ئاینی ئیمان و باوەڕە، ئاینی کەمینەیە، سەبارەت بە ئاینی ناسنامەی کەسێتی، ئەوا ئاینی داب و نەریت و شوێن پێ هەڵگرتنە، ئەمەش ئاینی زۆرینەیە.

ئەگەر ئاینی من ئاینی ناسنامەی کەسی بێ، ئایا مافی ئەوەم هەیە بانگەشەی ئەوە بکەم ئەوە ئاینی ڕاستە، لە کاتێکدا من توێژینەوەم لەسەر نەکردووە و لێی ورد نەبوومەتەوە و لە بنەڕەتدا هەر هەڵم نەبژاردووە؟ ئەو کاتە ئایا بۆ جگە لەخۆشم دروستە ئەمە بکات؟ هەر بۆیە ئەرکی گشت گەنجێکە کتێبە ئاینیەکان بخوێنێتەوە، بەتایبەت تەورات و ئینجیل و قورئان، چونکە ئەم سێ کتێبە

بەشداربوونە لە پێکهێنانی بیروباوەڕی زۆرێك لە خەڵك، بناغەی داناوە بۆ زۆرێك لە بیرۆکە و داب و نەریتەکان، واتە بەشداربووە لە پێکهێنانی ویژدانی مرۆڤایەتی. لەسەر موسڵمان پێویستە لێکۆڵینەوە لە تەورات و ئینجیل بکات، لەسەر کەسی مەسیحی یان جولەکە پێویستە لە قورئان بکۆڵێتەوە، کەسی وا هەیە ترسی هەیە لە لێکۆڵینەوە لە حەقیقەت، چونکە لەوانەیە ببێتە مایەی کێشە بۆی، هەر لەبەر ئەمە هیچ کتێبێك ناخوێنێتەوە لە دەرەوەی کتێبەکانی ئاینەکەی، تەنانەت لە دەرەوەی کتێبەکانی مەزهەب یان تاقمەکەی. زۆرێك لە موسڵمانان ئینجیل ناخوێننەوە، زۆربەی مەسیحییەکان قورئان ناخوێننەوە. زۆرێك لە شیعەکان کتێبەکانی سوننە ناخوێننەوە، زۆربەی سوننەکانیش کتێبەکانی شیعەکان ناخوێننەوە. ئەوانەی کە ناخوێننەوە ترسیان هەیە لە ناسینی حەقیقەت. ئاسودەن بەو بیروباوەڕەی هەیانە و لە باو و باپیرانەوە بۆیان جێماوە. ئەوانەی بە دوای حەقیقەتدا ناگەڕێن، تەنها بەزەییمان بۆ ئەو پێیە، هۆشداریش دەدەین لە شوێنکەوتنیان.

ئاسودە مەبە و پاڵمەدەوە بەهۆی ئاینی باوانت، بەبێ لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و وردبینی کردن، ئەگەر ئەمەت بە سەخت زانی، ئەوا بانگەشەی ئەوە مەکە حەقیقەتت لایە، گاڵتە بەوانەش مەکە کە لە ئاییندا لەگەڵت جیاوازن، لەوانەیە لە تۆ باشتر بێ. بەڵام ئەگەر توێژینەوەت کرد و ورد بوویتەوە و بڕوات بە ئاینێك هێنا، هەر چ ئاینێك، ئەوا پێویستە سوکایەتی نەکەی بە ئاینی ئەوانی دیکە، لەوانەیە مافی تۆ بێ لەم دۆخەدا بانگەشەی ئەوە بکەیت تۆ حەقیقەتت لایە، بەڵام مافی ئەوەت نییە بانگەشەی قۆرخ کردنی بدەیت.

بەم بۆنەیەوە، سوودی نووسینی ناوی ئاینی هەر تاکێك لەسەر ناسنامەی کەسی چییە؟ ئەم پرسیارەم لەخۆم کرد و وەڵامەکەم بەدەست نەکەوت، لەوانەیە زۆرێك جگە لە من ئەم پرسیارەیان کردبێ و وەڵامەکەیان دەستنەکەوتبێ. ناسنامەی کەسی گرێبەستی هاوڵاتیبوونە لە نێوان من و حکومەتی وڵاتەکەم، مافەکانم مسۆگەر دەکات، چەند ئەرکێکم دەخاتە ئەستۆ، ئایا ئەم گرێبەستە پێویستی بە باسکردنی ناوی ئاینەکەم هەیە؟ ئایا حکومەت هەڵسوکەوتی جیاواز دەکات بۆ نموونە لەگەڵ موسڵمان و مەسیحییەك، بۆیە پەنای بردۆتە بەر تۆمارکردنی ئایین لە ناسنامەی کەسیدا؟ وا دەردەکەوێ وەڵامەکە بەڵێ بێ، ئەگەرنا سور نەدەبوو لەسەر ئەم ڕێککارە، ئەگەر وەڵامەکە نەخێر بێ، ئەوا سوودی نووسی ناوی ئاینەکەم چییە لە ناسنامەی کەسیدا؟

## تاکە ئایین :

دەبینی بەلای ئەو وتەیەدا دەڕۆم، کە دەڵێت هیچ ئاینێك نییە لێرەدا حەقیقەت قۆرخ بکات، چونکە هیچ ئاینێك نییە توانای هەڵگرتنی هەموو وەڵامەکانی هەبێ بۆ خەڵك لەبارەی مانا و ئامانج و چۆنیەتی ژیان. لەوانەیە هۆکار لەمەدا نەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئایین بەڵکو بۆ سروشتی تێگەیشتمان بۆ ئایین بگەڕێتەوە. هەر دەقێکی ئاینی ملکەچی ڕاڤەی ئێمەی مرۆڤە. چونکە ئێمە جیاوازین، ئاینەکانیشمان جیاواز بوونە، لەبەر ئەوەی دەمانەوێ بانگەشەی حەقیقەت بۆ خۆمان بکەین، ئەوا بە درۆ بانگەشەی ئەوەمان کردووە کە ئەو ئاینەی ئێمە لەسەرینە حەقیقەتی قۆرخ کردووە، بەمەش ئاینەکان فرە جۆر بوونە. بۆچوونم وایە لە گشت بووندا تەنها یەك ئایین هەیە، سەبارەت بەوەی

ئێمە دەیزانین لە ئاینەکان، ئەوا تەنها چەند درەوشانەوەیەکی جیاوازی تێگەیشتن و دیدمانن لەبارەی ئەم تاکە ئاینە.

ئەم تاکە ئایینە چییە؟ وشەیەکی کۆمکار بۆ ئەم ئاینە نییە، هیچ ڕێنمایی و دروشمێکی دیاریکراو نییە، کە لەسەرت پیرۆز بێ پیادەی بکەی تا ببیتە یەکێك لە شوێنکەوتووانی، لە بنەڕەتدا هیچ تاکە نوێژێکی بۆ نییە، بەڵکو ئەم ئاینە هەموو ئاینەکانە لەگەڵ یەکتری. ئەگەر بتەوێ ناوێك لەم ئاینە بنێین، ئەوا پێی دەڵێین ئاینی فرەیی. بەڵێ فرەیی لە ئاینەکاندا بریتییە لە گوشراوی ئایین. وتەی ئەوەی هیچ ئاینێك نییە لێرەدا حەقیقەت قۆرخ بکات، ئەوە ئایینە. درك کردنمان بەوەی هەموو ئاینەکان لەسەر خێرن ئەمە ئاینە. ئەم ئاینە پابەندت ناکات بەوەی فێری گشت ئاینەکان ببیت، یان پیادەی گشت پەرستشەکانی تێدا بکات، ڕێگر نییە لەوەی تەنها ئاینی باوانت پێ بەس بێت، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوەی لێت دەوێت ڕێزی گشت ئاینەکان بگریت و باوەڕت هەبێت بە ڕاستی گشت ئاینەکان، سەبارەت بەوەی ئاینی باوانت حەقیقەتیان قۆرخ کردووە، ئەوا ئەمە لە ئایین نییە. پێویستە دان بنێی بە گشت ئاینەکاندا و داواش بکەی بەوەی گشت ئاینەکان دانت پێدا بنێن. ئەمە گرنگترین وتەیە لە ئاینی فرەییدا.

سەبارەت بە وتەی دووەم ئەوەیە گەورەترین بەها لەبووندا مرۆڤە، هەر ئاینێك خراپە و ئێش و ئازار بە مرۆڤ بگەیەنێ، ئەوا ئەمە هەرگیز ئایین نییە، بەڵکو بیرۆکەی کەسانێکی بایلۆژییە، کە هێشتا درکیان بە مرۆڤایەتی ڕاستەقینە نەکردووە. ئەوانەی پێیان وایە خاوەن ئاینن و دەستدرێژی دەکەنە سەر ڕێز و ئازادی مرۆڤ، ئەوانە خاوەن ئایین نین، بەڵکو تاوانباری بیروباوەڕین. سەبارەت

بەفرەیی ئاینـەکان و پـیرۆزی مـرۆڤ، ئـەوا ئـەو ئاینەیـە کـە گشت ئاینـەکان کـۆ دەکاتەوە.

## پوختە :

پێویستە لەسـەر هـەمووومان بگـەڕێین بـە دوای ئـەو ئاینـەی دینـداری پێـوە دەکەین، با هەمیشە یادمان بێنینەوە ئاینی باوانمان مەرج نییە ئاینی دروست بێ، دەبێ بزانین ماڤ هیچ ئاینێك نییە بانگەشەی قۆرخکردنی حەقیقەت بکات، بەڵکو ماڤ ئەوەی هەیە بانگەشەی ئەوە بکات حەقیقـەتی لایـە. بـەم بیرۆکانـە دەتـوانین نـەك تـەنها دینـدار بـەڵکو ئاینگـەراش بـین. بەختـەوەری و هێـز و ویسـت و ئامانجـەکانی مـرۆڤ، پشـت دەبەسـتێ بـە ئاینەکـەی نـەوەك دینداریەکـەی. ئـایین ناوەڕۆکە و دینداری ڕووکەشـە. ئـایین هەڵبـژاردنێکی پوختـە، مـرۆڤ بـە ویست و قەناعەتەکەی لە باوەشی دەگرێ، هەر بۆیە لاساییکردنەوە و شوێن پـێ هـەڵگرتن تیایدا دروست نییە، سەبارەت بە دینداری ئـەوا پێویسـتکراوە، بۆیـە دروسـتە یـان هەنـدێك جـار لاسـاییکردنەوە و شـوێن پـێ هـەڵگرتن تیایـدا پێویسـتە، دینـداری قۆنـاغی دوای ئاینـە، سـەرەتا بریتییـە لـە ئیمـان و بـاوەڕ، ئینجـا خۆشەویسـتی و گوێڕایەڵی، ئایین و دیندار هەر دووکیان داواکراون، بـەڵام ئاینێـك بـەبێ دینـداری سەرپێچییە، دینداری بێ ئایین گەوجییە.

# ڕەخنەگرتن لە بیرۆکەی پیرۆز

## پێنج شتە پیرۆزەکە:

وشەی پیرۆز پەیوەستە بە خوا یان بە ئاینەوە، واتە بە ئاسمانەوە، تا وتراوە ئایین گوزارشت دەکات لە (کۆمەڵێك ئاماژەی پیرۆز)، هەر بۆیە دەبینین پیرۆز زۆر تایبەتمەندە و لە سەرووی ڕەخنەوەیە، بیرۆکەی پیرۆز بەپاکگرتن و بە گەورەدانان و شکۆ و ترسان بە گوێچکەی بیسەرانیدا دەدات، پیرۆز هیچ کەم و کورتی و کرچ و کاڵیەکی تێکەڵ نابێ، هەندێك جار گوزارشت دەکات لە کامڵی. هەر بۆیـە دەبیـنین بیرۆکەی ئاینی شتەکان بۆ دوو بەش دابەش دەکات: پیرۆز و پـیس، پیرۆزەکـان لـە ئاینـدا پێـنج جـۆرن: دەقــە پیرۆزەکــان، شــوێنە پیرۆزەکــان، کاتــە پیرۆزەکــان، کەسایەتییە پیرۆزەکان، دروشم یـان پەرستشە پیرۆزەکان، بـۆ نموونـە لـە ئـاینی ئیسلامدا: قورئان کتێبێکی پیرۆزە، کەعبە شوێنێکی پیرۆزە، ڕۆژی هەینی کاتێکی پیرۆزە، خانەوادەی پێغەمبەر و هاوەڵانی کەسایەتی پیرۆزن، ڕۆژوو و نوێژ و حەج دروشم و پەرستشی پیرۆزن. لە ئاینی مەسیحیدا: ئینجیل کتێبێکی پـیرۆزە، کڵێسا شوێنێکی پیرۆزە،ڕۆژی یەك شەممە کاتێکی پیرۆزە، قوتابیـەکانی عیسای مەسیح کەسـایەتی پـیرۆزن، هـەروەها نوێـژ و ڕۆژوو دروشمـی پـیرۆزن. بـە هـەمان حـاڵ سەبارەت بە گشت ئاینەکانی جیهان، خەریکە هیچ ئاینێك لەم پێـنج شـتە پـیرۆزە بـەتاڵ نـەبێ. شـایەنی باسـە ئـەم شـتە پیرۆزانـە بەیەکـەوە بەسـتراونەتەوە بەشێوەیەکی ئـاڵۆز، زۆرێـك لـە دروشمـەکان پشتیان بـە دەق یـان کەسـایەتییەکان بەستووە، زۆر شوێنیش بە چەند کەسێکەوە یان چەند دەقێکەوە بەستراونەتەوە، زۆرێك لـە کەسـایەتییەکان بوونەتـە کەسـی پـیرۆز، دوای ئـەوەی دەقێـك لـەبارەی

ستايش و پێداهەڵدانی هاتووە، هەمان حاڵ سەبارەت بە چەند دەقێك كە بوونەتە دەقی پیرۆز، چونكە كەسێكی پیرۆز باسی كردووە.

## یەكەم/ پیرۆزی دەق:

پیرۆزی دەق واتە باوەڕبوونی تەواو و لێبڕاوە بە ڕاستگۆیی دەق و گوزارشت كردنی لە ڕاستی، دوو سیفەتی دیكەش بۆ ئەم سیفەتە زیاد دەكرێن، چەسپان و دەستكاری و نەگۆڕان. مەبەست لە دەقی ئاینی هەر دەقێكە لە كتێبە ئاینیەكانەوە باس دەكرێ، ئەو ئاینە ئاسمانی یان دەستكرد بێ، زۆربەی جاران دەقی ئاینی نووسراوە. هەر دەقێكی ئاینی یان نا ئاینی بێژە و مەبەستە، بێژە: ئەو دەربڕینەیە پەیوەستە بە پیتەوە، سەبارەت بە مەبەست ئەوا ئەو هزرەیە كە پێویستە بێژەكە دەری ببڕێ.

دەبێ ئێستا وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە كە پێمان وایە زۆر گرنگە: ئایا كامەیان پیرۆزە لە دەقدا، شێوەی دەق (پیت و بێژەكەی) یان مەبەستەكەی؟ ئەگەر شوێن وەڵامە گریمانەكراوەكان بكەوین لەبارەی ئەم پرسیارە ئەوا سێ وەڵام بەدی دەكەین: یەكەم، پێی وایە دەقی ئاینی لە شێوە و مەبەستەكەیدا پیرۆزە، دووەم، پێی وایە تەنها لە شێوە و ڕووكەشەكەیدا پیرۆزە، سێیەم: پێی وایە دەقی ئاینی پیرۆز نییە نە لە شێوە و نە لە مەبەستدا.

دەكرێ شێوەی دەق چەسپاو و پیرۆز بێ، سەبارەت بە مەبەستی دەق ئەوا ناكرێ وابێ، چونكە هزر و دید و واتاكان كە دەقی ئاینی هەڵیدەگرێ، لە كەسێك بۆ كەسێك و لە شوێنێك بۆ شوێنێك و لە كاتێك بۆ كاتێكی تر دەگۆڕێت. هەر

بۆیە ئەگەر دانبنێین بە پیرۆزی شێوەی دەق (پیت و بێژەکەی)، پێمان وابێ چەسپاو و پاکە لە گشت کەم و کورتیەك، ئەوا سەختە دانبنێین بە پیرۆزی چەمکی دەقدا، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ:

١- مەبەست و مانای دەقی ئاینی دەگۆڕێ لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، یان بە دەربڕینێکی وردتر لە عەقڵێکەوە بۆ عەقڵێکی تر دەگۆڕێت، ئەمەش وای کردووە زیاد لە ڕاڤەیەك بۆ یەك دەقی ئاینی هەبێ، دەقە ئاینیەکان کە ڕاڤەکاران لەسەر یەك مانای کۆکن زۆر دەگمەنن.

٢- مەبەست و مانای دەقی ئاینی لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێت، دەقی ئاینی کە لە کاتی دەرکەوتنیدا مانایەکی هەڵگرتووە، لە دوای دەیان یان سەدان ساڵ مانایەکی تری هەیە، ئایا مانا و مەبەستی یەکەم پیرۆزی خۆی پاراستووە؟ ئایا مانا و مەبەستە نوێیەکە پیرۆزی خۆی بۆ نموونە لە دوای سەد ساڵی تر دەپارێزێ؟

٣- مانا و مەبەستی دەقی ئاینی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگۆڕێت، زۆرێك لە دەقە ئاینیەکان، بەتایبەت ئەوەی هەڵسوکەوتێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوی لەسەر بەرپا دەبێ، دەبینین ماناکەی لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ تێگەیشتن لە دەقێك بەپێی داب و نەریت و عورف و عادەتی باوی کۆمەڵگە لە شوێنێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ، لەوانەیە لە شوێنێکی تر قبوڵکراو نەبێ.

ئەم ڕاجیاییە لە دیاریکردنی پیرۆز و نا پیرۆز لە دەقی ئاینیدا، هۆکاری سەرەکی و شاراوەیە لە پاڵ ململانێی گەرمی نێوان بانگخوازانی چەسپاو و بانگخوازانی گۆڕاو، بانگخوازانی چەقبەستوویی و بانگخوازانی نوێخوازی، لە نێوان

ئەوەی وا دەبینێ حەقیقەتی ڕەها لە دەقی ئاینیدایە لەگەڵ ئەوەی پێی وایە حەقیقەتی ڕێژەیی تێدایە.

ئەوانەی بەرگری دەکەن لە پیرۆزی مانا و مەبەستی ئاینی پێیان وایە جیاوازی لە تێگەیشتن لە دەق، بەو شێوەیەی پێشتر باسمان کرد، خاسیەتێکە دەدرێتە پاڵ دەق و لە پیرۆزیەکەی کەم ناکاتەوە، وای تیایدا دەبینن توانای ڕۆیشتنی هەیە لەگەڵ سەردەم و گەشە، دانایی و حیکمەتێکی دابەزێنەری دەق هەیەتی. ئەمە بە نزیکەی لەلای هەمووان قسەیەکی باش و پەسەندە ، بەڵام لە واقیعدا کاری پێناکەن. ئەوان هەر مانایەکی تازە ڕەت دەکەنەوە، کە تاك بۆ دەق دەیهێنێ، لەوانە ئاستی ڕەتکردنەوەکە بگاتە ئاستی دەرکردنی خاوەنی ئەم تێگەیشتنە لەو ئاینەی کە دەقەکە دەدرێتە پاڵی، تەنانەت هەندێك کات بەفیڕۆدانی خوێنەکەی و کوشتنی. پێیان وایە مرۆڤ ناتوانێ لە دەق تێبگات، تەنها لە دوای شارەزابوون نەبێ لە کۆمەڵێك زانست و زانیاری تایبەت، بەمەش ڕێگە دەگرن لەبەردەم زۆرێك لە لێکۆڵەران، بە پاساوی ئەوەی کەسانی پسپۆر نین لە توێژینەوەی دەقی ئاینیدا، ئەم بەڵگەیە شتێك لە حەقیقەت و چەندین شتی زۆر لە نا حەقیقەتی تێدایە.

ئەوانەی بەرگری لە پیرۆزی مانای دەق دەکەن، پێیان وایە ئەوان لە پێشترن لە تێگەیشتن لە دەقدا، یان بە دەربڕینێکی تر، تەنها ئەوان توانای تێگەیشتنیان هەیە لە دەق، هەر بۆیە مۆڵەت نادەن بە هیچ یەکێکی تر لە دەق تێبگەن بە تێگەیشتنێکی تازە یان جیاواز. ئەوەی نامۆیە ئەوەیە ئەوان هێشتا دەستگرن بە تێگەیشتنێکی کۆن بۆ دەقی ئاینی، کە چیتر هەماهەنگ نییە لەگەڵ پێداویستی و داخوازیەکانی سەردەم، بەڵکو تێگەیشتنێکە هەندێك جار تێکدەگیرێ لەگەڵ

هەنـدێك سـەلمێنراوە زانسـتیەكانیش، چ لـە زانسـتە سروشـتییەكان یـان زانسـتە مرۆییەكان (بۆ نموونە: كۆمەڵایەتی و دەروونی و پەروەردەیی) بێ. ئەگەر كەسێك دەركەوت كـە دژەڕای ئـەو مانایـە ڕەگ داكوتـاو بـوو لـە گوێچكەكانیاندا، لـەبارەی دەقەكە، ئەوا بە بەرهەڵستكار و نكۆڵیكار و كافری دادەنـێن بەرامبـەر بـە دەق و سەرچاوەكەی، لـە تێگەیشـتن لـە دەقەكەشـدا لەگـەڵیان جیـاواز نییـە، ئائەمەیـە كارەسات.

بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێ لە قەیرانی پیرۆزی دەقی ئاینی، پێویستە لەسەرمان تێبگەین كە دەقـی ئـاینی شـێوەیەكی هەیـە نووسـراو و بێـژە دەگرێتـەوە، دەكـرێ ئەمە پیرۆز بـێ. هـەروەك مەبەست و مانایـەكی هەیـە نـاكرێ پـیرۆز بـێ، چونكە گۆڕاوە لە كەسێكەوە بۆ یەكێكی تر و لـە كـات و شـوێنێكەوە بـۆ كـات و شـوێنێكی دیكە، بە دڵنیایەوە ئەمە ڕێگر نابێ لەوەی دەقی ڕێز لێگیراوبێ لـە ڕووی شـێوە و مەبەست و ماناوە. هەروەك تێگەیشتن لـە دەقـی ئـاینی بـۆ كـەس قـۆرخ نـەكراوە، سەردەمی قۆرخكردن بەسەرچووە، تەنها توونـدڕەوان بانگەشـەی ئـەوە بـۆ خۆیـان دەكەن حەقیقەت یان تێگەیشتن لە دەقی ئاینیان قـۆرخكردووە. لێكۆڵـەری بـواری كاروبـاری ئـاینی مـاڤی ئـەوەی هەیـە لـە تێگەیشـتن لـە دەقـی ئـاینی هـەڵهێنجێت، دژەڕاكان بۆیان هەیە بەرپەرچی بدەنـەوە بەهـەر جـۆرە وەڵامێـك، بـەو مەرجـەی توونـد و تیژی بەكارنەهێنرێ، ئێمە هیوای ئەوەیان لێدەخوازین. زۆرێك لەوانـەی هـەوڵیان داوە لـە دەقـی ئـاینی تێبگـەن بوونەتـە قوربـانی ئەوانـەی بانگەشـەی قۆرخكردنیـان كـردووە، هەیانـە ژیـانی خـۆی لەدەسـتداوە، هەشـیانە بـە كـوفر تۆمـەتبار كـراوە، هەیانـە ناچـار كـراوە بـێ دەنگـی هەڵبـژێرێ و نووسـین نـەكات، هەشیانە لە شار و وڵاتەكەی بەدەر نراوە، تا لە تاراوگەدا بژیەت لە وڵاتی نامۆدا.

## دووەم / پیرۆزی پیاوانی ئاینی:

پیرۆزی دەقی ئاینی ڕامان دەکێشێ بەرەو پیرۆزی ئەوەی قسە بە ناوی دەقی ئاینیەوە دەکات، ئەو کەسە کەسایەتیەکی مێـژوویی یـان هاوچـەرخ بێـت، ئـەویش دەبێتە کەسـێکی پـیرۆز (ئەمـە کارەساتەکەیە)، چـونکە ئـەوەی لـەوەوە سەرچاوە دەگرێ دەبێ وەڵامـدەرەوەی تێگەیشـتنی دەق بێـت، ئەمـەش زۆرێکی کێشکردووە بەرەو تێگەیشتن لە دەقی ئاینی لەبەر ڕۆشنایی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ئەو کەسە پیرۆزە، بەڵکو زۆر جار لەبەر ڕۆشنایی ئەو خەونە پڕوپوچانەی ئەو کەسە پیرۆزە دەیبـینێ لـە خەونەکەیـدا. ئـەم تێکەڵکارییـە لـە نێـوان پـیرۆزی دەق و پـیرۆزی قۆرخکـەرانی تێگەیشـتن لـە دەق، سەریکێشاوە بـۆ دەرکـەوتنی زۆرێـك لـە مانـا و مەبەستی هەڵە بۆ دەقی ئاینی، ئەمەش دەبێتە پاڵنەر بـۆ دەسـتگرتتن بـە چـەند کردەوەیەك، کە هەندێك جار لە دوور و نزیك پەیوەندی نییە بە ناوەڕۆکی دەقی ئاینیەوە.

وایلێهاتووە لە مێژووی گشت ئاینەکاندا کەسایەتی پیرۆز هـەبن، لەسـەرووی ئاستی گومان یان ڕەخنەکانەوە، ناکرێ هیچ کەسێك باسی کەم و کورتی و کـرچ و کاڵیەکی بکات، ئەمانە کەسایەتی کامڵ و نموونەیی و پارێزراون. ئەگەر یەکێك لـە لێکۆڵەران یان خوێنەران هەوڵیدا ئاماژە بکات بە ڕووداوێکی مێژوویی کە تیایدا وا ببینێ فڵان کەسایەتیە پیرۆزە هەڵەی کـردووە، ئـەوا ئەمـە بـە تانـەدان لـە کەسـی پیرۆز دادەنرێ، دونیا هەڵدەستێ و جێگیر نابێ تەنها بە تۆبـەی ئـەم توێـژەرە بـێ ئاینە نەبێ، کە بوێری دەکات و دەستی درێژ کردووە بـۆ کەسـە پیرۆزەکە، ئەگـەر کەسە بێ ئاینەکە سوربوو لەسـەر بوێریەکـەی، ئـەوا تـەنها ڕووبـەڕووی تـەکفیر و دەرکران لە ئایین یان فەتوایەکی بچوك دەبێتەوە کە خوێنەکـەی بـە فـیڕۆ دەدات،

لەوانەشە یەکێك لە گەنجە بەجۆش و خرۆشەکان جێبەجێی بکات، بەمەش دەرەنجامەکەی دەبێتە لەناوبردنی ئەم کەسە بێ ئاینە، کە هەوڵیداوە دەستدرێژ بکات بۆ نیشانە و کەسایەتییە پیرۆزەکانی ئایین.

بێگومان کەسایەتییەکانی مێژوو، کە بەستراونەتەوە بە ئاینێك، ناکرێت پیرۆز بن، مرۆڤ هەر مرۆڤە لە گشت کات و شوێنێك، ئەگەر یەکێك بنەمایەکی پەسەند کرد و کاری لەسەر بڵاوکردنەوە و بانگەواز بۆ کردنی کرد، ئەوا ئەمە نایپارێزێ لە خلیسکان و هەڵە، کارەکانیشی هەرچەندە بەرز و دەگمەن بن بەرز ناکاتەوە بۆ سەرووی ئاستی ڕەخنە لێگرتن، ئەو لە سەرەتا و کۆتادا مرۆڤە، بە ئازادی و سەرپشکی و تواناداری لەسەر پیادەکردنی ڕاست و هەڵە دروست کراوە، مادەم وایە، ئەوا کەسێکی پارێزراو (معصوم) نییە، ئەو کاری کردووە بەپێی ئەوەی پێی وابووە ڕاستە، بەپێی بیروباوەڕ و بارودۆخی کات و شوێنەکەی، ئەم کارەی ئەو لەوانەیە ڕاست نەبێ لە تێڕوانینی کەسانی تر، کە خاوەن بیروباوەڕی جیاوازە و دەگونجێ لەگەڵ بارودۆخی کات و شوێنی جیاواز لەوەی پێشوو. ئەم کەسایەتییە مێژووییە لەوانەیە بەڕێز و دروشاوە و دانا بێ، بەڵام هەرگیز پیرۆز نابێ، بەو مانایەی لەسەرووی ڕەخنەوە نییە، هەرچی لەوەوە دەردەچێ دەستووری کاری ئێمە نییە لەو سەردەمەماندا، کە جیاوازە لەو سەردەمەی ئەم کەسایەتییە دروشاوەیە تیایدا ژیاوە.

ئەمە سەبارەت بەوەی پەیوەستە بە کەسایەتییە ئاینیە مێژووییەکانەوە، چ لە مێژووی دوور یان نزیکدا، دەربارەی ئەوەی پەیوەستە بە کەسایەتیەکانی ئێستا و کار لە بواری ئاینی دەکەن، ئەوا ئەمانە تەنها چەند کەسایەتیەکی پسپۆرن لە بواری کاروباری ئاینیدا، خاوەن ڕێز و حورمەتێکی یەکسانن لەگەڵ ڕێز و

حورمەتی هەر پسپۆڕێکی تر بۆ نموونە لە بواری کاروباری پزیشکیدا. ئەندازەی ئەم ڕێز و حورمەتە گونجاو دەبێ لەگەڵ قەبارەی ئەوەی ئەم کەسایەتییە بەرهەمی دێنێ، هەر کەسێك خۆی سەرقاڵ بکات بە پزیشکیەوە شایستەی ڕێزداری نییە، لەوانەیە فێڵبازی بێ، هەمان حاڵیش سەبارەت بەوانەی سەرقاڵ و کار دەکەن لە بواری ئایندا. ئەوەی کار لە بواری ئایندا دەکات، سەرقاڵی پیشەیەکە وەك هەر کەسێکی تر کە سەرقاڵە لە بواری دونیادا، هەر دووکیان کار دەکەن تا بژین. تەرازووی ڕێز و حورمەت، نەوەك پیرۆزی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەندازەی دڵسۆزیان لە کارەکانیاندا و هەوڵیان لە پێناو ئەنجامدانی بە تەواوترین شێوە. بەم تێگەیشتنە هیچ پیاوێکی ئاینی پیرۆز لەلامان نابێ، لێرەدا هیچ کەسێك نییە هەر چەندە پێگەی بەرز بێت لە سەرووی ڕەخنەوە بێت، هەمووان ملکەچی ڕەخنەن، چونکە مرۆڤن، هەڵە دەکەن وەك چۆن هەندێك جار پزیشك هەڵە دەکات لە وەسف و دیاری کردنی دەرماندا.

## سێیەم: پیرۆزی شوێنە ئاینیەکان:

ئای چەند گیان و ڕۆح کێشران بە پاساوی بەرگری کردن لەو شوێنانەی کە بڕوا وابوو پیرۆزن، ئای چەند جەنگ هەڵگیرسان، چونکە کەسێك بوێری کردووە قسە یان کردارێك بنوێنێ بەرامبەر بە یەکێك لەم پیرۆزیانە. ئەرکمانە درك بەوە بکەین شوێن هیچ شتێك نییە مادەم مرۆڤ بەرز نەکاتەوە، تەنانەت ئەگەر شوێن کاولیش بکرێ ئەوا دەکرێ دروست بکرێتەوە، بەڵام مرۆڤ نا. ڕووخاندنی گشت پیرۆزیەکان یەکسان نییە بە ڕشتنی یەك دڵۆپە خوێن لە مرۆڤێك، کە خوای مەزن ڕێزدار و پیرۆزی کردووە.

ڕووخانـدنی گـۆڕی پـیرۆز، لـە سامەڕا (عێـراق)، کـە لـەلای شـیعە پـیرۆزە، جەنگێکی ناوخۆی لە نێوان شیعە و سوننە هەڵگیرساند، هەزاران کەس بەهۆیـەوە بوونە قوربـانی، قێـزەونترین تـاوانی تێـدا ئەنجامـدران، تـا گەیشـتە مـل پەڕانـدن، بڕینی ئەندامەکانی جەستەی زارۆك، ئایا هیـچ شوێنێك هەر چـەندە پیرۆزەیـەکی زۆر بـێ، دەگاتـە ئـەوەی لـە پێناویـدا ڕۆحـەکان بکێشـرێن و کەسـەکان بکـوژرێن؟ لەوانەیە گوزارشتی (کەعبە پـەروەردگارێکی هەیـە دەیپـارێزێ) چـاکترین وەڵام و وانەیە بۆ هەموومان.

## چوارەم/ پیرۆزی کاتە ئاینیەکان:

ئایا بۆ موسڵمانان دروستە، لە نێوان خۆیاندا ململانێ بکەن و هەر یەکەیان ئەوەی تـر تۆمەتبار بکات بە پوچەڵی ڕۆژووەکەی، تەنها لەبەر ئـەوەی یـەکێك بـۆ نموونە مانگی ڕەمەزانی بینیوە لە شەوی یەك شـەممە، ئـەوەی تـر لـە شـەوی دوو شەممەدا بینیویەتی؟ هیچ کەسێکی ژیر ئەمە ناڵێت، بەڵام ئەمـە بارودۆخەکەیـە. موسڵمانان و جگە لەوانیش بەهەمان شێوە خۆیان داوەتە دەست پیرۆزی کاتـەکان، پیرۆزی مرۆڤیان بیرچۆتەوە یان لەبیرە خۆیان بردۆتەوە، کە ئـەم کاتانـە دانـراون بۆ خزمەت و بەرژەوەندی مرۆڤ، نەوەك بۆ ئەوەی بیبەسـتێتەوە و برایەتیەکـەی پەرت بکات. جیاوازی لە کـاتی جـەژن و نوێـژ و بۆنـەکانی تـریش، دەکـرێ لابچـێ ئەگەر زانیمـان کاتـەکان ئـەو پیرۆزیـە ڕەهایـەی نییـە کـە بڕوامـان وایـە نـاتوانین بیبەزێنین یان سوکی بکەین.

## پێنجەم/ پیرۆزی دروشمە ئاینیەکان:

دروشمە ئاینیەکان پیادە دەکرێن، لە وەڵامی چەمکی پیرۆزدا، جا دەق یان کەس یاخود شوێن یان کات بێ، بەمەش ئەم دروشمانەش پیرۆز دەبن، بەو مانایەی پیرۆزیەکەی وەردەگرێ لە پیرۆزی ئەو شتەی دەدرێتە پاڵی لە دەق یان کەس یاخود شوێن یان کات، دروشمی پیرۆز دەکرێ پشت ببەستێ بە یەکێك لەم چوار شتە پیرۆزە یان زیاتر، بۆ نموونە دەکرێ پشت ببەستێ بە دەقێکی پیرۆز و کەسێکی پیرۆز و بەس، دەکرێ دروشمێکی تر پشت ببەستێ بە کەس و شوێنێکی پیرۆزی تر. هەندێك لە دروشمە ئاینیەکان گیانی مرۆڤ بەرز دەکەنەوە و ئەوەی لێی تێکچووە لە سەختیەکانی ژیاندا چاکی دەکەنەوە، هەندێکی تر لە پێگە و رێزی موسڵمان کەم دەکەنەوە و دەیکەنە ئامێرێکی بێ دەنگ، نازانێ چی دەکات. هەر بۆیە لەسەر گشت مرۆڤێك پێویستە ورد ببێتەوە لە دروشم و پەرستشەکانی ئاینەکەی، ئەوانەی لێ هەڵبژێرێ کە یارمەتی دەری دەبن بۆ بەرزکردنەوەی گیان و ژیریەکەی، ئاور بەلای دروشمەکانی تردا نەداتەوە، کە لەوانەیە لە داهێنانی کەسانێك بێ، کە پێیان وایە بەرژەوەندی و سوودی ئەوانی تێدایە.

## مەبەست لە رەخنەگرتن لە بیرۆکەی پیرۆز:

مەبەست یان ئامانج چییە لە دیاریکردنی مانا و سروشتی پیرۆز؟ ئایا بریتییە لە رزگاربوون لە بیرۆکەی بوونی کامڵ یان بەپاکگرتن لەم جیهانە؟ نەخێر ئەمە نییە، ئەمە تەنها هەوڵێکە بۆ پێدانی پێگەی شایستەی عەقڵ بە عەقڵ لەم بوونەدا. بیرۆکەی پیرۆز کار دەکات لەسەر پەکخستنی عەقڵ و ژیری لە زۆربەی لایەنەکانی ژیاندا، لە ژێر دروشمی پیرۆزیدا. لە توانای عەقڵدا نییە کار

بکات لە تێگەیشتنی دەقدا، چونکە ئەم دەقە پیرۆزە تەنها خاوەن ماف و جیاوك (إمتیاز)ەکان بۆیان هەیە لێی تێبگەن. لە وزەی عەقڵدا نییە ڕەخنە بگرێ یان کەم و کورتی و کرچ و کاڵی لەم کەسایەتییە مێژووییە یان پیاوی ئاینیـەدا بـۆ خـەڵك دەستنیشان بکات، چونکە هەر دووکیان پیرۆزن. بۆ عەقڵ نییە ڕەخنە بگرێ لـەم دروشمە، کە هیچ سودێکی لێ چاوەڕوان ناکرێ، چونکە پیرۆزە. بەمـە بیرۆکـەی پیرۆز کار دەکات لەسەر پەکخستنی ئـەرکی عـەقڵ، مـرۆڤ دەگـۆڕێ بـۆ ئـاژەڵێکی کۆمەڵایەتی، لە کردارەکانیدا ملکەچی هەڵسوکەوتی ڕانە مەڕە.

ڕزگـارکردنی عـەقڵ لـە دەسـەڵاتی بیرۆکـەی پـیرۆز، ڕێگـە دەکاتـەوە بـۆ وەرگرتنـی تیـۆری (فرەیـی ئـاینی)، کـە ئـەوە دەگەیـەنێ زۆربـەی ئاینـەکان حەقیقەتیان لایە، زۆربەی دیندارەکان ڕاست دەکەن لـە بیروباوەڕەکانیانـدا، خـوای مەزن ئەم فرەجۆری و جیاوازیەی ویستووە، زۆربەی مـرۆڤ ڕێنـوێنی کـراون. لـە شوێنێکی تری ئەم کتێبەدا هەڵوەستەیەك دەکەین لەسەر تیۆری فرەیی ئاینی، بەڵام دەمانەوێ لێرەدا ئاماژە بکەین بەوەی بیرۆکەی ئاشتی جیهانی ناکرێ بـەرپا بێ، ئەگەر باوەڕمان نەبێ بە تیۆری فرەیی ئـاینی، کـە جـەخت دەکاتـەوە لەسـەر کەم کردنەوەی زاڵبوونی پێنـج شتە پیرۆزەکە بەسەر عەقڵدا.

## پیرۆزی و چەوساندنەوە :

سەرباری ئەوەی باسکرا، بیرۆکەی پیرۆزی مـاف بـە کەسانێکی پەیوەندیـدار دەدات بڕیار لە چارەنووسی کەسانی تـر بـدەن، لەوانەیـە یـەك کـەس مـافی ئـەوەی هـەبێ جـەنگ هەڵبگیرسێنێ، یـان یاسـاکان دابڕێـژێ بەپاسـاوی ئـەوەی کەسـێکی پـیرۆزە. بیرۆکـەی پـیرۆزی کەسـەکان، بیرۆکـەی زاڵبـوون یـان ئـەوەی ئـەمڕۆ بـە

ـیكتاتۆریەت ناسراوە بـەهێز دەكات، زۆر خوێندوومانەتـەوە و بینیومانـە چـەند حوكمڕانێـك سـتەم و زۆرداری دەكـەن، بـە پاساوی ئـەوەی گوزارشـت دەكـەن لـە قەمچی خوا لەسەر زەوی و ئەوان پیرۆزن.

چەمكی پیرۆزی بەكارهێنراوە بۆ دژایەتی كردنی گشت وێنەكانی نوێسازی و داهێنانی هزری لە گشت جیهاندا و لـە میانـەی كـاروانی دوور و درێـژی مێـژوودا. زۆربەی كات زۆرێك لە بیرمەنـدان دووچاری چەوسانەوە و كوشتن دەبوونـەوە، بـە پاساوی سـنووربەزانـدن و دەسـتدرێژی كردنیـان بـۆ پیرۆزیـەكانی ئـایین. هـەروەك چەمكی پیرۆزی بەشێوەیەكی دزێو بـەكارهێنرا لـە سیاسـەتدا، چـەند دەسـەڵاتدار، دەسەڵاتەكەی قۆستۆتەوە بۆ كوشتن و ئەشكەنجەدان و هەڵگیرساندنی جـەنگ، لـە ژێر دروشمی خوای پێی وتم یان گوێبیسـتی دەنگی پـەروەردگار بـووم و پێـی وتم فلان كارە بكە و بەم جۆرە سەرم دەخەی. ئێستا كتێبێكم لەبەردەسـتە، لـەبارەی حكومەتەكەی ئەسـكەنـدەری سـێیەم دەدوێـت، كـە قەیسـەری ڕوسیا بـوو، جڵەوی دەسەڵاتی گرتەدەست لـە سـاڵی ١٨٨١ و سـەرەتای سـەردەمەكەی دەسـتی پێكـرد بـە جێبەجێكردنی حوكمی لە سێدارەدان لەبەردەم چاوی خەڵك لەسەر ئافرەتێك، بۆ یەكەم جار لەوەتەی نیو سەدە، ئەم ئافرەتـە لـە نێـو ئەو پیلانگێڕانـەدا بـوو، كـە باوكی ئەویان كوشتبوو (ئەسكەندەری دووەم). ئەسكەنـدەر بەرەبـەیانی دانیشـتنی لەسەر تەخت و عەرش ئەمەی بڵاوكردەوە و وتی: (دەنگی خوا بانگمان دەكات، بە چەسپاوی بوەستین لـە لوتكـەی حوكمەتـدا، باوەڕمـان هـەبێ بـە هێـزی دەسـەڵاتی ئۆتۆقراتیەت و دادگەریەكەی، ئەو دەسەڵاتەی وەرمان گرتـووە، تـا زیـاتر بـەهێزی بكەین و بیپارێزین بۆ چاكە و بەرژەوەندی خەڵك لـە دژی هـەر دەسـتدرێژیەك). ئـەم قەیسـەرە قێـزەونـترین كارەسـاتی ئەنجامـدا دەرهـەق بـە گەلـە برسـیەكەی و بیرمەندانی سەردەمی خۆی، بە دروشمی (بێگومان دەنگی خوا بانگمان دەكات).

## پیرۆزی مرۆڤ :

لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەین ئەگەر بڵێین ژمارەیەك لە یاسا و ڕێسا دانراون بۆ خزمەتی جگە لە مرۆڤ. چەند یاسا و ڕێسایەك تەنها سەرشۆڕی و چەوساوەیی بۆ مـرۆڤ هێنـاوە، دانـەرانی بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن بـۆ بەرژەوەنـدی مـرۆڤن، لـە حەقیقەتدا بۆ بەرژەوەندی یاسادانەرەکانە، چـەند یاسـایەك کـە بوونەتـە شـتێکی پـیرۆز و لـە پێناویـدا پـیرۆزی مـرۆڤ ڕەتکراوەتـەوە. لەوانەیـە زێـدەڕەوی نەکـەین ئەگەر بڵێین هیچ یاسایەکی پیرۆز بە ڕەهایی بوونی نییە، بـەڵام دەکـرێ هەنـدێك لـە یاسـاکان ڕێـز و حورمـەت بەدەسـتبهێنن کاتێـك دەرژێنـە خزمـەتی مـرۆڤ و بەپیرۆزگرتنی، مـرۆڤ تاکـە شـتی پـیرۆزە، کـە دەبـێ پیرۆزەکانی تـر لەبەردەمیـدا بچەمێنەوە، نە پیرۆزییە ئاینی و نە پیرۆزیـە دەسـتکردەکان شایستەی ئـەوە نـین دڵۆپە خوێنێکی یەك کەسی لە پێناودا بڕژێت. بـەڵکو زۆر گونجاوە هـەموو شـتە پیرۆزەکانی تـر کەم و بچوك ببنەوە لەبەردەم پیرۆزی مرۆڤ.

## گەشە پێدان یەکێکە لە نیشانەکانی پیرۆزی مرۆڤ :

ئەو حکومەتانەی بەڕاستی ڕێز لە مرۆڤ دەگرن، بریتین لەوانەی خوێندن و تەندروسـتی و خـۆراك و شـوێنی نیشـتەجێبوون و ئـەوەی پێیـەوە پەیوەسـتە لـە پیشەسازییەکان بۆی دابین دەکەن. بـەڵام ئـەوەی ئـەم پرسانە پشتگوێ دەخـات و بایـەخ بـە چـەند پرسـێکی تـر دەدات، کـە پـیرۆزی مـرۆڤ ناپـارێزن، ئـەوا تـەنها شایستەی تانە و بەرهەڵستی ئێمەیە. خوێندن و تەندروسـتی و خـۆراك و شـوێنی نیشـتەجێبوون و ئـەوەی پێیـەوە پەیوەسـتە لـە پیشەسـازییەکان خولگـەی ڕێـز و پیرۆزی مرۆڤن. پیاوی ئاینی عەقڵی خەڵك سەرقاڵ دەکات بـە پرسـەکانی نـاکۆکی

نێوان ئاینەکان، وازناهێنێ لە ناشرین کردنی بیروباوەڕی ئەوانی تر و بە هەڵەدانانی، خەڵکی ئاراستە ناکات بەرەو ئەوەی پیرۆزی و ڕێزی ئەوان دەپارێزێ، ئەمە پیاوی ئاینیە دەبێ لێ وشیار بین و لێی دڵنیا نەبین، چونکە بەشێوەیەکی سادە ڕێز لە وشیاری ناگرێ، بەڵکو کەرکردن بەپیرۆز دەگرێ، بەپێی دەربڕینی عەلی شەریعەتی.

## پیرۆزی نیشتمان :

زۆر جار گوێبیستی دروشم و هوتافی بە پیرۆزگرتنی نیشتمان و بەرزکردنەوەی تا پلەی پیرۆزی دەبین، لە بەرامبەر دەبینین پیرۆزی مرۆڤ ڕەت دەکاتەوە و ئەرکەکەی دەکاتە بەرگری کردن لە نیشتمان، دروشمی (دەمرین تا نیشتمان بژیەت) یەکێکە لەو دروشمانەی مرۆڤ دەکاتە قوربانی و بانگەشەی پیرۆزی نیشتمان دەکات. شاعیری عێراقی ئەحمەد مەتەر لە چامەکەیدا (نیشتمان بکەوێ) باسی کردووە، لە دێڕەکانیدا هاتووە:

لە دوامان گڵ و بۆگەنی دەمێنێتەوە.

ئێمە نیشتمانین!

لە پاشمان ئاژەڵ و پاشەڕۆ دەمێنێتەوە.

ئێمە نیشتمانین!

ئەگەر بەخشندە و ئارام بەخش نەبێ بۆ مان

بەڕێز نەبێ

ئازاد نەبێ

یاخوا نە ئێمە بژین... نە نیشتمانیش بژیەت!

ئەوەی ئەحمەد مەتەر مەبەستیەتی، ئەوەیە ڕێز و حورمەت و ئازادی نییە، بۆ هەر نیشتمانێك، کە ڕێز و حورمەت یان ئازادی بۆ مرۆڤی تێدا نەبێ. ئەمە ئەو شتەیە کە دەبێ هەمووان درکی پێ بکەن بە دەسەڵاتداران و هاوڵاتیانەوە، پیرۆزی مرۆڤ سەرچاوەی گشت پیرۆزیەکانە.

## پوختە:

مەبەست لە ڕەخنەگرتن لە بیرۆکەی پیرۆزی، بریتییە لە: یەکەم، ئازاد کردنی عەقڵ. دووەم، ڕەتکردنەوەی زاڵبوون و خۆسەپاندن. سێیەم، بوار واڵاکردن لەبەردەم بیرۆکەی فرەیی ئاینی. چوارەم، ڕێگە خۆشکردن بۆ چەمکی ئاشتی جیهانی. ئەم چوار خاڵە دەمانبەن بەرەو چەمك و مانایەکی تازە، ئەویش پیرۆزی مرۆڤە، ئەو تاکە پیرۆزەی تەنها کەمینەیەك قسەی لەسەر دەکەن، مرۆڤ بەرزترین نرخە لە بووندا. ئەو بەدیهێنراوەیە کە لە پێناویدا ئاینەکان پەیدابوونە و پێغەمبەران ڕەوانەکراون و چاکخوازان دەرکەوتوون، لە پێناویدا گشت بوونەوەر بەدیهێنراون. سەبارەت بەوەی پیاوانی ئاینی بانگەشەی دەکەن لە بوونی پێنج شتە پیرۆزەکە، کە بریتین لە دەق و کەس و شوێن و کات و دروشمەکان، ئەمە تەنها بەرتەسکردنەوەی پیرۆزی مرۆڤە، وا لە مرۆڤ کردنە تا بژیەت لە پێناو ئەم شتانە کە گوایە پیرۆزن، بێ ئەوەی ئەم شتانە ڕام کرابن بۆ پیرۆزگرتن و پاراستن و بەرگری کردن لە ڕێز و بەختەوەری مرۆڤ. شایەنی باسە، ئێمە کاتێك سەرزەنشت و هۆشداری دەدەین لەبارەی ئەوانەی ڕێز لە پیرۆزی مرۆڤ ناگرن، ئێمە

ڕادەگەیـەنین ئێمـە ڕێزیـان لێـدەگرین وەك خـەڵکانێك و پارێزگـاری دەکـەین لـە پیرۆزیەکەیان وەك مرۆڤ، نەك وەك پیاوی ئاینی یان سیاسەتمەدار یان جگە لەمـە لە سیفەتەکان. ئەوان پیرۆزن، چونکە مرۆڤن. سەبارەت بە سەرزەنشت کردنیان و هۆشـداریدان لەبارەیانـەوە، ئـەوا بـە دیـدی ئێمـە دەرژێتـە دەروازەی بەرەنگاربوونـەوەی خراپـە بەشێوەیەکی ئاشـتیانەی ئـەرێنی نـا توونـد و تیژانـە، خۆشەویستی ڕاستەقینە بەرەنگاری خراپە و ئاشوب دەبێتەوە، چونکە بایـەخ بـە چارەنووسی ئەو خەڵکانە دەدات کە دەکەونە ژێر کاریگەری ئەم خراپەیە.

# ئاينى ( سەلامەت موسا )

## نووسەران و ئايين :

لەوانەيە خوێندنەوەى دانراوەكانى هەر كەسێك، باشترين ئامراز بێ بۆ زانينى ئاينەكەى. دانراوەكانى زۆرێك لە نووسەران، ئايين و بيروباوەڕى ئەوانمان بۆ ڕوون دەكەنەوە، كە زۆر جاران سەرچاوەكەى بريتى دەبێ لە ڕامان و بيركردنەوە و توێژينەوە و بەدواداچوون، نەوەك لاساييكردنەوە و شوێنكەوتن، هەروەك لەلاى زۆرێكيان واباوە. لەوانەيە شارەزابوون لە دانراوەكانى تۆڵستۆى و دوستويفسكى و تاها حسێن و عەبباس مەحمود عەققاد و ئيحسان عەبدلقدوس و جبران خەليل جبران و نەجيب مەحفوز و زۆرێك جگە لەوان ڕاستى ئەوە دەربخەن كە ئێمە دەيڵێين. لە نێو ئەمانەدا نووسەرى مەزنى ميسرى (سەلامەت موسا) هەڵدەبژێرين. تا لايەنێك لە بيروباوەڕ و ئاينەكەى بخەينەڕوو.

## ئاينى ژيرمەندان :

سەلامەت موسا (١٨٨٩ ١٩٦٣) يەكێكە لەوانەى ئاينى مرۆڤايەتى هەڵبژاردووە، ئەو ئاينەى مرۆڤ هەوڵ و تەقەلا دەدات تا پێى بگات، ئەمە ئاينى باوان نييە، ئاينى لە قوتوكراو نييە، تا مرۆڤ بێ ئامادەكردن بيخوات. ژەمێكى خێرا نييە چێشتخانەكانى (ئەليتك ئاواى) پێشكەشى بكەن. ئاينى مرۆڤايەتى واتە ئاينى لێكۆڵينەوە و بەدواداگەڕان، ئاينێك بنچينەكەى لێبوردەيى و ڕێزگرتن بێ لە ڕاى بەرامبەر. ئاينێك بێ بەشكردن و هەڕەشە و پەنهانكوژى ناناسێ. ئاينێك ڕێز لە هەمووان دەگرێ و لەوانەيە هەمووان ڕێزى لێنەگرن، هەر بۆيە خاوەنى ئەم

ئاینـە بەهۆیـەوە سـەختی دەکێشـێ، بەهۆیـەوە دووچـاری پەیوەنـدی پچـڕان و سەرکۆنە و هەندێك جار تانە و هەڕەشە و لەوانەیە کوشتن ببێتەوە. ئەو ئاینـەی سەلامەت موسا باوەڕی پێهێنابوو، لەسەر فەلسـەفە و گومـان و ڕۆشـنبیر و زانسـت دامەزراوە، لەسەر لاسایی کردنەوە و ملکەچی و نەزانی و ئەفسانە بنیات نەنراوە.

گەیشتۆتە تەمەنی حەفتا ساڵی، سەلامەت موسا لەبارەی ژیاننامەی خۆی کە ناوی نـاوە (پـەروەردەی سـەلامەت موسـا) ئـەم وشـانەی نووسـیوە: (مـن بـڕوام بـە مەسـیحییەت و ئیسـلام و یەهودیـەت هەیـە. عیسـام خۆشـدەوێ، سەرسـامم بـە محەمەد، خۆم ڕۆشن دەکەمەوە بە موسا. ورد دەبمەوە لە پۆلس، دڵم بـۆ لای بـوزا دەچێ. وا هەست دەکەم ئەمانە هەموویان خزمی نزیکی منن لە ڕۆحدا، لەگەڵیان دەژیـم لەسـەر لێکتێگەیشـتن، پیـاوەتی و ڕاسـتی و میهرەبـانی و شـەڕەفیان لێوەردەگرم). هەروەها زیاتر دەڵێت: (سەرباری ئەوانە باوەڕدارم بە خۆشەویستی سروشت، شکۆداری گەردوون... بـاوەڕم بـە تۆڵستۆی و غانـدی و ڤۆلتێر و بیکۆن هەیە). سەلامەت موسا باوەڕی خۆی پوخت دەکاتەوە و دەڵێت: (ناوەنـدی بـاوەڕی من مرۆڤایەتییە، بە لەخۆگرتنی فەیلەسوفان و پێغەمبەران و ئەدیبەکان، بوێری و زیرەکی و پیاوەتی و میهرەبانی و جوانی و شەڕەف).

## ئایین دوودڵییەکی بەردەوامە :

ئـەوەی بـاوەڕی بـە ئـاینی مرۆڤایـەتی بێ، چەقبەسـتوویی و کپـی ناناسێ. بەڵکو بەردەوام گومانی هەیە، زۆر پرسیار دەکات. بە ئاسانی ئەوە قبوڵ ناکات کە ئەوانی تر دەیڵێن. هەر بۆیە سەلامەت موسا دەڵێت: (ناکرێ باوەڕی من سادە بێ، هەمووی دڵنیایی و خۆبەدەستەوەدان بێ، من لـەم دۆخـە دوورم، خەفـەتی لەسـەر

هەڵناكێشم. چونكە ئەگەر دڵنیایی حەسێنەرەوەتر بێ، ئەوا گومان پایەدارترە...).
ئایین لە دیدی سەلامەت موسادا بۆچوونێكی تایبەت و دوودڵیەكی بەردەوامە، ڕۆشنبیری سەرچاوەكەیەتی، ئامانجەكەی لەخۆگرتن و تێگەیشتنە لە جوڵەی گەردوون و بوون، دەڵێت: (باوەڕم وایە ناكرێ مرۆڤ كەسایەتیەكی ئاینی بەرزی بۆ بەرجەستە ببێ، ئەگەر ڕۆشنبیر نەبێ، بە تەواوی ڕانەمابێ و تێنەگەیشتبێ لە گەردوون، دڵ و عەقڵی ڕێكخستبێ، بەشێوەیەك كە بگونجێ لە جوڵەی ژیانی گەردوونیدا و هیوای مرۆڤایەتیدا، لە گشت ئەم شتانەدا گەیشتبێتە ڕای تایبەتی خۆی یان دوودڵی تایبەتی خۆی. ئایین ڕای تایبەتە، ناكرێ گشتی بێ. دەبێ بە دوودڵی بەردەوام بمێنێتەوە).

لەبەر ئەوەی نابێ باوەڕ سادە بێ، دەبێ لەسەر بنەمای گومان بنیات بنرێ، هەر بۆیە زۆر پێویستی بە زانستەكانە، ئەمە بەدی دەكەین لە نزیكەی گشت كتێبەكانی سەلامەت موسادا، لەبارەی ڕۆڵی زانست لە داڕشتنی ئاینەكەیدا وتویەتی: (لە تەمەنی خۆمدا وا دەبینم سەرچاوەی ئاینەكەم یان چاكتر بڵێم ویژدانی ئاینیم، لە پاڵ بوزیەت و ئیسلام و مەسیحییەت و یەهودیەت و هندۆسیەت، لە زۆربەی ئەو ڕوناكیەی ڕێی خۆمی پێ ڕووناك دەكەمەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سایكۆلۆژیەت و بایلۆژیەت و ئەنسرۆپۆلۆژیەت و مێژوو. ئەم زانستانە ئاماژەیان داوە بە ناوەڕۆكی مەرگەساتی مرۆڤایەتی، مەرگەساتی ڕابردوو و ئێستا و ئومێدمان لە ئایندەدا. لەبەر ئەمە ئاینی من بابەتی و لۆژیكییە، نەوەك تەنها خودی و بیروباوەڕی بێ).

**ئاگاداریەك :**

كەسێك ئەمە باوەڕی بێ شایستەی ئەوەیە دووچاری ڕەخنە و كافر كردن و دژایەتی و تۆمەتبار كردن بێ بە ناپاكی و سیخوڕی كـردن و پیلانگێـڕی؟ دەكـرێ دووچاری فەرامۆشكران ببێتەوە لەلایەن ڕاگەیاندنەوە، چ فـەرمی یـان نـا فـەرمی، ئەمە ناگونجێ لەگـەڵ ئـەو كۆششـە مەزنانـەی خـەرجی كـردووە لـە دروستكردنی نەوەیەكی ڕۆشنبیری داهێنەر. دەڵێت: بەدرێـژایی ژیـانم هـیچ خـەڵاتێك بەدەست نەهێناوە، لەلایەن هیچ لایەنێكی فەرمی یان حكومیەوە. بەپێی زانیاریمان لە دوای مردنیشی هیچ خەڵاتێكی پێنەدراوە!! تاها حسێن لـەبارەی سـەلامەت موسـا دەڵـێ: زۆر چـاك دەیزانـی ئـەو تاڵایەتییـە بشـارێتەوە كـە هەسـتی پێـدەكرد (لـە پـاڵ خۆشەویسـتییە زۆردكـەی بـۆ مـرۆڤ، عەشـقە سـۆفیانیەكەی بـۆ میسـر، بـاوەڕە ڕۆمانتیكیەكەی بە نایندە). بەڵێ، خۆشەویستی و عیشق و باوەڕ ئەو خەسڵەتانەن ئـاینی سـەلامەت موسـا پێـی جیـا دەبنـەوە، ئەمانـە ئـەو خەسـڵەتانەن كـە وایـان لێكردووە مرۆڤێكی ڕاستەقینە بێ، هەڵگری خێر و خۆشەویستی و ئاشتی بـێ بـۆ هەمووان.

# بەناوی خواوە دەكوژن

## هیچ پاساوێك بۆ كوشتن نییە :

لەوەتەی بوونەوەر هێنراوەتە بوون، مرۆڤ مرۆڤـی بـرای خـۆی دەكـوژێ لـە ژێر پاساو و ناوی جیاوازەوە. قێزەونترینـی ئـەم پاساوانە ئەوەیـە كـە نـاوی خـوا هەڵدەگرێ. ئەوانەی كوشتار ئەنجام دەدەن لە ژێر پاساوی جەنگی پیرۆز، یان خـوا پێی وتوم، ئەوانە تاوانبارن درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن. خـوای مـەزن نایـەوێ ئێمـە یەكتر بكوژین لە ژێر هیچ پاساو و بیانویەك. نایەوێ ناوی ئەو بـەكار بهێـنین لـە جەنگ و تاوانەكانماندا، هیچ بیانو و پاساوێك بۆ كوشتن بوونی نییـە، چونكە لـە جیهانی بوونەوەردا مرۆڤ خاوەنی بەرزترین بەهایە، چۆن ئـەوەی نرخـی كـەمترە بیكەینە پاساوێك بۆ ئەوەی خاوەنی بەرزترین نرخە؟

## عەقڵە پاساو هێنەرەوەكان :

بكـوژان خـاوەنی عـەقڵی پاسـاو هێنـەرەوەی زۆر زیـرەكن، لـە شـێواندن و ساختەكردندا. ئـەوان عـەقڵ دەكەنـە گاڵتـەجار. هـەزاران كـەس و هەنـدێك جـار ملیۆنان دەكوژن، بە پاساوی هێنـانی خێـر بـۆ مرۆڤایـەتی. تـەنها عـەقڵ دەتـوانێ پاسـاو بـۆ كوشـتن بێنێتـەوە، بـەڵام ڕەوشـت ناتوانێـت. هـەر لەبـەر ئەمـە و بـەبێ زیادەڕەوی یان هەڵبەستن دەكرێ بـوترێ ئەوانـەی كوشـتار ئـەنجام دەدەن، دەكـرێ خاوەن عەقڵ بن، بەڵام هەرگیز ڕەوشتیان نییە. ئەو عەقڵە پاسـاو هێنەرەوەیـەی بكوژەكان هەیانە، كەسانی بە ڕەوشـت ئـەم عەقڵەیان نییـە. بـە دەربڕینێكـی تـر،

عەقڵی پاساو هێنەر لەگەڵ ڕەوشت کۆ نابێتەوە. ئەوەی بانگەشە دەکات ئەو مرۆڤە، پێویستە هیچ کەسێك نەکوژێت، سەبارەت بەوانەی وەسف دەکرێن بەوەی کەسانی مەزنن، کتێبیان لەبارەوە دادەنرێ، پەیکەریان بۆ دروست دەکرێت، ژمارەی ئەوانەی بەدەست یان بە فەرمانی ئەوان کوژراون لە ژمارەی ڕۆژی ژیانیان زیاترە، ئەوانە تەنها کەسانی تاوانکارن و هیچی تر نییە.

## مەترسیدارترین بکوژ:

سەرکردە و سەرۆکەکان مەترسیدارترین بکوژانی مێژوون، چونکە توانای هێنانەوەی پاساویان هەیە بۆ کوشتنەکە، هەروەها لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆر زۆرە، هەروەك دەکرێ هەر یەکێکیان ببێتە بکوژێك لە جۆری یەکەم ئەگەر بیەوێ، سەرباری ئەمە هیچ یەکێك پێی ناڵێت ئەو تاوانکارە. لە بری ئەوەی ئەم سەرکردە و سەرۆکانە ڕووبەڕووی بەرهەنگاریەك ببنەوە، کە هەژاران و لاوازەکان بپارێزێ لە تووند و تیژی و تاوانەکانیان، کەچی پەیکەریان بۆ دروست دەکرێ و ماستاوچییەکان چەپڵەی بۆ لێدەدەن.

تاکەکان یان کۆمەڵە نا حکومییەکان مافی خوایی بە خۆیان نادەن بۆ کوشتنی ئەوانی تر، بەڵکو چەند دەوڵەتێك هەن ئەمە دەکەن. دەوڵەتە مەزنەکان مافی ڕێنوێنی کردنی دەوڵەتانی بچوك بەرەو ڕێگەی ڕاست لە خۆیاندا دەبینن، چەندین ئیمپراتۆریەت بە درێژایی مێژووی جیهانی مرۆیی بانگەشەی ئەم مافەیان کردووە، دەوڵەتانی مەزن ئەمڕۆ ئەمە دەکەن، خۆیان بە خاوەن ماف دەزانن لە ئەنجامدانی گشت شتێك، داگیرکردنی وڵاتان، قڕ کردنی گەلان، چاوەڕێی ئەوە ناکا تا مەترسی پێی بگات و لەخۆی دوور بخاتەوە، چاوەڕێی ڕازیبوونی هیچ

ڕەوایيەكی نێودەوڵەتیش ناكات. یـەكێك لـە ساسـەتمەداران نووسـیویەتی : لەسـەر دەوڵەتانی مەزن پێویسته (چاوەڕێ نەكات تا مەترسی كۆ دەبێتـەوە و لێـی نزیـك دەبێتەوە، بەڵكو دەبێ جەنگ بباتەسەر خاكی دوژمن، چەند گورزێكی پێشوەختە بوەشێنێت، بۆ لەناوبردنی هەر مەترسیەكی پێشبینی كـراو بـەر لـە دەركـەوتنی). هەروەها زیاتر دەڵێـت: لەسـەرە پێویسـتە (چـاوەڕێی ڕەزامەنـدی وڵاتـانی تـر یـان ڕێكخـراوە نێودەوڵەتییـەكان نـەبێ، كاتێـك لـە بەرەنگاربوونـەوەی دوژمنانـدا دەجوڵێتەوە، دەبێ ئازادی هەڵسوكەوت كردنی هەبێ بەشێوەی تاكەكەسی).

## غاندی و تۆڵستۆی و ساتیاغراها :

مانای پیتاوپیتی (ساتیاغراها) بریتییە لە: (تێكۆشان و خەباتی ئاشتیانە لە پێناو ڕاستیدا). غاندی پێناسەی دەكات بەوەی (هێزی ڕاستییە). جیاوازی نییە لە بانگەوازەكەی تۆڵستۆی كە نـاوی نـابوو (هێـزی ڕۆح) یـان (هێـزی خۆشەویسـتی). ساتیاغراها بە مانای ئەوەی بەرگریەكی نەرێنیە وەرگێڕدراوە، ئەمە وەرگێرانێكی نادروستە، چونكە ساتیاغراها زۆر دوورە لە نەرێنی بـوون، بەرەنگاربوونەوەیـەكی ئاشـتیانەی خراپەیـە، پڕاوپـڕە لـە ئـەرێنی بـوون. بەهـەمان شـێوە گوزارشـت لـە سـاتیاغراها دەكـرێ بـە نـا توونـدوتیـژی، بەوپێیـەی بەرەنگاربوونـەوەی ئاشـتی بریتییە لە بەرەنگاربوونەوەی نا توندوتیژانە.

غاندی توانی ساتیاغراها بكاتە ئاینێكی جیهانی، زۆر خەڵك باوەڕیان پێهێنا لە هیند، بەمەش توانیان وڵاتیان ڕزگار بكەن لە داگیركاری دەوڵەتێك، كە ناوی لە خۆ نابوو (دەوڵەتی مەزن) ئـەویش ئینگەلتەرایـە. غانـدی لـە كتێبەكەیـدا (ئەمـە ڕێبازەكەمـە) دەڵێـت: (نـا توونـدوتیـژی ڕێبـاز و ئـاینی منـە، ئـەم ئاینـە هێزێكـی

كارايە، هيچ شوێنێكى تێدا نييە بۆ ترسنۆكى و لاوازى). غاندى باوەڕ بوون بە خوا و بە خۆشەويستى وەك هەنگاوى يەكەم بە مەرج دادەنێ بۆ باوەڕبوون بە ساتياغراها، دەڵێت: (نا توندوتيژى بريتييە لە ياساى ڕەگەزى مرۆيى، لە بوارى كۆتاييدا لەبەر دەستى ئەوانە نابێ كە باوەڕيان بە خوا يان بە خۆشەويستى نييە). غاندى پێى وايە: (نا توندوتيژى ئامرازە، ڕاستى ئامانجە).

لەبەر ئەوەى تۆڵستۆى و غاندى لە ڕووبارى نا توندوتيژى و خۆشەويستى و لێبوردەييدا خۆيان دەشۆن، ئەوا شتێكى سروشتى بووە چەندين نامە گۆڕينەوە لە نێوانياندا هەبێ، ئەمە جێگرەوەى چاوپێكەوتنى ڕاستەوخۆى ئەوان بووە. نامەكانيان بۆ يەكترى بيروباوەڕى ئەوانى لەخۆگرتووە لەبارەى نا توندوتيژيەوە. ئەوەى ئاگادارى نامەكانيان بێ، قوتابخانەيەكى تەواو تياياندا بەدى دەكات، سەبارەت بە بنەماى نا توندوتيژى، كە هيوامان وايە ئەوانە لەسەرى پەروەردە بن كە بانگەشەى بەرزى و باڵادەستى و ماف و جياوك و قۆرخ كردنى حەقيقەت بۆ خۆيان دەكەن.

تۆڵستۆى و غاندى بە يەكەوە لە سەرچاوەى خۆشەويستى و ناتوندوتيژيەوە دەردەچن. سەبارەت بە تاوانكارە بيروباوەڕگەراكان، ئەوان لە تاريكى قۆرخ كردنى حەقيقەتەوە هەنگاو دەنێن، لەوەى باوەڕى ساختەيان وايە ئەوان پەيامبەرى ڕاستين و بەرپرسن لە ڕزگاركردنى مرۆڤايەتى لە گومڕايى، لەبيريان چۆتەوە كە ئەوان خودى گومڕايى و تاريكين، چونكە بۆ خۆيان بە ڕەوا دەزانن ئەوانى تر بكوژن، بە بەكارهێنانى ناوى خوا لە تاوانەكانياندا.

## دادگەریم پێبدە:

باشترین شت كە بابەتەكەمانی پێ تەواو بكەین لەبارەی ئـایین و جـەنگ و توونـدوتیـژی، بریتییـە لـە شـیعری (دادگـەریم پێبـدە)، كـە هـی شـاعیری عێراقـی ئەحمەد مەتەڕە، تیایدا هاتووە:

بەدرێژایی سەردەمەكان

ستەم

سەرم دەبڕێت بەناوی خوای میهرەبان وەك قوربانی بۆ بتەكان!

ئەمە بە تەورات سەردەبڕێ

ئەوەی تر بە ئینجیل سەر دەپەڕێنێ

فلآن بە قورئان سەر پەلدەدات!

گوناه لە ملی گشت ئاینەكان نییە.

گوناهەكە هی سروشتی مرۆڤە

هی تۆیە ئەی مرۆڤ.

# تاوانەکانی بیروباوەڕی ئاینی

## دوستویفسکی و تاوان :

لـە دوستویفسـکی باشـتر نـابێ لـە وێنـاکردنی پاڵنـەرەکانی کوشـتن لـە ڕۆمانەکەیدا (تاوان و سزا). لەم ڕۆمانەدا لەبارەی مـرۆڤ دەخوێنینـەوە، کـە چـۆن کوشتن بۆ خۆی بە ڕەوا دەزانێ، بـە پشـت بەسـتن بـە عـەقڵ و لۆژیـك. پاڵەوان و تاوانباری ڕۆمانەکە (راسـکولنیکوف) ئـەو گەنجەیـە، کـە خوێنـدنی زانکـۆیی خـۆی فەرامۆشکرد، بـەهۆی هەژاریـەوە. وتارێـك دەنووسـێ بـە ناونیشانی (تـاوان) و لـە یەکێك لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوی دەکاتەوە. لەم وتارەیدا پێـی وابـوو خـەڵکانێك هـەن مافیان هەیە تاوان ئەنجام بدەن و کەسانی تر بکوژن، چونکە بوونەوەری نا ئاسایی یان باڵادەستن. خەڵك بـۆ دوو جـۆر دابـەش دەکـات: خـەڵکی ئاسـایی و نـا ئاسـایی، لەسەر کەسـانی ئاسـایی پێویسـت کـردووە بـە ملکەچـی و گوێڕایـەڵی بـژین، بـەبێ ئـەوەی هـیچ مافێکیـان هـەبێ لـە شـکاندن و بەزانـدنی یاسـادا، بـەڵام خـەڵکانی نـا ئاسایی، مـاف کەسـی یـان نـا فـەرمیان هەیـە لـە ئەنجامـدانی تـاوان و پێشـێلکردنی یاسادا. مەبەست لە ماف کەسی ئەوەیە تاوان ئەنجام بدات، لەگەڵ ئەمەشدا دروونی ئاسودە بێ، چونکە هەست دەکات مافی ئەوەی هەیە هەندێك کۆسپ ببڕێ، کە دەبێ ببڕدرێن، بۆ جێبەجێکردنی ئـەو هـزرەی ڕزگـارکردنی گشـت ڕەگـەزی مرۆڤایـەتی پێـوە بەنـدە. ڕاسـکولنیکوف نموونەیـەکی بۆمـان هێناوەتـەوە لەسـەر ئەمـە و وتویەتی:

(من پێم وایە دۆزینەوەکەی کیبلـر و نیـوتن وەك نموونـە، ئەگـەر بـە هـەر هۆیەك بێ وای بۆ دیاریکرابێ کە ئەنجام نـەدرێ تـەنها بـە بوونـە قوربـانی ژیـانی پیاوێك یان دە پیاو یاخود زیاتر لە سەد پیاو نەبێ، ئەوانەی دەیانەوێ ببنە ڕێگر

لەبەردەم دەرکەوتنی یان سەرهەڵدانی، ئەوا ئەو کاتە نیوتن ماف هەیە، بەڵکو لەسەری پێویستە ئەم دە یان سەد پیاوە ڕابماڵێت، تا دۆزینەوەکانی بگەیەنێتە مرۆڤایەتی).

ئەم بیرۆکەیەی بە خەیاڵی (راسکولنیکوف)دا هاتووە، لەبارەی مرۆڤی نا ئاسایی، ئەمە وای لەو کردووە کەسێکی بکوژ بێ، ئەمە هەمان ئەو هزرەیە کە وایکردووە ژمارەیەك لە سەرکردە و سەرۆك ببنە تاوانکار و بکوژ، ئەوان پێیان وایە خۆیان کەسانی ئاسی نین و بەرزترن، دەیانەوێ سوود پێشکەشی مرۆڤایەتی بکەن، ئەگەر هەر کۆسپێك لەسەر ڕێگەیان وەستا، ئەوا پێویستە لاببرێ. نموونە لەسەر ئەم کەسانە زۆر زۆرە، ئەوان لە کتێبەکانی مێژوودا، لە کۆشکی سەرکردەکان، لەسەر کورسی فەرمانگە حکومییەکان و لە شەقامەکان و لەسەر کەناری ڕێگاکاندا هەن.

## تاوانکاری بیروباوەڕگەرا :

پارێزەر شاکر عانی لە کتێبەکەیدا (تاوان) پێناسەی تاوانکاری بیروباوەڕگەرا دەکات بەوەی: (ئەو کەسانەن، تاوان ئەنجام دەدەن وەك ئەرکێك، کە بیروباوەڕەکەیان دەیسەپێنێ، دەبێ جێبەجێ بکرێ، کاریگەرن بەوەی ناخ و بیروباوەڕیان دەیسەپێنێ بەسەریاندا، بێ وابەستەبوون بە بڕیارەکانی یاسای تاوانەکان، لە ناخیان ئەرکی بیروباوەڕ بەرزترە لە ئەرکی ڕێزگرتن لە یاسا).

بیرۆکەی ڕاست لە ئەنجامدانی تاوان، بۆ کەسانی باڵادەست یان نا ئاساییەکان، بەشێوەیەکی ڕوون لە نووسین و وتارەکانیاندا دەردەکەوێ، ئەوانەی کە بە تیرۆریستەکان وەسف دەکرێن، باشترە ناویان بنێم تاوانکارە بیروباوەڕگەراکان. ئەوان تاوانی بیروباوەڕی ئەنجام دەدەن، چونکە پێیان وایە

کەسانی بەرزترن، مافیانە یان ئەرکیانە خەڵکی ڕێنوێنی بکەن بۆ ئەو ڕاستیەی لایانە، خەڵکی ئاسایی لایان نییە. هۆکاری بەرزتربوونیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی حەقیقەتیان قۆرخ کردووە. ئەمە بیروباوەڕیانە، هۆکاری ئەوەیە بوونەتە تاوانکار.

## توندوتیژی کۆمەڵە ئیسلامییەکان :

هەندێك لە کۆمەڵەی ئیسلامی پێیان وایە ئەوان پێکهاتوون لە کەسانی نائاسایی، بەمەش مافیان هەیە لە بەکارهێنانی هێز دژی گشت ئەوانەی دەبنە ڕێگر لە نێوان ئەوان و خەڵکدا. گوایە نوێنەرایەتی پەیڕەو و بەرنامەی خوایی ڕاست و دروست دەکەن، کە ئەرك و مافیەتی هەموو ئەو شتانە ڕیماڵێت کە سەریان بە جگە لەم بەرنامەوەیە. پێشی وایە خوای مەزن مافی جوڵە و هەنگاونان بۆ وەرگرتنی دەسەڵات و بەرپاکردنی ڕژێمی داوەتە کۆمەڵەی ئیسلامی، کە بەرنامەی خوا خۆی تێدا دەبینێتەوە.

هەندێك لەم کۆمەڵانە پێیان وایە گشت کۆمەڵگەکان نەفامین، هاوشێوەی نەفامی پێش ئیسلام، هەموو ئەوەی لە دەوروبەریەتی نەفامییە.. لە تێڕوانین و بیروباوەڕ و داب و نەریت و سەرچاوەی ڕۆشنبیری و هونەر و هەڵسوکەوت و بەرنامە و یاساکانی خەڵك. تەنانەت زۆرێك لەوەی ئێمە بە ڕۆشنبیر و سەرچاوە و فەلسەفە و بیرکردنەوەیەکی ئیسلامی دایدەنێین.. بەهەمان شێوە دەستکردی نەفامیەتە. هەندێك لەم کۆمەڵانە بەهەمان شێوە پێیان وایە کۆمەڵگەی موسڵمان تەواو نابێ، تەنها بە کۆبوونەوەیەکی ئەندامی بزافی نەبێ جیا لە کۆبوونەوەی نەفامی، لەسەر ئەم کۆمەڵە و گردبوونەوەیە پێویستە تەنها گفتوگۆ بە بەس نەزانێ، بەڵکو لەسەریەتی ئامرازی تریش بەکاربهێنێ بۆ ڕاگەیاندنی

بیروباوەڕەکەی، بەڵکو لەسەری پێویستە بجوڵێت و هەڵمەت بەرێ بۆ ڕزگارکردنی گشت خەڵك، ئەگەر کۆمەڵە و گردبوونەوەکانی تر ڕێگریان لێکرد لە ڕێکخستنی ژیانی ژێردەست و هاوڵاتیانی بەپێی بەرنامەکەی، ئەوا لەسەر کۆمەڵە ئیسلامییەکان پێویست دەبێ ئەم ڕژێمانە رابماڵن، بەوپێیەی کۆسپن بۆ ڕزگارکردنی گشتی، ئەمەش بەسادەیی لەبەر ئەوەی خوا ماف جوڵە و هەنگاوانانی پێدەبەخشێ، بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات و بەرپاکردنی ڕژێم.

لەوەی پێشتر ڕوون دەبێتەوە، هەندێك لە کۆمەڵە ئیسلامییەکان، بۆ خۆیان بە ڕەوا دەزانن توندوتیژی بەکاربهێنن لەژێر ناونیشانی ماف خوایی، کە لە توانای هەر کەسێکدایە بداتە پاڵ خۆی. باوەڕیان وایە حەقیقەتیان قۆرخ کردووە، هەر بۆیە ئەوان خەڵکی نا ئاسایی و بەرزترن، ماف ئەوەیان هەیە یاسا پێشێل بکەن بۆ بەرپاکردنی ئامانجە باڵاکانیان، ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە گومڕایی. ئەوان جیاواز نین لە راسکولنیکوف لە ڕۆمانی (تاوان و سزا)، هەر دووکیان بانگەشەی ماف کەسی دەکەن بۆ خۆیان لە ئەنجامدانی تاواندا. لەوانەیە تاکە جیاوازی لە نێوانیاندا ئەوەبێ راسکولنیکوف هەست بە پەشیمانی و سەرزەنشی دەروون کردبێ لە دوای ئەنجامدانی تاوانەکە، بەڵام ئەوانە تا ئێستا هەستیان بە پەشیمانی نەکردووە، سەرباری تاوانە زۆر و دووبارە بووەوەکان.

## ئاینی نا توندوتیژی :

ناکرێ ئەم جیهانە ئارامی و دڵنیایی بناسێ، تا مرۆڤ باوەڕ نەهێنێ بە ئاینی نا توندوتیژی، واز نەهێنی لە بیروباوەڕ ساختەکەی سەبارەت بە قۆرخ کردنی حەقیقەت، خۆی بگرێتەوە لە بینی ڕۆڵیی ڕزگارکەر لە گومڕایی. تەنها بەم سێ چەمکە دەکرێ مرۆڤ مرۆڤێکی ڕاستەقینەبێ، نەوەك تەنها مرۆڤێکی بایلۆژی.

سەبارەت بەوەی ئێمە ئەمڕۆ دەیبینین لە توندوتیـژی و جـەنگ و كوشـتن، ئـەوا سەرچاوەكەی لەوانەوەیە كە بانگەشەی قۆرخ كردنـی حەقیقـەت دەكـەن، خـەیاڵی ئەوەیان كردووە ئەوان ڕزگاركەرن لە گومڕایی، لە ڕاستیدا ئەوان تـەنها تاوانكاری بیروباوەڕگەران، لە هیچ شتێكدا جیاوازیان نییە لەگەڵ راسكولنیكوف.

# تۆڵستۆی و مەسیحییەت

## مەسیحییەکان و جەنگ :

تەنها موسڵمانان نین پێیان وایە ئەوان بەرزتر و کەسی نا ئاساین. تەنها ئەوان نین بانگەشەی ئەوە دەکەن خوا مافی کوشتنی بەوان داوە. مەسیحییەکانیش بەهەمان شێوە ئەمە دەکەن، ژمارەی قوربانیەکانیان زۆر زیاترە. سەرباری ئەوەی ئینجیل دەڵێت (مەکوژە)، کەچی ئەوان چەند هەڵاواردنێك بۆ خۆیان دادەنێن، بە ڕەوای دەزانن جەنگ بکەن، سزای تاوانکاران بدەن بە کوشتن. لەوانەیە ئەو عەقڵە پاساودەرەی مەسیحییەکان هەیانە، یان ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەوان مەسیحین، زۆر بەهێزتر بێ لەو عەقڵ پاساو هێنەرەوەیەی موسڵمانان هەیانە. هەر بۆیە موسڵمانان بە تیرۆر مەسیحییەکان بە ئامادەسازی وەسف دەکرێن.

لە میانەی ئەو بیست سەدەیەدا، کە لە دوای عیسای مەسیحەوە هاتوون، کەسایەتی و کۆمەڵانێك دەرکەوتن، دژی توندوتیژی وەستانەوە و بانگەوازیان کرد بۆ دەستگرتن بە ڕێنوێنیەکانی خۆشەویستی و ئاشتی. بەڵام هاوشانی پشتیوانانی توندوتیژی لە حوکمڕان و ئامۆژگاریکاری درۆزن، وایکرد دەنگی توندوتیژی بەرزتر بێ لە دەنگی نا توندوتیژی. جەنگەکان هەڵگیرسان و خوێن ڕژا. ئەوەی خەفەت بۆ دڵ زیاتر دەکات ئەوەیە ئەم جەنگانە بە ناوی عیسای مەسیح، لە ژێر دروشمی جەنگە پیرۆزەکاندا ئەنجام دەدران. زۆر کەسایەتی و کۆمەڵە دەرکەوتن و بەرەنگاری ڕەوتی توندوتیژی بەلێشاو بوونەوە، لە نێویادا ناودارترینیانمان هەڵبژاردووە، ئەویش نووسەری ڕوسی لیۆ تۆڵستۆیە.

## بیروباوەڕی تۆڵستۆی :

پێش نزیكەی زیاتر لـە سـەدەیەك تۆڵسـتۆی بـەرەنگاری ئـەو توونـدوتیژیـە بووەوە، كە هەندێك لە مەسیحییەكان پەیڕەویان كرد. پێی وایـە توونـدوتیـژی لـە مەسیحییەتدا نییە، ئەو جەنگانەی ناوی عیسای مەسیحیان تێدا بـەكاردەهێنرێن، جەنگی ستەمكارین و عیسای مەسیح لێـی ڕازی نـابێ، توونـدوتیـژی ڕەوا نییـە لـە ژێر هەر بارودۆخێكدا بێ، دەڵێت: (من پێم وایە بیروباوەڕی كڵێسا، كە نەریت وایە ناوی مەسیحیەتی لێ دەنێن، هەڵەیە و گوزارشت لە بیروباوەڕم ناكات).

تۆڵستۆی بیروباوەڕی خۆی سەبارەت بە نا توندوتیژی لە ژمارەیەك كتێب و ڕۆمانی خۆیدا شرۆڤە كردووە، لەوانە كتێبێك بە ناویشانی (بیروباوەڕم چییە؟) لە ساڵی ١٨٨٤ نووسیویەتی، تیایدا هێرشی كردۆتە سەر بـەكارهێنانی توونـدوتیـژی لەلایەن حكومەتەكانەوە، كە كڵێسا و پیاوەكانی پاڵپشتی لێ دەكەن. داوای كردووە دەستبگیرێ بە ڕێنماییەكانی عیسای مەسیح، كـە ڕوون و ڕاشـكاون، پەیوەسـتن بـە بەرەنگاری كردنی ناتووندوتیژنەی خراپە و ئاشوب، بە توونـدی هێرشـی كردۆتـە سەر پیاوانی ئاینی، لە سـەرنجەكەیدا لەسـەر ئـەم كتێبـەدا نووسـیویەتی: (مـن لـە كتێبەكەمـدا "بیروبـاوەڕم چـییە؟" مامۆسـتایانی ئـاینی تۆمـەتبار دەكـەم بـەوەی بنـەمای دژی بنـەماكانی عیسـای مەسـیح فێـری شـوێنكەوتووانیان دەكـەن... ئـەم ئامۆژگاریكارانە هەموو ماناكان لە ڕێنماییەكانی عیسای مەسیح لا دەدەن).

لە دوای چەند ساڵێك دووبارە ئەم بیرۆكانەی بڵاوكردەوە و جەختی لەسـەر كردەوە، لە كتێبێكی بچوكدا بـە ناونیشـانی (دەسـەڵات و گـەورەیی ئاسمانـەكان لـە ناختاندایـە). لـەم كتێبـەدا تۆڵسـتۆی باسـی چـوار خـاڵی سـەرەكی كـردووە، كـە ئەمانەن:

**<u>یەکەم</u>، ڕۆڵی خراپی پیاوانی کڵێسا لە پاڵپشتی کردنی توندوتیژی و یارمەتیدانی، لـەم بـارەوە دەڵێـت: (لـە نێـو فـرە سەرپێچـیەکانی پیـاوانی کڵێسـا، بەرامبـەر ڕێنماییەکانی عیسای مەسیح، لە خوارەوەدا سەرپێچی سـەرەکی ڕوون دەکەمـەوە، کە بریتییـە لـە: داننـەنان بـە ڕێنماییـەکانی بەرەنگاربوونـەوەی خراپـە و ئاشوب بـەبێ توندوتیـژی، ئەمـە گـەورەترین سەرپێچییە، گـەواهی لەسـەر ئـەوە دەدات کڵێسا ڕێنماییەکانی مەسیحی شێواندووە).**

**<u>دووەم</u>: ڕەتکردنـەوەی ئـەو دەوڵەتانـەی لـە سـەردەمی ئـەودا هـەبوون، ڕێبـازی سیاسـەتی توندوتیـژیان پـەیرەو دەکـرد، نووسـیویەتی: (کاتێـك سـەرۆکی وڵاتـان مەسیحیەتی تەنها بەناو و دەرەکی دروست دەکەن، ئەوا چەند تیۆرێك دادەهێـنن، نـاکرێ باوەڕیـان پـێ بکـرێ، لێهاتوون بەشـێوەیەك بەهۆیـەوە ئـاینی مەسـیحیەت لەگەڵ دەوڵەت دەگونجێت. بەڵام هەر مرۆڤێك لەم سەردەمەماندا نەگونجانی تەواو بـەدی دەکـات، تـەنها لـە نێـوان مەسـیحیەتی دروسـت، قوتابخانـەی خـاکیبوون و لێخۆشبوون لە سەرشۆڕیەکان و خۆشەویست، لەگەڵ دەوڵەت و خۆبەزلزانی و کارە توندوتیژیـەکانی و سـزا و جەنگـەکانی. بیروبـاوەڕی مەسـیحیەتی ڕاسـتەقینە هـەموو گونجانێـك بـۆ داننـان بـە دەوڵەتـدا ڕانامالێـت، بـەڵکو کۆڵەگـەکانی تێکدەشکێنێ)، زیاتر دەڵێت: (ڕێنماییەکانی عیسای مەسیح دەوڵەت تێکدەشکێنێت. خـەڵکی لەمـە تێگەیشـتوون لەوەتـەی مەسـیحیەت پەیـدابووە، ئەمـە هۆکـاری لـە خاچدرانی مەسیح بووە).**

**<u>سـێیەم</u>، بـە ڕاشـکاوانە ڕایگەیانـد ئـەو دادگایانـە ڕەت دەکاتـەوە، کـە لەسـەر توندوتیژی دامەزراون، ئەمە توندوتیژیەکە عیسای مەسیح پێی ڕازی نییە، بـە پرسیارەوە نووسیویەتی: (ئایا بۆ مەسیحیەك هەیە ئەندام بێ لـە دادگایەکـدا، کـە**

هاوشێوەی ئەو دادگایی بکەن؟ ئایا ئەویش هەیە مادەم مەسیحییەکی دڵسۆزە بۆ ڕێنماییەکانی عیسای مەسیح، داوای پارێزگاری بکات لەم دادگایە بەهۆی هێز؟ ئایا بۆ کەسێکی مەسیحی دڵسۆز بۆ ڕێنماییەکانی مەسیح هەیە تاکێك بێ لە تاکەکانی کارگێریەك، کە توندوتیژی دژی کەسەکان بەکاربهێنێ؟).

چوارەم، جەنگ و خزمەتی ناچاری سەربازی بۆ هەمووانی ڕەتکردۆتەوە، دەپرسێ (ئایا کەسی مەسیحی دڵسۆز بۆ ڕێنماییەکانی عیسای مەسیح دەتوانێ مەشق بکات لەسەر کوشتنی دراوسێیەکەی و ئەنجامدانی کوشتن بەوپێیەی سەربازە؟)، بەردەوام بووە لەم پرسینەی و وتویەتی: (چۆن هەماهەنگی دروست بکەین لە نێوان ڕێنماییە ڕوون و وردەکانی عیسای مەسیح لە دڵەکانماندا، لەبارەی لێخۆشبوون و خاکیبوون و خۆشویستنی هاوشێوەکانمان، بە دۆست و دوژمنەوە، لەگەڵ ئەوەی لێمان داوا دەکرێ: لە پیادەکردنی توندوتیژی سەربازی دژی پیاوانێك لە ڕەگەزی خۆمان و ڕەگەزی بیانیش؟).

## تێکگیرانێکی سەیر :

سەرباری ئەوەی باسکرا، تۆڵستۆی جەختی لەسەر تێکگیرانێك کردۆتەوە، کە شارستانیەتی مەسیحییەتی لەسەر بنیاتنراوە، خۆی دەبینێتەوە لە (یاسای خۆشویستن)، کە عیسای مەسیح مژدەی لەبارەوە داوە، لەگەڵ (یاسای توندوتیژی)، کە حوکمڕانان و ئەو ئامۆژگاریکارانەی لەگەڵیاندان هێناویانە، هەر بۆیە دەڵێت: (ئەندامانی جیهانی مەسیحی یاسای خۆشەویستیان پەسەند کرد، لە هەمان کاتدا ڕێگەیاندا بە پیادەکردنی توندوتیژی. زیاد لەوەش مادەم ئەوان ژیانی خۆیان لەسەر توندوتیژی دامەزراند، ئەوا بوونی تەواو بۆ گەلانی مەسیحی

تەنها گوزارشت دەكات لە تێكگیرانی ڕەها لە نێوان ئەوەی مژدەی پێدەدات، لەگەڵ ئەو بنچینەیەی ژیانی خۆیانی لەسەر بنیات دەنێن... ئەم تێكگیرانە لە گەورەبوون نەوەستا، لەگەڵ گەشەكردنی مەسیحییەكان، تا لە سەردەمی كۆتاییدا گەیشتە بەرزترین پلەی).

## بە توندوتیژی ڕووبەڕووی توندوتیژی نەبنەوە :

بەرامبەر بەم هەموو بەرهەڵستیە زۆرانەی لەهەمبەر شێوەی مەسیحیەت كە لە سەردەمی ئەودا هەبووە، ئەوا تۆڵستۆی نا توندوتیژی وەك ئامرازێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی خراپە و شەڕ پێشكەشی كردووە. بانگی خەڵكی نەكرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی شەڕ بە شەڕ، ئەگەر وانەبووبا ئەوا بانگەوازەكەی بێ كەڵك دەردەچوو. داوایان لە خەڵك دەكرد هیچ دەسەڵاتێك لەسەر خۆیان دانەنێن جگە لە دەسەڵاتی خوا نەبێ، هەر بۆیە دەڵێت: (كەسی مەسیحی خۆی ئازاد دەكات لە دەسەڵاتی هەر كەسێك بەسەریدا، كاتێك تەنها داندەنێ بە یاسای خوا، كە عیسای مەسیح ڕوونی كردۆتەوە. ئەم خۆ ئازاد كردن و خۆدارنینە هەرگیز بەهۆی توندوتیژیەوە یان بەهۆی شكاندنی شێوەكانی ژیانی هەنوكە نابێ، بەڵكو بەهۆی هەمواركردنی ڕێگەی تێگەیشتن دەبێ لە ژیان. هەر توندوتیژیەك بەلای عیسای مەسیحەوە كارێكی نارەوا و بێ بایەخ و پێویست نییە).

## تۆلستۆی وەك باوەڕدار:

تۆلستۆی مەسیحییەكی دیندارە، باوەڕی بە مەسیحییەت هێناوە لە ڕێگەی هۆشـیاری و توێژینـەوە و ڕامانـەوە. ڕێنماییـەكانی ئاینەكـەی لـە سەرچـاوە سەرەكییەكەی كە ئینجیلە وەرگرتووە، نەوەك لە پیـاوانی ئـاینی كلێسا، لە خـۆی قبوڵ نەكردووە شوێنكەوتویان بێ. تەنها شوێن عەقڵ و دڵی كەوتووە. هـەر بۆیـە دەبینین تۆلستۆی باوەڕدارە و تەنها دینـدار نییـە. كاتێك تۆلستۆی بینـی عیسـای مەسیح بانگەوازی كـردووە بـۆ خۆشەویستی و ئاشـتی و نـا توونـدوتیـژی، بـاوەڕی پێهێناوە، ڕووی نەكردۆتە ئەوەی باوە لە سەردەمی خۆی لە پاساوهێنانەوەكان، كە ڕەوایی بـە توونـدوتیـژی دەدەن. نەترسـاوە لـە ڕاگەیانـدنی ڕا و بۆچوونی ڕوون و ڕاشـكاوی خـۆی، سـەبارەت بـەوەی پێـی وایـە پێچـەوانەی ڕێنماییـەكانی عیسـای مەسیحە. جوانترین شت لە تۆلستۆیدا ئەوەیە باوەڕی بە نـا توونـدوتیـژی هـەبووە بە گوفتار و كردارەوە.

# ژیان لە پێناوی خوادا

## کەلتوری مردن :

زۆر دەخوێنینەوە و دەبیستین لەبارەی مردن لە پێناوی خوادا، بەڵام کەم وایە گوێبیستی ئەوە بین یان شت بخوێنینەوە لەبارەی ژیان لە پێناوی خوادا. لە وتاری هەینیدا وتاربێژ دەدوێت لەبارەی پلەوپایەی شەهید و قوربانیدان لە پێناوی ئایین و مەزهەبدا. لە بەرنامەکانی تەلەفزیۆندا کەسایەتییەکانی کەناڵە ئاسمانیەکان بۆمان دەدوێن لەبارەی فیداکارە پاڵەوانەکان، ئەوانەی خۆیان بەخت کردووە لە پێناو وڵاتەکانیان. لە کتێبە ئاینیەکاندا شت دەخوێنینەوە لەبارەی پاڵەوانەکانی مێژوو و پیاوە دەگمەنەکانی، ئەوانەی گیانی خۆیان پێشکەش کردووە بۆ بەرزکردنەوەی وشەی ئایین و بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام. بەهۆی ئەمەوە وێنەیەکی شێواو سەبارەت بە پاداشتی خوایی لە گوێچکەکانماندا دروست بووە سەبارەت بە پاداشتی خوایی، کە پێمان وایە پەیوەستن بە مردنەوە، لە عەقڵی ئێمەدا وێنەی کاری چاك لەم ژیانەدا و ئەو سوودانەی سەری بۆ دەکێشن لە دونیا و دوارۆژدا ونبووە. هەندێك پێیان وایە کەلتوری مردن سەرچاوەکەی ئاینە، ئەمە ڕاست نییە، کەلتوری مردن لە پیاوانی ئاینەوە سەرچاوەی گرتووە. ئایین بانگمان دەکات بۆ ژیان و دەست پێوەگرتنی، چونکە پێی وایە ئەمە ڕەسید و بەهای ئێمەیە بۆ دوارۆژ، سەبارەت بە پیاوانی ئاینی، ئەوا پێیان وایە مردن ڕێگەی هەرە ئاسانە بۆ دوارۆژ.

## کەلتوری چاونەترسەکان :

کەلتوری مردن لە کۆمەڵگاکانماندا باوە، بەڵام بە دەگمەن نەبێ کەلتوری ژیان ناناسین. لەوانەیە هۆکاری ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئاسانی ئاوێتە و هۆگربوون بە کەلتوری مردن، کە تەنها پێویستی بە خۆڕزگار کردن هەیە لە ژیان، هەروەك خۆکوژەکان ئەمە دەکەن. کەلتوری مردن کەلتوری ترسنۆکانە، کەلتوری ژیان کەلتوری چاونەترسەکانە. بێگومان ژیان گوزەراندن لە ژیانێکی پڕاوپڕ لە ململانێ و ناکۆکی، پێویستی بە چاونەترسی و کۆششی سەخت هەیە، وا دەردەکەوێ ئەوانەی لایەنگیری کەلتوری مردن دەکەن ناتوانن بەرگەی بگرن.

بە ڕای من ژیان گوزەراندن لە پێناوی خوادا زۆر سەختترە لە مردن لە پێناوی خوادا، ئەوانەی لە پێناوی خوادا دەژین، بەرگەی چەند ناخۆشییەك دەگرن هەندێك جار بەرزترە لە نەخۆشییەکانی مردن. سەبارەت بەوانەی ناتوانن بەرگەی سەختییەکانی ژیان لە پێناوی خوادا بکەن، ئەوا نەریت وایە ئەوان بەجۆش و خرۆش بۆ بیرۆکەی مردن لە پێناوی خوادا، لەوانەیە ڕێگەیەك بێ بۆ هەڵاتن و خۆکوشتن. لەوانەیە ئەوانەی بەرگەی سەختییەکانی ژیان دەگرن لە پێناو خێر و کاری بەسوود و باوەڕیان بە بنەمای ژیان هەیە لە پێناوی خوادا، ئەوا ئەمە لە هەموو خەڵك زیاتر خۆڕاگر و چاونەترسترە.

## کەلتوری گەشەپێدان و ئاوەدان کردنەوە :

ئاوەدانکردنەوەی وڵاتان و گەشەپێدانیان، پێویستی بە کەلتوری ژیانە نەوەك کەلتوری مردن، ناکرێ نیشتمانەکانمان بنیات بنێین و وڵاتەکانمان ئاوەدان بکەینەوە مادەم ئێمە جگە لە کەلتوری مردن ناناسین، ناکرێ زەویەکانمان بە کشتوکاڵ بچێنین و بەرهەمەکانمان بخۆین، مادەم شکۆ دەبەخشین بە خۆکوژان و

به پاڵەوان دایانـدەنێین و پـەیمانی حۆری چاوگەشـیان پێـدەدەین. نـاتوانین یـەك هەنگاو بچینه پێشەوه لە بواری گەشەپێدان و پێشخستن، مادەم ژیان دەبوغزێنین و مـردن بـه باشـتر دادەنـێین. شـتێكی زۆر جـوان و باشـه كـەلتوری ژیـان بكەینـه كەلتوری باو، له پێناو سەركەوتن و پێشكەوتن و ئاوەدانی، چونكه بانگمان دەكات بۆ دڵسۆزی له كار و هەوڵدان بۆ سەركەوتن.

## كەلتوری مردن و تـاوانی بیروبـاوەڕی:

یەكێك له هۆكارەكانی بڵاوبوونەوەی تاوانی بیروباوەڕی له كۆمەڵگەكەمانـدا بریتییه له بڵاوبوونەوەی كەلتوری مردن، كه پێی وایه كوشتن و خۆڕزگاركردن له كەسـی دژەڕا بریتییـه لـه ڕێگـەی سـەلامەت و ڕوون و ڕاشـكاو بـۆ بـەرپاكردنی دادگەری كۆمەڵایەتی و پشتیوانی بیروبـاوەڕی. كـەلتوری مـردن لـه پێنـاوی خـوادا ڕێخۆشكەره بۆ چارەسـەركردنی كێشـەكان لـه ڕێگەی كوشـتاردا، چـونكه تێكۆشـان (جیهاد) و كوشتار و شەڕ یەكسان دەكات. لـه ڕاسـتیدا تێكۆشـان دەربڕینێكـی تـره لـەبارەی ژیـان لـه پێنـاوی خـوادا، چـونكه وا لـه تـاك دەخـوازێ كۆشـش بكـات بـۆ بەدەسـتهێنانی بەرژەوەنـدی هـەمووان. ئەگـەر كـەلتوری تێكۆشـان ونبـوو، ئـەوا كـەلتوری كوشـتار ئامـاده دەبـێ، ئەمـه هۆكـاری پشـت بڵاوبوونـەوەی كەسـانێكی خۆكوژه به پاساوی تێكۆشان له پێناوی خوادا یان ئـەوانی تـر دەكـوژن بـه دڵێكـی ئاسووده، كه چاوەڕێی پاداشتی خوایه.

## عەلی شەریعەتی و ژیان:

نووسەری ئیرانی عەلی شەریعەتی له ساڵی (١٩٧٥) له بەندیخانەوه نامەیەكی بۆ قوتابییەكانی نارد، بەم گوزارشته دەستی پێكردبوو (خوایەگیان؛ فێرم بكه چۆن بـژیم... سـەبارەت بـەوەی چـۆن بمـرم ئـەوا مـن ئـەوه دەزانم). بـەڵێ فێربـوونی

هونەری ژیان و ڕێبازەکەی بریتییە لە ڕێگەی سەخت، کە شەریعەتی لە خوای گەورە ویستویەتی ڕێنوێنی بکات بۆی، ئەوە ڕێگەیەکە شەریعەتی پێی وایە گەیشتن بە خوا لە میانەیدا دەبێ سەرەتا بە ناو خەڵکدا تێبپەڕێ، بەڵکو ئەم ڕێگەیە ڕاست نابێ تەنها لە میانەی ڕۆیشتنی نەبێ بە ناو خەڵکدا، بەو مانایەی تاك بەرگەی بەرپرسیارێتیەکەی بکات بەرامبەر بەوانی تر پێش ئەوەی بانگەشەی بەرپرسیارێتیەکەی بکات بەرامبەر بە خوا.فێربوونی چۆنیەتی ژیان بە خۆشەویستی و لێبوردەیی و میهرەبانی و هاریکاری، بە بایەخترین و بەکەڵکترینە لە چاکبوونی پەیوەستبوونی پەیوەستبونەکانی مرۆڤ چ بەخۆی یان بە بەدیهێنەرەکەی یاخود براکان یان ژینگەکەی. سەبارەت بە ڕێگەی مردن، ئەوا هیچ سەختیەکی تێدا نییە، مردن خۆی نانوێنێ بە جیابوونەوەی گیان لە جەستە، بەڵکو بە جیابوونەوەی مرۆڤ لە برا مرۆڤەکەی دەبێ.

## بانگەوازێك بۆ ژیان:

ئەگەر نەمانتوانی لە کەلتوری ژیانەوە خۆمان بگوازینەوە بۆ کەلتوری ژیان، ئەوا ناتوانین لە گۆڕستانی مردووانەوە بچینە باخچەکانی زیندووان. بە ڕاشکاوانە ئێمە مردووین، چونکە کەلتورەکەمان کەلتوری مردنە، ئەوانی تر زیندوون، چونکە کەلتورەکەیان کەلتوری ژیانە. ئێمە ڕێگەی ژیانمان هەڵدەبژێرین بەپێی ڕێگەی بیرکردنەوەمان، ئەگەر بە مردن بیرمان کردەوە، ئەوا دەبینە مردوو، ئەگەر بیرمان لە ژیان کردەوە، دەبینە زیندوو. هەر بۆیە لەسەر کەسانی ڕۆشنبیر و ڕاگەیەندکار و پیاوانی ئاینی و مامۆستایان پێویستە، لە نووسین و بەرنامە و وتارەکانیاندا لە کەلتوری مردنەوە بچنە سەر کەلتوری ژیان، تا ببنە ئامرازی بنیاتنان، لە جیاتی ئەوەی ببنە پاڵنەری ڕووخاندن.

# ئایین چاکە قۆرخ ناکات

## چاکە چییە ؟

ئاسان نییە پێناسەیەکی ڕوون بەدی بکەین بۆ چاکە، بەڵام دەکرێ چەند مەرجێك دابنێین بۆ جیا کردنەوەی چاکە لە شتەکانی تر. گرنگترین پێوەر کە لەوانەیە هەمووان لەسەری کۆك بن، لەوانەش پیاوانی ئاینی ئەوەیە کە (سوود پێوەری چاکەیە)، چاکترینی خەڵك ئەوەیە زۆرترین سوودی هەبێ، هەر بۆیە مەرج بۆ چاکە دادەنێین، کە گونجاوبێ لەگەڵ بارودۆخەکانی ژیان، بەو مانایەی سوودبەخش بێ بۆ ژیان و کاروانەکەی و بۆ مرۆڤ و گوزەرانەکەی.

لە کتێبی (کۆمار)ی ئەفلاتۆندا لێکۆڵینەوەی لە مانای چاکە و ڕێکە و ئامانجەکانی کردووە، تیایدا هاتووە چاکە ڕێگەی بەختەوەر بوونە، بە خودی خۆی و دەرەنجامەکانی داوا دەکرێ، ئەم خاڵەی کۆتایی زۆر گرنگە، ئەوانەی پێیان وایە چاکە تەنها لەبەر خودی چاکە داوا دەکرێ، ئەوا بە هەڵەداچوون، چاکە نابێتە چاکە، ئەگەر دەرەنجامی باش و کاریگەریەکی ئەرێنی نەبێ لە ژیانی خەڵك و کاروانی کۆمەڵگەدا، ئەمە پێچەوانەی ژمارەیەك کردەوەیە، کە پیاوانی ئاینی پێیان وایە ئەم کردەوانە لە چاکەکانن، بکەرەکانی پاداشتی لەسەر وەردەگرن و نەکەرەکانی سزا دەدرێن، کەچی ئەمانە تەنها کردەوەی بۆشن، عەقڵ قبوڵی ناکات، لۆژیك پێی ڕازی نابێ، چونکە نەگونجاوە لەگەڵ ژیان و بێ کەڵکە بۆ مرۆڤ، زۆربەی جاران سەرچاوەکەی کەلەپور و مێژووە، نەوەك واقیعی ژیان، لەگەڵ ئەمەشدا پیاوانی ئاینی دەیدەنە پاڵ ئایین و بە چاکە و ڕەوشت هەژماری دەکەن.

## چاكە و بیركردنەوەی فەلسەفی :

لەوانەیـە زیـادەڕەوی نەكـەم، ئەگـەر بڵـێم زۆرێـك لـە چـاكە و ڕەوشـتەكان دەرەنجـامی بیركردنەوەیـەكی فەلسـەفی قـوڵن لـە كاروبارەكـانی ژیـان و ئامـانج و چۆنیەتی ژیان تیایدا. فەلسـەفە چـەندین پێناسـەی هەیـە، خەریكـە پێناسـەیەكی یـەكگرتووی بـۆ نـەبێ، بـەڵام دەكـرێ بـوترێ: (فەلسـەفە لێكۆڵینەوەیـە لـە بـوون، بەهۆی عەقڵەوە، لێكۆڵینەوەیەك كە پشت بە باوەڕی پێشوەختە نەبەسـتێ). ئـەم پێناسەیە پەیوەندی پێمانەوە هەیە لە تێگەیشتن لە چۆنیەتی كاركردنی فەلسەفە لەسەر دروستكردنی چاكە و پیشەسازی ڕەوشت، چاكە لە دیدی فەلسەفەدا ئەوەیە كە دەنگونجێ لەگەڵ عەقڵ و لە واقیعی ژیاندا هەڵدەقوڵێ، ئەوە نییە كە گونجـاوە تەنها لەگەڵ دەقەكانی كەلـەپور و مێـژوو و ئـایین، بـاوەڕبوون بـەم دەقانـە و كـار كردن پێیان پێویستی بە باوەڕێكی پێشوەختەیە، فەلسەفە باوەڕی پێشوەختە ڕەت دەكاتەوە، چونكە بیركردنەوەی دروست پەكدەخات، هـەر بۆیـە دەبیـنین پشـت بـە دەقەكان نابەستێ لە دیاریكردنی چاكەكاندا، بەڵكو پشت بە عەقڵ و توێژینـەوەی واقیع دەبەستێ.

فەلسـەفە بەشـداری كـرد لـە دروسـتكردنی ژمارەیـەك چـاكەدا، كـە لـە كۆمەڵگەكاندا نەبوو، زۆرێك لـەو ڕەوشـتانەی گەشـەپێدا، كـە مـرۆڤ پێویسـتی پـێ هەبوو. لەوانەیە باشترین بەشدار لەم بوارەدا بەشـدار فەلسـەفەی یۆنـانی بـێ، كـە كۆمەڵگەیـەكی سـەركەوتووی دروسـت كـرد و تـوانی شارسـتانیەتێك بنیـات بـنێ و كۆمەڵگەیەكی چاڵاكی گەشەسەندوو بـەرپا بكـات، هـەروەها بەشـداری فەیلەسـوفە موسـڵمانەكان و دانـراوە زۆرەكانیـان، چـاكترین بەڵگـەن لەسـەر ئەمـە. لەوانەیـە

خوێنـەر بتـوانێ دڵنيـا بـێ لـە دروسـتى ئـەم بۆچـوونە لـە كـاتى خوێندنـەوەى كتێبەكەم (شارى پايەدار و حەى كوڕى يەقزان).

## ئايين چاكە قۆرخ ناكات :

هەندێك پێيان وايە چاكە و ڕەوشـت تـەنها پەيوەسـتن بـە ئـايين و پيـاوانى ئايين و دينداراتەوە، لەم بازنەيەدا دەرناچێ، ئەوەى نەدرێتە پاڵ بيرۆكـەى ئـاينى يان پياوانى ئاينى ياخود ديندارات ئەوا پێويستە گەندەڵ و لاسار بێ، خاوەن چاكە و ڕەوشت. لە تێڕوانينى ئێمەدا ئەمە ڕاست نييـە، چونكە چـاكە و ڕەوشـت قـۆرخ نـەكراون لەلايـەن ئـايين يـان پيـاوانى ئـاينى و دينداراتـەوە. چـاكە و ڕەوشـت دەرئەنجامى بيركردنەوەى مرۆڤە بە ئاراستە و ديد و حەز و ئامانجەكانيـەوە، هـەر يەكـە لـە فەلسـەفە و نـەريت و ئـايين و زانسـت و هونـەرەكان بەشـداربوونە لـە دروسـتكردنى چـاكە و ڕەوشـدا. ئـايين تاكـە سەرچـاوە نييـە بـۆ چـاكە و ڕەوشـت، پياوانى ئاينى و دينداران قۆرخكەرى چاكە و ڕەوشت نييـە.

## ئايين دانـايى و حيكمەت قۆرخ نـاكات :

هـەروەك چـۆن ئـايين چـاكە و ڕەوشـت قـۆرخ نـاكـات، ئـەوا بەهـەمان شـێوە داناييش قۆرخ ناكات. ئەو داناييەى لە ماوەى ژيانماندا پێى دەژين، ئەوا لە ئەدەب و فەلسـەفە و ئـايين و زانسـت و هونەرەكانـەوە وەردەگـرين، سـەبارەت بەوانـەى بانگەشەى ئەوە دەكەن داناييان قۆرخ كردوو، ئەوا بە هەڵەداچوون. دانـايى بـەبێ ئـەدەب و فەلسـەفە و هونـەر و زانسـتەكان بـە كـرچ و كـاڵى دەمێنێتـەوە. ئـايين هەرچەندە مەزن بێ، ئەوا ناتوانێ بە تەنها درك بكـات بـە گشـت وردەكارييـەكانى

واقيع، هەروەك ئەدەب دەيكات بەوەى تێيدايە لە چیرۆك و ڕۆمان و شيعر و وتار، ناتوانێ كێبڕكێ لەگەڵ فەلسەفە بكات لە خۆداڕنينى لە كۆت و بەنـدەكان داب و نەريت و بڕيارە پێشوەختەكان، ناتوانێ بچێتە قوڵايى ئـەزموون و تاقيكردنـەوە و بوێرى دۆزينەوەدا وەك زانست، نـاتوانێ لـە جيهـانى جـوانى و خەياڵدا بـاز بـدات وەك هونەر. مەبەست لە دانايى لێـرەدا ئـەوە نييـە كـە لێـى تێدەگـەين لـە زمـانى سـادەماندا، لـە چـاك مشـورخواردن و ڕاسـت پێكـان، بـەڵكو پـێش هـەموو شـتێك (قوڵبوونەوەيـە لـە بيركردنـەوە و خۆڕزگـاركردن لـەوەى ڕاپێچمان دەكـات بـەرەو واقيعـى ڕۆژگـار، خـۆ يەكلاكردنـەوە بـۆ بيركردنـەوە و ڕامـان لـە كاروبارەكـانى گەردوون و ژيان و مرۆڤ و چارەنووسەكەى).

## بانگەوازێك بۆ پياوانى ئاينى :

پياوانى ئاينى وا ڕاهاتوون ئامۆژگارى و ڕێنمايى بـە خـەڵك بـدەن جگـە لـە خۆيان، پێم وابێ كاتى ئەوە هاتووە پياوانى ئاينى گوێ بگرن لە بانگەوازى ئەوانى تر بۆ ئەوان. يـەكێك لـەم بانگـەواز و ئامۆژگاريانـە ئەوەيـە تـەنها لێكۆڵينـەوە لـە كتێبـە ئاينيـەكان نەكـەن، بـەڵكو پێويسـتە لەسـەريان لێكۆڵينـەوە لـە ئـەدەب و فەلسەفە و زانست و هونەرەكانيش بكەن، بێ ئەوەى كۆسپ لەبەردەميان دابنێن لە حەڵاڵ و حەڕام، كە بيركردنەوەى ڕاست كۆت و بەنـد دەكـات و گەشـەى سروشـتى دروست پەكدەخات. لەوانەيە زيادەڕەوى نەكـەم ئەگـەر بڵـێم ئـەو پيـاوە ئاينيانـەى شارەزا نين لە ئەدەب و فەلسەفە و زانست و هونەرەكانـدا، نـاتوانن ئاشـنا بـبن بـە چاكە و ڕەوشت و دانايى بەشێوەيەك كە وايان لێبكات سوود بەخش بن بۆ ژيان و مرۆڤ و كۆمەڵگە.

لەســەر پیــاوانی ئـاینی پێویســتە ڕۆمــان و چـیرۆك و شـانۆگەر و چـامە و پەخشان بخوێننەوە، دەبـێ لێکۆڵینـەوە لـە گشت فەلسەفەکان بکەن، لـە نێویانـدا فەلسەفەی بوونگەرا و ماددەگەرا، هەروەها زانستە مرۆیی و سروشتییەکان، دەبـێ چێژی هونەرەکانی وەك وێنە و نەقش هەڵکەنـدن و پەیکەر و مۆسیقا و گـۆرانی بچێژن. ئەگەر پیاوانی ئاینی ئەم داواکاریە ڕەت بکەنەوە، بە پاساوی حەرام، کە بۆ خۆیـان دانـاوە، پێویسـتە لەسـەریان تۆمـەتباری ئـەوانی تـر نەکـەن بـە بەزانـدنی سنووری ئاین، پێویستە لەسەریانە خۆیان وەك سەرپەرشـتیاری خـەڵك دانـەنێن، نابێ لۆمەی خەڵك بکەن لەسەر سەرپێچی کردنـی ئـەوان لەمـەدا، چونکە ئەگـەر پیاوانی ئاینی بیانەوێ ئەوانی تر گوێیان بۆ بگرن، پێویستە لە بەرامبەردا گوێ بۆ بەرامبەریان بگرن.

ئەو پیاوە ئاینیانەی ئاشنایەتیان نییە لەگەڵ فەلسەفە و ئەدەب و زانست و هونـەر و ئاینـەکانی تـر جگـە لـە ئـاینی خۆیـان، نـاتوانن لـە ژیـان و ئامانجەکـە و چۆنیەتی گوزەران تیایدا بگەن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی درك نەکەن بە دانایی خــوا لــە ڕاجیــایی و فرەییــدا، لــە تــونێلی قــۆرخکردنی حەقیقــەت و تــاریکی تۆمەتبارکردنی ئەوانی تر بە گومڕایی و کوفردا کات بەسەردەبەن. سەرباری ئەمە نــاتوانن چارەســەر بدۆزنــەوە بــۆ ســەختییەکانی ژیــان و کێشــەکانی کۆمەڵگــە و قەیرانەکانی مرۆڤ. بە گوزارشتێکی تر ئەو فەتوایانەیان کە دەریدەکـەن بـۆ هـیچ کەسێك سوودبەخش نابن، بەڵکو زیانەکەی لە سوودەکەی زیاتر دەبێ، چونکە لـە واقیعی ژیانەوە سەرهەڵنادەن، کار لەسەر ڕێکخستنی مرۆڤ بـە مرۆڤـی براکەیـەوە ناکەن.

## دەرەنجامەكانى بيرۆكەى قۆرخكرانى چاكە لەلايەن ئاينەوە :

ژمارەيەك لە دياردەى نەرێنى كۆمەڵايەتى و ئابوورى و سياسى لە بيرۆكەى قۆرخكرانى چاكە و ڕەوشت و دانايى لەلايەن ئاينەوە بەرهەم دێن، دەكرێ ئامـاژە بە ديارترينيان بدرێ لەم خاڵانەى خوارەوەدا:

١- وازهێنـانى لـە چـاكە و ڕەوشـت، بـە پاسـاوى وازهێنـان لـە ئـايين: هەنـدێك لـە گەنجان پێيان وايە وازهێنان لە ئايين، واتە وازهێنان لە چاكە، بۆيە دەيـانبينى لـە چـەند كارێكـدا پاڵـدەنرێن، كـە هەماهـەنگ نييـە لەگـەڵ چـاكەكاريدا، بـە پاساوى ئەوەى سەرچاوەى چاكە ئاينە، مادەم وازيان لە ئايين هێناوە، ئەوا دەبێ واز لە چـاكەش بهێـنن. لـەم بابەتـەدا بيرمەنـدى ماركسـى (هـادى عەلـەوى) لـە كتێبەكەيدا (بينـراو و نەبينراو لە ئەدەب و سياسەتدا) دەڵێت: (يەكێك لە شتە نامۆكـان ئەوەيـە هەنـدێك لـە ڕۆشـنبيرە هاوچـەرخەكانمان، ئەوانـەى ڕێچـكەى ئيلحاديان گرتۆتەبەر، ڕۆچوون لە بەرەڵاييدا، بۆ ئەوەى بەرهەڵستى خۆيان بۆ ئـايين بسـەلمێنن، ئەمـەش لـە ميانـەى ڕۆيشـتن لەسـەر ئـەو خەياڵـەى كـە لـە گوێچكەكانياندا ڕۆچووە بە كۆبوونەوەى ئايين و ڕۆحانيەت يان ئايين و چـاكە بەيەكـەوە). ئـەو دۆخـەى هـادى عەلـەوى باسـى كـردووە جيـاواز نييـە لـەو بارودۆخەى ئەمڕۆ لە وڵاتەكانماندا هەيە، زۆرێـك لـەو گەنجانـەمان، كـە ئـاينى توونـدڕەو هانى داون بۆ گرتنەبەرى هەڵوێستێكى نەرێنى لەهەمبەر ئـايين، بـە دوا شتێكى پيچەوانەى چاكە و ڕەوشتدا دەگەڕێن، بۆ چەسپاندنى بەرهەڵستى و نارەزايەتيان بەرامبەر ئـاينى توونـدڕەو، ئـەوان پێيـان وايـە ئەگـەر بيانـەوێ بەرهەڵستى توونـدڕەوى بكـەن، ئـەوا لەسـەريانە بەرهەڵستى چاكە و ڕەوشـت بكەن، ئەمەش ڕاست نييە. هەر بۆيە ئەگەر بمانەوێ گەنجان دەست بە چاكە و

ڕەوشتەوە بگرن، پێویستە لەسەرمان بۆیان ڕوون بکەینەوە کە چاکە و ڕەوشت لەسەر ئایین قۆرخ نەکراوە، گرنگ نییە لەگەڵ یان لە دژی ئاینی بیت، گـرنگ ئەوەیـە لەگـەڵ چـاکە و ڕەوشـت بیـت. لـە مـاوەی دوای داگیرکرانـی عێـراق، کەشێکی پڕ لە توونـدڕەوی ئاینی باڵیکێشا لەسەر زۆربەی دامـەزراوەکانی وڵات و لەناویشیاندا زانکۆکان، ژمارەیـە لـە گـەنجانی توونـدڕەو کاریـان کـرد لەسـەر سەپاندنی لەچکی توونـد لەسەر ئەو قوتابییـە کچانەی کـە لـە بنەڕەتـدا لەچك بـوون، ئەوانـەش کـە لەچـك نـەبوون، ئـەوا ڕووبـەڕووی هـەڕەی کوشـتن یـان تێکرتنی ئاوی گەرم بوونەوە بۆ سەر ڕوخساریان یان تاشینی پرچیان لە دۆخی خۆ لەچك نەکردنیان، وا ڕوویدا ژمارەیەك لەو کچە قوتابیانـە دووچاری ئـەم ڕووداوانـە بوونـەوە بـە کـرداری. دەرەنجـامی ئەمـە پێچـەوانە بـوو، چـونکە لەبـەرکردنی ئـەو جلانـەی نـا لەچك بڵاوبوونـەوە، کـە دژبـوون لەگـەڵ کەشـی زانکۆیی، کە پێویست بوو کەشێکی باشی خوێنـدن بـێ نـەوەك کەشـی ئاهـەنگ گێـڕان. هۆکـاری ئـەم دەرەنجامـە پێچـەوانەیەش یـاخی بـوونی هاوکاتـە، کـە پەیوەستە بە بیرۆکەی ئەوەی ئایین چاکە و ڕەوشت قۆرخ دەکات.

٢- هەڵسەنگاندنی ئەوانی تر بە پشت بەستن بە ڕووکەش: بیرۆکەی ئەوەی ئـایین چاکە و ڕەوشـت و دانـایی قـۆرخ کـردووە، پاڵمـان دەنـێ بـۆ حوکمـدان بەسـەر ئەوانی تردا بەپێی ڕووکەشیان، ئەگەر یەکێك ڕیشی بەردابوو و ئەنگوسـتیلەی لەدەستدابو و تەسبیحی هەڵگرتبوو، ئەوا دەبێ لە چاکەکاران بێ، بـەڵام ئەگـەر جگـە لـە مـەبوو، ئـەوا بـەبێ گومـان لـە شـوێنکەوتووانی شـەیتانە. بیرۆکـەی پەیوەست بـوونی چاکە و دانـایی بەئاینـەوە، کـاری کـرد لەسـەر گـومڕاکردنی عەقڵەکانمان و وایکـرد چـەند حـوکمێکی هەڵـە دەربکـەین. لەوانەیـە نموونـەی هەرە بەرز سـەبارەت بەمـە دەکـرێ لەلایـەن ئـەو گەنجانـەوە بـەدی بکـەین کـە

حەزیان لە هاوسەرگیریە، زۆربەی جاران دەبینی ئەو گەنجەی حەزی لە هاوسەرگیریە بە دوای ئافرەتی دینداردا دەگەڕێت، لە دیدی ئەودا مادەم ئافرەتەکە دیندارە، ئەوا کەسێکی چاکەکار و بە ڕەوشت و دانایە. هەروەها پێی وایە دینداری ئافرەت خۆی دەبینێتەوە لە بەردانەوەی جلی شۆڕ و چارۆگە، کە بە هەڵە ناوی دەنێن لەچك (الحجاب)، لە هەمان کات گەنجەکە پێی خۆشە ئافرەتەکە مۆسیقا و گۆرانی ڕەت بکاتەوە و دژایەتیان بکات، ئەگەر شوێنکەوتووی یەکێك لە پیاوانی ئاینی توندڕەو بوو لە پرسەکانی ئافرەتدا، ئەوا ئافرەتەکە لە لوتکەی چاکەدا دەبێ. بە پێویستی دەزانم بڵێم هاوسەرگیری لەگەڵ دیندارەکان مانای هاوسەرگیری کردن نییە لەگەڵ چاکەکاران، بە سادەیی لەبەر ئەوەی ئایین چاکە قۆرخ ناکات، چونکە بارودۆخی کۆمەڵایەتی خنکێنەر زاڵە بەسەر کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکان، ئەمەش کچانی پاڵناوە بۆ ئەوەی بە ڕووکەشی دیندارانە دەربکەون، بێ هەوڵدان بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی ناوەڕۆکی ئایین. هەر بۆیە لەسەر کوڕ و کچ پێویستە بەدوای هاوبەشێکدا بگەڕێن کە چاکەکار و بە ڕەوشت و دانابێ، جا سەرچاوەکەی هەر چییەك بێ، مەرج نییە ئایین تاکە سەرچاوەی دانایی و ڕەوشت و چاکە بێ.

٣- دەرکەوتنی دامەزراوە ئاینیەکان، کە بانگەشەی چاکە دەکەن: بیرۆکەی ئەوەی ئایین چاکە و ڕەوشت و دانایی قۆرخ کردووە، پاڵ بە هەندێك لە پیاوانی ئاینیەوە دەنێ بۆ بەکارهێنانی ناوی چاکە یان ڕەوشت بەسەر دامەزراوە و حیزب و ڕێکخراوەکانیان. لەبەر ئەوە ئەوان پێیان وایە ئەگەر بتەوێت دامەزراوەیەکی ئاینی سەرکەوتوو بنیات بنێی، ئەوا لەسەرت پێویستە ناوێکی (چاکە)ی لێ بنێی، لەسەر ئەوانەی پەیوەستن پێیەوە پێویستە سیفەتی

چاکەخواز یان دانایانیان هەبێ. لە ڕاستیدا حیزبی ئاینی چاکە و دانایی قۆرخ ناکات، چونکە خودی ئایین چاکە و دانایی قۆرخ ناکات. دۆخەکە زۆر جیاوازی نابێ کاتێك قسە دەکرێ لەسەر دزینی سامانی خەڵك بەهۆی دامەزراوە ئاینییە خەیاڵییەکان، ژمارەیەك لە فێڵباز و تەڵەکەبازەکان بیرۆکەی ئەومیان قۆستەوە، کە ئایین چاکەی قۆرخ کردووە، بەمەش هەڵسان بە دامەزراندنی ژمارەیەك کۆمپانیا و دامەزراوەی بێ بنەما، کە بانگەشەی خزمەتی خەڵك دەکات و ناوی چاکە و خێر و بێرات و پارێزکاری و ڕەوشت و جگە لەمانەی هەڵگرتووە، ماڵی خەڵکی سادەی دزی و لەگەڵیدا دوور هەڵات و خۆی لە چنگی دادگەری دزیەوە.

٤- ساختەکردنی ویستی دەنگدەر: شایەنی باسە سێ دەرمنجامە نەرێنیەکەی پێشوو، سەردەکێشێ بۆ دەرمنجامێکی نەرێنی تر، ئەویش باوەڕبوونی دەنگدەرە بەوەی پاڵێوراوی دیندار لە هەر هەڵبژاردنێکدا شایستەی بردنەوەیە، یان حیزبی ئاینی شایستەی گەیشتنە بە تەختی دەسەڵات، مادەم کەسەکە یان ئەم حیزبە نیشانەیە بۆ چاکە و ڕەوشت و دانایی. ئەم دەرمنجامە لە دیدی ئێمەدا لە مەترسیدارترین دەرمنجامەکانی بیرۆکەی قۆرخکرانی چاکە و ڕەوشت و دانایییە لەلایەن ئاینەوە، چونکە زۆرێك لە کەسایەتییە شایستەکان دووردەخاتەوە، کە پێویستە دەربچن و پێگەی کارگێڕی و سیاسی گرنگ بگرنەدەست، بەمەش ئەم پێگە کارگێڕیانە دەکەونە دەست کەسانێکی دیندار، لەوانەیە زۆر چاکە و ڕەوشت و دانایشیان نەبێ. بەگوزارشتێکی تر کار دەکات بۆ دانانی کەسەکە لە جێگەیەکی ناشیاو، لە جیاتی کەسی شیاو.

## پوختە :

زۆر پێویستە بزانین سەرچاوەی چاکە و ڕەوشت و دانایی فرە و زۆرن، دیارترینیان ئەدەب و فەلسەفە و ئاینەکان و زانست و هونەرەکانن، ئایین بە تەنها

قـۆرخی ناکـات، چـونکە مانــەوەمان بــەم بـاوەڕە دەبێتــە مایــەی زۆر کێشــەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی. لەسەر پیاوانی ئاینی پێویستە ئەگەر بیانـەوێ چاکە و ڕەوشت و داناییان هەبێ، کە سوودی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگە هەبێ، ئاشنایەتی پەیدا بکەن لەگەڵ ئەدەب و فەلسەفە و زانست و هونەر و ئاینـەکانی تـر، چونکە ئەمە تاکە ڕێگەیە بـۆ تێگەیشـتن لـەوانی تـر و ژیـان لەگەڵیـدا، تاکـە ڕێگەیـە بـۆ ڕزگاربوون لە بیرۆکەی قۆخکردنی حەقیقەت.

# پیاوانی ئایین و زانست

## ئایین و زانست:

زانست بریتییە لە کۆی زانیاریە ڕێکخراوەکان لە بابەتێکدا، زانست یان زانستی مرۆییە یان سروشتییە، ئایین بە یەکێك لە زانستە مرۆییەکان دادەنرێت. پیاوانی ئاینی نەریت وایە دوژمنایەتی یان ترسیان هەیە لە زاڵبوونی زانستە سروشتییەکان بەسەر ژیری و عەقڵی خەڵکدا، ئەگەر بەپێچەوانەوەی ئەمەش ڕابگەیەنن، ئەوا پێیان وایە زانستە سروشتییەکان بەرەو ئیلحاد سەردەکێشن، یان لەوانەیە یادی خوایان بیرباتەوە. بەڵام ئەگەر تۆمەتبارکران بەوەی دژایەتی ئایین دەکەن، ئەوا دەڵێن ئێمە لەگەڵ زانستداین، ئایین ئامۆژگاری دەکات مرۆڤ داوای زانست بکات، ئەو زانستە سروشتیانەی خۆرئاوا هێناویانە نوێ نین، چونکە سەرچاوەکەی قورئانە.

ئەگەر ورد ببینەوە لە نووسینەکانی زۆرێك لە پیاوانی ئاینیدا، دەبینین پێویستیان بە توێژینەوەی زانستی ڕەسەن هەیە، چونکە هەردەم لەسەر ئەو دەقانە دامەزراوە کە پێیان وایە پیرۆزن، ئەم دەقانە دەکەن پێشەکی و پێوانەی لەسەر دەکەن تا بگەنە دەرەنجامەکان، ئەگەر پێشەکییەکان هەڵەبوون، کە زۆربەی کات ئەمەیە، ئەوا دەگەنە دەرەنجامی هەڵە بەهەمان شێوە. ئایین بەم چەشنە بیرکردنەوە باوە زۆرێك لە تایبەتمەندییەکانی زانستەکان لەدەستدەدات، تەنانەت ئەگەر پێناسەی زانستی ناوبراویش لەسەر جێبەجێ ببێ، چونکە پێویستی بە بنچینەی زانستییە، کە دامەزراوە لەسەر چەندین بنەما، دیارترینیان گومان و ئەزموون و نموونەی ژمارەیی بۆ زانیاریەکان، ئەمەش لە بیرکردنەوەی ئاینی باودا

نەهاتۆتـەجێ، گومـان بـە کـوفر دادەنـرێ، ئـەزموونیش بـوونی نییـە، نموونـەی ژمـارەیی وەك راپرسـییەکان، بـە ویسـت و هەڵبـژاردن دەبـێ، پیـاوی ئـاینی ئـەوە وەردەگرێ کە گونجاوە لەگەڵی و پشتی بیرۆکەکەی دەگرێت، ئاوڕ بەلای زانیـاری و ئامارەکانی تردا ناداتەوە، ئەمە ئەگەر پیاوی ئاینی لە کەسـی کـراوە بـێ بـە ڕووی کاروباری زانست و زانیاری جیاواز لە ئایین.

## پیاوانی ئاینی و تەکنەلۆژیا :

زۆربەی لەوانەیە گشت پیاوانی ئاینی ئامرازەکانی تەکنـەلۆژیا بـەکاربهێنن، کە خۆرئاوا دروستیان کردووە، لە ئامرازەکانی گواستنەوە یان گەیانـدن، سـەرباری ئەمە وەسفی خۆرئاوا دەکەن بە کوفر و گومڕایی و بەڕەڵایی و جگە لەمانەش لـە سیفەتەکانی تر، ئایا نهێنی ئەمە چییە؟ لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەین ئەگەر بڵێین زۆربەی پیاوانی ئاینی دووچاری (پـەرتبوونی عـەقڵی هـاتوون). ئـەوان بانگەشـەی بـەکارهێنانی عـەقڵ دەکـەن لـە گەیشـتنە حەقیقەتـە ئاینیـەکان و دەرکردنـی فـەتواکان، بـەڵام ڕێـز نـاگرن لـەو عەقڵـەی ئامرازەکـانی گواسـتنەوە و گەیانـدنی داهێناوە، بەڵکو زیاتر لەمەیان کردووە و دەیکەن، گشت دەزگایـەکی زانسـتی تـازە حەڕام دەکەن، لە مێژوودا پەند و وانـەمان وەرگرتـووە، پیـاوانی ئـاینی حـەڕامیان کردووە چاپخانە بێتە نـاو میسـر بـۆ مـاوەی سـەد سـاڵ، هـەروەك حـەڕامیان کـرد ئامێری هەوا گۆڕکێ بێتە ناو میسر، فەتوایەکیان سـەبارەت بەمـە دەرك، ئەمـەش ناوەڕۆکەکەیەتی (فەڕەنسییە کافرەکان ئامێرێکیان داهێناوە، سروشتی ئەو هەوایە دەگـۆڕێ کـە خـوا دروسـتی کـردووە). پیـاوانی ئـاینی لـە عێـراق هـەمان شـتی

هاوشێوەیان کرد، کاتێك حەرامیان کرد مرۆڤ سواری ئوتومبێل ببێ و گوێ لە ڕادیۆ و دواتر لە تەلەفزیۆن بگرێ.

## چاوەڕوانی هاتنی مەهدی بن:

هاوڕێیەکی دڵسۆز سەردانی کردم لە یەکێك لە قوتابخانە ئاینیە شیعیەکان، لە دوای دابڕانێکی نزیکەی ساڵێك، ئەو کات ئەم قوتابخانانە بە حەوزە ناسراو بوون، پێش ئەوەی بچێتە خوێندن دەمناسی، لەبەر ئەوەی زانستخواز بوو، پێم باش بوو قسە لەبارەی زانستەوە بکەین، من دەستم بە قسەکردن کرد لەسەر پێشکەوتنی مەزنی زانستی کە لە بواری تەکنەلۆژیای زانیاریدا ڕوویداوە، بەڵام من سەرسام بووم بە گوزارشتی هاوڕێکەم، کە وتی: (عەقڵی خۆت بەم جۆرە زانیاریانەوە سەرقاڵ مەکە، ئەمە زانستێکی بێ سوودە، دەبێ چاوەڕێ هاتنی مەهدی بین، خوا دەرچوون ئاسان و سادە بکات، بزانە گشت ئەم ئامێرە پێشکەوتووانەی خۆرئاوای کافر دروستی کردووە، ئەوا پەکیان دەکەوێت بە دەرچوونی مەهدی، ئەو کاتە شەڕیان لەگەڵ دەکەین بە شمشێر و ڕم!!). دوای ئەمە قسەی بۆ کردم لەبارەی پێویستی وازهێنان لە خوێندن لە زانکۆ و پەیوەندی کردن بە خوێندنە ئاینیەکان، چونکە دواڕۆژەکەم بۆ دەپارێزێ و لەو خلیسکانە دوورم دەخاتەوە، کە ئەگەر لە زانکۆ بم ئەوا هەر تێی دەکەوم، ئەو زانکۆیەی پڕیەتی لە گەندەڵی و گومڕایی بەتایبەت لەگەڵ بوونی تێکەڵاوی خراپ، من لە داخاندا سەری خۆم دەهەژاند، ئەو وای دەزانی بەهۆی بەڕاستدانانی قسەکانی وادەکەم. ئەوە نامۆیە ئەوەیە کاتێك قسەی لەگەڵ دەکردم زەنگی مۆبایلەکەی لێدا، لەبیری چووەوە ئەمەش لە داهێنانەکانی خۆرئاوای بێ باوەڕە.

## موسڵمانان لە نێوان زانستە سروشتی و مرۆییەکاندا :

هەندێك لە پیاوانی ئاینی پاساو بەم هەڵسوکەوتە دوو سەرمیە یان دژیەکە دەدەن، ئێمەش بە یەکێك لە نیشانەکانی پەرتبوونی عەقڵی دایدەنێین، دەڵێن: (خوای مەزن پیاوە بێ باوەڕەکانی خۆرئاوای بۆمان ڕام کردووە تا خزمەتمان بکەن، ئەوان ئەوە دروست دەکەن کە پێویستمان پێی هەیە، بەڵام ئێمە خۆمان یەکلا کردۆتەوە بۆ پەرستنی خوای پاك و بێگەرد). یەکێکی تر دەڵێت: (ئیسلام لێبوردەیە لەوەی زانستی سروشتی وەربگیرێ لە نا موسڵمان، یان کەسی نا پارێزکار لە موسڵمانان، وەك: پزیشکی و گەردوونناسی و کیمیا و پیشەسازی و کشتوکاڵی و جگە لەویش، بەڵام لێبوردە نییە لەوەی زانستە مرۆییەکان وەربگرێت وەك: سیاسەت و مێژوو و ئایین و ڕەوشت و هونەر و جگە لەویش لە سەرچاوە نا ئیسلامییەکان). ئەم مۆڵەتە لە وەرگرتنی زانستە سروشتییەکان لە نا مۆسڵمانان مۆڵەتێکی کاتییە، لادەچێ بە لاچوونی هۆکارەکەی، هۆکارەکەی لە دیدی هەندێك لە پیاوە ئاینیەکان دەگەڕێتەوە بۆ (نەبوونی موسڵمانێکی پارێزکار، کە زانستە سروشتییەکانی لێوەربگیرێ، ئەم کەمتەرخەمیە لە موسڵماناندا دەگەڕێتەوە بۆ دووربوونیان لە ئاینەکەیان و بەرنامەکەیان و تێڕوانینی ئیسلامی بۆ داخوازیەکانی خەلافەت لەسەر زەوی و ئەوەی پێویستە بۆ ئەم خەلافەتە، لە زانست و ئەزموون و توانا جیاوازەکان). یەکێکی تر دەڵێت: (موسڵمانان پێویستیان بە سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئەدەب و هەڵسوکەوتی بیانی نەدەبوون لە هیچ ڕۆژێکدا، سیستەمی ئیسلامی بەس بوو بۆیان، دەستەبەری بەختەوەریەکەیان دەکرد، ئاسوودەی گشت مرۆڤایەتی مسۆگەر دەکرد. موسڵمانان پێویستیان بە داهێنراوەکانی خۆرئاوا و جگە لە خۆرئاوایە، لە داهێنراو و پیشەسازی و

زانستەكان، هەر شتێك كە ئامرازەكانى ژیان باش بكات، جگە لە سیستەمى كۆمەڵایەتى).

ئەوانەى پشتبەستن بە زانستە مرۆییە خۆرئاواییەكان ڕەت دەكەنەوە، بەپاساوى ئەوەى تێكدەگیرێ لەگەڵ ڕێنماییەكانى ئاینى ئیسلامى، پێویستە لەسەریان پێداچوونەوە بكەن یان مێژووى موسڵمانان بیر خۆیان بێننەوە، ئەوانەى كە پشتیان بەست بە فەلسەفەكانى یۆنان و بەگەڕیانخست لە زانستە ئاینیەكاندا، بێ ئەوەى هیچ سەغڵەتییەك لەمەدا ببین و ترسیان هەبێ لە تێكگیرانى لەگەڵ قورئان یان سوننەتدا. زانایانى پێشوى موسڵمانان سەربەست و ئازادتر بوون لە كۆت و بەندەكانى حەڵاڵ و حەرام، دروست و نا دروست، لە پیاوانى هاوچەرخ یان تەنانەت لە زۆرێك لە فێرخوازە زانكۆییەكانمان، چ مامۆستا یان قوتابى، ئەوانەى دەترسن لە باسكردن یان لێكۆڵینەوە لە هەر هزرێكى مرۆیى، كە پێیان وایە لەگەڵ ئیسلام دژە.

## پێویستیمان بە زانستە مرۆییەكان:

لەوە پێشتر تێبینى ئەوە دەكەین، دوو ڕا هەن دواكەوتنى موسڵمانان شرۆڤە دەكەن لە بوارى زانستە سروشتییەكاندا: یەكەم، پێى وایە ئەمە بەخششى خوایە، كە خۆرئاواى بۆ خزمەتى ئێمەى ڕام كردووە و ئەوەى پێویستمانە لەم بوارەدا بۆ ئێمەى دەستەبەر كردووە. دووەمیان، پێى وایە ئێمەى موسڵمان كەمتەرخەمین لە بەدەستهێنانى زانستە سروشتییەكان و وەڵامى ماناى خەلافەت لەسەر زەویان نەداوەتەوە، هەر بۆیە بۆیان دروستە ئەم زانستانە لە خۆرئاواوە وەربگرن، سەبارەت بە زانستە مرۆییەكان ئەوا دروست نییە وەرى بگرن. پرسیارى گرنگ

ئەوەیە، ئایا موسڵمانان پێشکەوتنیان بەدەستهێناوە لە زانستە مرۆییەکاندا، تا پێویستیان بە زانستەکانی خۆرئاوا نەبێ لەم بوارەدا؟ واقیعی دۆخەکە دەیسەلمێنێ کە موسڵمانان کەمتەرخەمن لە توێژینەوەی زانستە مرۆییەکاندا، بە پلەیەك کە کەمتر نییە لە کەمتەرخەمیان لە بواری زانستە سروشتییەکاندا.

لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەین کاتێك دەڵێین موسڵمانان پێویستیان بە زانستە مرۆییەکانی خۆرئاوایە، بە هەمان ئەو ئەندازەیەی پێویستیان بە زانستە سروشتییەکانە. زانستەکانی دەروونزانی و کۆمەڵناسی و پەروەردە، لە زانستە گرنگەکانن، کە ناکرێ فەرامۆش بکرێن، ئەمڕۆ بوونەتە پسپۆری زۆر ورد، کە ناکرێ بانگەشەی ئەوە بکەین ئەوەی لەلامانە لە قورئان و سوننەت بەسن بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیان، هەروەك پیاوانی ئاینی وا بانگەشە دەکەن، لەوانەیە ئەمە بۆ کەمتەرخەمی نەگەڕێتەوە لە قورئان و سوننەتدا، بەڵکو بۆ ڕاجیایی موسڵمانان دەگەڕێتەوە لە ڕێگەی تێگەیشتنیان و ئاڵودەبوونیان لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەت، هەر تاقمێك تێگەیشتنێکی جیاوازی هەیە لەوەی تر، ئێمە پێمان وایە پشت بەستن بە زانستە مرۆییەکانی خۆرئاوا و جگە لە خۆرئاوا، و تێگەیشتن لێی دەکرێ کار بکات لەسەر یەکخستن و بەرزکردنەوەی پەیی بردنمان بە دەقە ئاینیەکانی پەیوەست بە زانستەکانی دەروونزانی و کۆمەڵناسی و پەروەردە، دواتر تێپەڕاندنی بیرۆکەی ئەوەی ئایین حەقیقەتی قۆرخ کردووە.

## دەستوەردانەکانی پیاوانی ئاینی:

توێژەران و لێکۆڵەران لە زانستە مرۆییەکاندا لە کۆمەڵگەی ئیسلامیماندا، بە هۆی دەستوەردانی نا پسپۆڕەکان لە توێژینەوەکانیان دەناڵێنێ، مشتومڕکردن

لەگەڵیان لە دەرەنجامەکاندا، بەرهەڵستی کردنیان بە دەقەکانی قورئان و سوننەت، هـەردەم ئەمـە ڕوونـادات لەگـەڵ لێکۆڵـەرانی بـواری زانسـتە سروشـتییەکان، کـە دەرەنجامــەکانی توێژینەوەکـەیان وەردەگـیرێ، وەك ئـەوەی شـتی سـەلمێنراو بـن، هەروەك ئەم دۆخە لە زانستی پزیشکیدا بەدی دەکرێ، ئەمە مانـای وا نییـە هـیچ دەستوەردان نییە لە زانستی پزیشکیدا، بەتایبەت ئەگەر تێکگیرا لەگەڵ هەنـدێك دەقی ئاینیدا، بەڵام ئەمە زۆر توندتره لە بواری زانسـتە مرۆییەکانـدا. نموونـەی دیار لەم بارەوە ئەو ڕەخنانەیە کە (عەلی وەردی) ڕووبەڕووی بوومتەوە تـا ئاسـتی هەڕەشــە لێکــردن بــە کوشــتن، وەك بەرهەڵســتیەك بــۆ کتێبــەکانی لــە بــواری کۆمەڵناسـی، کـە توێژینـەوە لەسـەر سروشـتی تـاك و کۆمەڵگـەی عێراقـی لـەخۆ دەگرێت، ئەو ڕۆڵە نەرێنیەی ئاین و نەریت دەیبینێ لە داڕشتنی تاك و کۆمەڵگە، هــەروەها شـیکردنەوەی کۆمەڵناسـیانەی هەنــدێك ڕووداوی مێـژووی ئیسـلامی، بەتایبەت ئەوەی لە ماوەی خەلافەتی ڕێنوێنی کراو بووە، کە بە یەکسانی بە دڵـی پیاوانی ئاینی سوننە و شیعە نەبووە، تەنانەت وای لە یەکێك لە پیـاوە ئاینیـەکان کرد، لەسەر مینبەری ڕۆژی هەینی هۆشداری لەبارەی دکتۆر عـەلی وەردی بـدات و بڵێت: ((پێویستە لەسەر گەنجان خۆیان لە سێ شت دووربگرن: مـەیی و قومـار و دکتۆر عەلی وەردی)).

## گشت توێژینەوە و زانستەکان پێویستن:

هەنـدێك لـە پیـاوە ئاینیـەکان زانسـت و توێژینـەوەکان دابـەش دەکـەن بـۆ: زانسـتی پێویسـت، وەك: پزیشـکی و دەرمانسـازی و ئەنـدازیاری و هاوشـێوەکانی، زانستی لاوەکی و نا پێویست، کە نابێ کاتیان پێ خەرج بکرێت، چ جای ئەوەی لـە

پێناویـدا شـتی حـەرام بکـرێ، بـەپێی وتـەی ئـەوان، وەك: هونـەر و ئـەدەب و هاوشـێوەکانی. کاتێـك پرسـیار لـە یـەکێکیان کـرا لـەبارەی دروسـتی ڕۆیشـتنە کۆلیژەکانی هونـەرە جوانـەکان، کـە بەشـی هەڵکەنـدن و نیگارکێشی و بەشـەکانی شانۆ و نواندنیان تێدایە، لە تێکەڵی بەدوور نییە، لە وەڵامدا وتی: ((ئەگەر زانست و خوێندنەکە بۆ کۆمەڵگە پێویست بێ، وەك: پزیشکی و دەرمانسازی، ئـەوا تیایـدا بەرژەوەندی زیاتری تێدایە لە خراپەی ئەو حەرامەی دروست دەبێ لـە هەنـدێك وردەکـاری پـەیڕەوی خوێنـدن، وەك: توێکـاری مـردووان، بـەڵام ئـەم زانسـت و خوێندنە دەکرێ بگۆڕدرێ بە یـەکێکی تـر و تێکـەڵی حـەرام نـەکرێ))، مەبەسـتی لەو حەرامانەی پێویستە تێکەڵی نەبن، هەڵکەندن و تێکەڵاوی نێوان قوتابیانی کچ و کوڕە لە زانکۆکاندا.

خـاوەنی ئـەم فەتوایـە بـیری چـۆتەوە زانسـتەکان و هونـەر و زانیاریـە مرۆییەکان هەموویان بەیەکەوە لە یەکتر جیا نابنـەوە، بەیەکـەوەن بەشـێوەیەکی ئاڵۆز، کە ناکرێ بۆ پێویست و نا پێویستەکان دابەش بکرێن. بۆ نموونـە: خـاوەنی فەتواکە قسەی کردووە لەبارەی نا دروستی توێکاری مردوو بۆ مەبەستی خوێندنی زانستی پزیشکی، ئایا جێگرەوەی جەسـتەی مـرۆڤ چییە بـۆ خوێنـدنی توێکاری؟ بەلایەنی کەمەوە، هەندێك وەڵام دەدەنەوە بەوەی دەکرێ بوکەڵەی پلاستیك بەکار بهێنرێ، ئەی کێ دروسـتی دەکات؟ ئایـا لـە دروسـتکردنیدا پێویسـتی بـە هومەنـد نییە؟! ئەی چۆن خـاوەنی فەتواکـە دەڵێت پزیشـکی لـە خوێندنـە پێویسـتەکان و هونەر لە زانستە نا پێویستەکانە؟! ئایا خاوەنی ئـەم بۆچـوونە نـازانێ زۆرێـك لـە ئامرازەکـانی ڕوونکردنـەوە، کـە لـە خوێنـدنی زانسـتەکاندا بـەکاردەهێنرێن، ئـەو

زانستانەی بە پێویست ناوی دەنێن پێویستی بە هونەرمەندێکە تا بەرجەستەیان بکات؟

بەهەمان شێوە نازانیّ گشت ئامرازەکانی تەکنەلۆژیا، کە پزیشك پشتی پێدەبەستیّ لە کارەکەیدا، کۆمەڵێك پسپۆر دروستیان کردووە، شارەزان لە زانست و زانیاری جیاوازدا، لە نێویشیاندا، ئەوەی نەخشەی بۆ داناوە؟ بۆیە لەسەر هەموومان پێویستە درك بەوە بکەین زانست و زانیاریەکان گشتیان پێویستن بە هەمان ئەندازە، ناگریّ یەکێك بەسەر ئەوەی تردا بە بەرزتر دابنرێت. سەبارەت بەوەی خۆی بە گوێچکەکەدا دەکێشیّ لە گرنگی زانستەکانی وەك: پزیشکی و ئەندازیاری و بیّ بایەخی هونەر و ئەدەب، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ لاوازی بیرکردنەوەی مشتومڕئامێز، کە لە توانایدایە پەیوەندییە شاراوەکان ڕوون بکاتەوە لە نێوان جۆرە جیاوازەکانی زانست و زانیارییەکان، کە لەوانەیە لەهەمان کاتدا دژیەکیش بن، بەگشتی ئەمە لاوازیە، کە زۆربەی خەڵکی پێیەوە دەناڵێنن، لە نێویاندا ئەوانەی سەرقاڵن بە زانستە ئاینیەکانەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆر حەزیان بە بەش بەشکردنی بابەتەکانی ژیانە، بە ئامانجی ئاسانترکردنی توێژینەوەی.

# دیکتاتۆریەتی پیاوانی ئاینی

## بێ مشتومڕ جێبەجێی بکە:

هەندێك لە پیاوانی ئاینی پێیان وایە، یەکێك لە نیشانەکانی ڕەفتار جوانی لەگـەڵ خـوا، ئەوەیـە مـرۆڤ پرسـیار نـەکات لـەبارەی هۆکارەکـانی حوکمـە شـەرعییەکان، کـە ئـایین دەیسـەپێنێ لەسـەر شـوێنکەوتووانی، پرسـیار لـە مەبەستەکەی و ئەو سوودەش نەکەن کە لێی چاوەڕوان دەکرێ، چونکە هاوشێوەی ئەم پرسیارانە بە پێشێلکردنی سنووری خوا و گومانکردن لە دانایی و مەزنی خوا دادەنـرێ، لـۆژیکی دروسـت لـە هەڵسـوکەوت کـردن لەگـەڵ پرسـەکانی ئـایین و ڕێنماییەکانی بریتییە لە پابەندبوونی مرۆڤ بە گوێرەی گوزارشتی (بێ مشتومڕ جێبـەجێی بکـە)، چـونکە دروسـت نییـە مشـتومڕ لەگـەڵ خـوا بکـرێ، پرسـیاری لێبکرێ لەبارەی ئەوەی دەیکات و بڕیاری لێدەکات.

یەکێك لە پیاوانی ئاینی لە کاتی قسەکردنی لەبارەی بە باشتردانانی پیـاوان لـە ئافرەتـان لـە پرسـەکانی حوکمەکانـدا: (هەڵسـوکەوت و ئـەدەبی ڕاسـتەقینە بەرامبەر خوای پاك و بێگەرد، وادەخوازێ پرسیار نـەکرێ لـە بـارەی هۆکارەکانی حوکمەکان و ڕووەکانی دانایی تیایدا، چونکە هاوێنەی ئەم پرسیارانە گوزارشت لە بوارێ دەکات بەرامبەر خـوای پـاك و بـەرز، بـێ ڕێزییـە بەرامبـەر گەورەییەکـەی، تاکی بـاوەڕدار چ پیـاو یـان ئـافرەت، ئەگـەر حـوکمی شـەرعی زانـی، ئـەوا لەسـەری پێویستە گوێڕایەڵ و فەرمانبەردار بێ، بۆ ئەوەی خێر و بەختـەوەری بـۆ خـۆی و جگە لە خۆی بێنێت لە دونیا و دوارۆژدا، هەروەك دانـایی دەڵێـت (تـاك بەرامبـەر گوێڕایەڵی خوای پاك و بێگەرد، دەبێ وەك مردوو بێ لەبەردەستی مردوو شۆر، کە

چۆن بیەوێ سەراوژێری دەكات)، دەبێ ملكەچی حوكمەكان بێ و قبوڵیان بكات و پێیان ڕازی بێ، نەوەك لێیان یاخی بێ و مشتومڕیان لەبارەوە بكات، لێرەوە دەڵێین: لۆژیكی ئایین (بێ مشتومڕ جێبەجێی بكە) ئەم مشتومڕە لەبەرامبەر بەدیهێنراو دەگونجێ ببێ نەوەك بەرامبەر بە بەدیهێنەر. ئاڕاستە و ڕەوتە داگیركارییە ستەمكارە ڤین لە دڵەكان، كە ئامانجیان سەرشۆڕكردنی خەڵك و گومان كردنە لە ئاینەكەیان نموونەی ئەم مشتوڕانەیان هێناوە... لە نێو ئەم شتانەدا پرسیار كردنیان بڵاوكردەوە لەبارەی حیكمەت و هۆكاری حوكمە شەرعییەكان، لە كاتێكدا ئەوان دەزانن زۆربەی خەڵك سادەن و ناتوانین وەڵام بدەنەوە، ئەوەندە بەسە گومانێك لە دەروونیدا بمینێتەوە بۆ تانەدان لە دانایی و توانای خوا، دواتر گومانەكان دەبنە هۆی پاشگەزبوونەوەی تاك و كۆمەڵگە لە ئاینەكەی).

## چەند ڕاستییەك لەسەر پیاوانی ئاینی:

لە میانەی ڕامان لەم وتە و چەندین وتەی تر، دەكرێ تێبینی ژمارەیەك حەقیقەت بكەین، كە ڕامان دەكێشن بۆ تێگەیشتن لە ڕێگە و شێوازی بیركردنەوەی ژمارەیەك لە پیاوانی ئاینی و تێڕوانینیان بۆ ئەوانی تر، كە سەریان بە دامەزراوەی ئاینی نییە، ئەم حەقیقەتانە ئەمانەن:

١- پیاوانی ئاینی كاتێك خەڵك بانگ دەكەن بۆ پرسیار نەكردن لەبارەی ئەو دانایی و سوودەی دەستەبەر دەبێ، لە جێبەجێكردنی حوكمە شەرعییەكان، ئەوا مەبەستیان ئەوەیە دروست نییە پرسیار لەبارەی ئەم هۆكارانە لەوان بكرێ. شتێكی زانراوە حوكمە شەرعییەكان گوزارشت ناكەن لە ئایین، بەڵكو گوزارشت لە بیری ئاینی دەكەن، بەهەمان شێوە زۆربەی كات گوزارشت لە

ويستى خوا ناكات، بەڵكو گوزارشت لە ويستى پياوانى ئاينى دەكات، هەر بۆيە ئەوە ڕەت دەكەنەوە مشتومڕيان لەگەڵ بكرێ، بە پاساوى ئەوەى ئەم مشتومڕە پێشێلكردنى سنوورى خوايە، پێيان وايە خۆيان بريكارى خوان لەسەر زەوى، وتەبێژى فەرمى ئەون.

٢- پياوانى ئاينى پێيان وايە پرسيار كردن و لێكۆڵينەوە و بەدواداچوون، هۆكارێكن بۆ بێ باوەڕبوون بە خوا و وازهێنان لە ئايين، نەوەك هۆكارێك بێ بۆ زيادبوونى ئيمان و چەسپاوى بيروباوەڕ، واتە باوەڕى عەقڵ و لۆژيك قبوڵ ناكەن، بەڵكو باوەڕى خۆبەدەستەوەدان و ملكەچ بوون قبوڵ دەكەن، ئەويش ئەو باوەڕەيە كە گشت پێغەمبەران دژايەتيان كردووە. پێغەمبەران هاتوون تا خەڵكى بێننە دەرەوە لە پەرستشى باو لە كۆمەڵگەكانيان و بانگ كردنيان بۆ ڕامان و لێكۆڵينەوە و بيركردنەوە و بەدواداچوون، تێبينى ئەمە دەكەين لە كاتى خوێندنەوەى كتێبە ئاسمانيەكان، قورئانيش كە لە زۆر ئايەتدا بانگەواز دەكات بۆ ڕامان و بيركردنەوە.

٣- پياوانى ئاينى پێيان وايە، خەڵك كۆمەڵێك كەسى گەوج و دەستەوەسانن، تەنها شوێنكەوتن و لاساييكردنەوە دەزانن، هەر بۆيە بە سادە (عوام) وەسفيان دەكەن. پەيوەندى نێوان پياوانى ئاينى و تاكەكانى تر كۆمەڵگەى، لەسەر بنچينەى ئەوە دامەزراوە كە پياوانى ئاينى زيرەكتر و شارەزاترن، هيچ شتێكيان لا شاراوە نييە، خەڵكى تر نەزانن و دەكرێ هەڵخەڵەتێنرێن و يارى بە عەقڵيان بكرێ. پياوانى ئاينى باوەڕيان بە خەڵك و تواناكەيان نييە لەسەر زانين و لێكدەركردنى ڕاست لە هەڵە، هەر بۆيە ئەوان ڕێز ناگرن لە ڕۆشنبيران و زانايان و بيرمەندان، هەر پێگەيەكيان هەبێ، تەنها لەبەر ئەوەى پەيوەنديان بە

ناوەندی ئاینی و ڕێچکەی پیاوانی ئاینیەوە نییە. شایەنی وتنە لە دۆخی بوونی کەسانێکی نەزانی نەخوێندەوار لە کۆمەڵگەدا، ئەرکی پیاوانی ئاینیە فێریان بکەن و شارەزایان بکەن، هەوڵ و کۆششیان لەمەدا خەرج بکەن لە جیاتی ئەوەی تەنها بیانکەنە کەسانی لاساییکەرەوە و شوێنکەوتوو.

٤- پیاوانی ئاینی پێیان وایە، هەر بەرهەڵستی کردنێکی حوکم و فەتواکانیان، دەچێتە بواری پیلانگێڕی دژی ئایین و پیاوانی ئاینی، نەوەك چوارچێوەی ڕاستکردنەوەی ئەوەی دەکرێ هەڵە بێ و تێیکەوتبن. لەوانەیە ئەمە هۆکاری پاڵ بوونی ژمارەیەك حوکمی ئاینی جیاواز و نەگونجاو بێ لەگەڵ بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵگە، لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ سەدە دوورەکانی ڕابردوو، لەگەڵ ئەمەشدا بۆ هیچ تاکێك نییە بەرهەڵستی بکات یان تەنانەت تەنها داوای لێڕامانی بکات.

## کۆت و بەندە ئاینیەکان:

لەوانەیە نامۆ نەبێ بوترێ پێویستمان بە ئاینە لە ژمارەیەك بنچینەی ژیانماندا، بەڵام ئایا سنووری ئەم پێویستبوونە چەندە؟ ئایا ئایین کۆت و بەندێکە ڕاپێچمان دەکات بۆ چەند حوکم و یاسا و بنچینەیەك، پێش ئەوەی ئێمە ببین بوونیان هەبووە، وایلێهاتووە پابەندین بەوەی شوێنیان بکەوین؟ ئایا چەمکەکانی حەڵاڵ و حەرام هەموویان ڕاست و پیرۆزن؟ ئایین کۆت و بەند نییە، بەڵکو ئازادی ڕەهایە، چونکە لەلایەن خواوەیە، بەڵام زانیاریە ئاینیەکان، کە کۆی گشتیان مانا و چەمك و ڕاڤەی مرۆیین بۆ دەقی ئاینی، ئەمەیان مرۆڤ کۆت و بەند دەکات، چونکە لەلایەن خواوە نییە، ڕاڤە یان زانیاریە ئاینیەکان، ئایین دەگۆڕن بۆ

كۆمەڵێك شتی قەدەغەكراو و دروشم و پەرستش، كە زۆربەی جار بنچینەی لە ئایندا نییە. تێگەیشتنی مرۆیی هەڵە بۆ دەقی ئاینی بەرپرسە لەمە.

زۆر جار خەڵك هەڵەی ڕاڤە مرۆییەكان دەخاتە ئەستۆی ئایین، توونـدی و كۆت و بەند و ئاڵۆزی دەدەنە پاڵی، قسەكەمان ئەوە ناگەیـەنێ ئایین بەشێك لـەم سیفەتانەی تێدا نەبێ، بەڵام كەمە بە بەراورد بەوەی پیاوانی ئاینی بەسـەرماندا دەیسەپێنن.

## مانای ئازادی:

شایەنی باسە، ئازادی مانای توانەوە ناگەیەنێ، بـەڵام بـە مانـای تێگەیشتنی دروست دێ بـۆ ئـایین و ژیـان. ئێمـە لێـرەدا دەڵێین تێگەیشتنی دروست نـەوەك تێگەیشتنی حەقیقەتی بـۆ ئـایین، مەبەسـت لـە تێگەیشتنی دروست، ئەوەیـە كـە دەگونجێ لەگەڵ كاروبارەكانی ژیان و وەك بەربەست لەبەردەمیدا ناوەستێ. كاتێك قسە لەسەر ئازادی دەكـەین، مەبەستمان ئـازادی هەڵسوكەوت نییـە، بـەڵكو پـێش ئەمـە مەبەسـتمان ئـازادی بیركردنـەوە و تێگەیشـتن و بـاوەڕە بـۆ دەقـی ئـاینی، سەبارەت بەوانەی ئازادی كورت دەكەنەوە بە پیادەكردنی تێگەیشتن، هەوڵ دەدەن ڕێگـە بگـرن لەبـەردەم عـەقڵی مـرۆڤ. ئەگـەر عەقڵـەكانمان ئـازاد بـوون، ئـەوا تواناكەشمان ئازاد دەبێ لەسەر پەیوەندی بەستن لەگەڵ بەدیهێنەر و دروستكەری گەردوون، لەوانەیە ئەمە یەكێك لە مەبەست و ئامانجەكانی ئایین بێ.

## مەزنترین دیموکراتی:

**پێویستە هەموومان بزانین، مەزنترین دیموکراتی لە گەردووندا خوایە، چونکە بەدیهێناوین، بەخششی لەگەڵ کردووین، ئازادی گوێڕایەڵی یان سەرپێچی کردنی بۆمان هێشتۆتەوە، ئەمە هیچ بەدیهێنراوێك نەیکردووە و ناشیکات، مرۆڤیش ئەمەی نەکردووە، کە غەریزەی خۆشویستی زاڵبوونی هەیە، ئەمەش وایلێدەکات دەست بەسەر ئەوانی تردا بگرێت، بە چەندین ئامرازەوە، لەوانە قۆستنەوەی ئایین وەك دەسەڵاتی باڵا. شایەنی باسە، ئەو سزایانەی خوا ئاراستەی هەندێك گەلانی کردووە، کە کتێبە ئاسمانیەکان دەیانگێڕنەوە، لەبەر ئەوە نەبووە کە باوەڕیان بە خوا نەبووە، وەك هەندێك کەس بۆچوونیان وایە، بەڵام لەبەر ئەوە بووە کە پێشێلی مرۆڤیان کردووە، ئەمەش دەبێ جەختی لەسەر بکرێتەوە بۆ تێگەیشتن لە دیموکراتیەتی خوا لە بەدیهێنراوەکانیدا.**

# عەلمانیەکان و پیاوانی ئاینی

## عەلمانیەکان و ئاین:

وای لێهاتووە عەلمانیەت بووەتە تۆمەتێك، بەر هەموو ئەوانە دەکەوێ کە دینداری پێوە دیار نەبێ، هەروەك بووەتە چەکێك بەدەستی دەستە و تاقمە ئاینیەکان، بە ڕووی ئەواندا بەرزی دەکاتەوە، کە لە بیر و ئاڕاستەدا لەگەڵیان کۆك نین. ئایا عەلمانیەت چییە؟

وشەی عەلمانی بریتییە لە وەرگێڕانی نا وردی وشەیەکی فەرەنسی، کە داتاشراوە لە چاوگێکی یۆنانی، واتای ئەوە دەگەیەنێ (ئەوەی کەهەنوتی نەبێ یان ئەوەی سەری بە پیاوانی کلێساوە نەبێ). وشەیەکە بەهیچ پەیوەندیەکی داتاشراوی پەیوەندی نییە بە وشەی زانستەوە، بەمەش عەلمانی لای موسڵمانان دەبێتە هەر کەسێك کە پیاوی ئاینی نەبێ، یاخود ئەوەی سەر بەو کۆمەڵەیە نییە کە سەرقاڵن بە ئاینەوە لە زانایان و شێخ و موفتی و مەرجەعەکان، تا دوایین ئەم ناوانە. بەم مانایە بۆمان هەیە ناو لە زۆربەی موسڵمانان بنێین عەلمانی. بەڵام عەلمانیەت لە تێگەیشتنی هاوچەرخدا مانایەکی تر هەڵدەگرێ، بریتییە لەوەی (بەشێك لە ژیانی مرۆیی دەکەوێتە دەرەوەی دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی). هەروەها بە مانای ئەوە دێت مافی بیرکردنەوە بە مرۆڤ بدرێت بێ کۆت و مەرج، بێ هیچ دەستەوەردانێکی پێشوەختەی هەر تێگەیشتنێك، ئەمەیان (بیرکردنەوەیەکی ڕێژەییە لەسەر ئەوەی ڕێژییە نەوەك ڕەهایە). عەلمانیەکان پێیان وایە پێویستی هزری ئاینی لە سیاسەت جیا بکرێتەوە، نەوەك ئاین لە سیاسەت، بەو مانایەی ئازادی بە عەقڵ بدرێ لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیان دوور لە تێگەیشتنی

مرۆیی بۆ دەقی ئاینی، ئەمەش عەلمانیەكان نابورێ لە دەستگرتن بە ڕەوشت و چاكە لە كارە سیاسییەكەیان، كە لە هەندێك بنچینەیدا بۆ ئایین دەگەڕێتەوە. ئایا بەم مانایە عەلمانیەت تاوانێكە مرۆڤ لەسەر سزا دەدرێت؟ ئایا مرۆڤ مافی بیركردنەوەی نییە دوور لە كۆت و بەندەكانی دەسەڵاتی ئاینی؟ ئایا بەهەمان شێوە مافی ئەوەشی نییە گومانی لە هەر پرسێك هەبێت تا دەیسەلمێنێت؟

## عەلمانیەكان و كوفر :

ئەوەی دەیەوێ وەسفی عەلمانیەكان بە كوفر بكات، ئەوا هێشتا لە مانای عەلمانیەت نەگەیشتووە، یان لەوانەیە بە هەڵە لێی تێبگات. هەر كەسێك بە ئاینەوە سەرقاڵ نەبێ مەرج نییە مولحید یان كافر بێ، هەر كەسێكیش كە ڕێز لە عەقڵ دەگرێ و پێی وایە سەرچاوەیەكە بۆ زانین و ڕاستی و دادگەری و خێر و جگە لەمانەش لە چاكەكان، بە كافر دانانرێ. ئەگەر هەندێك لە عەلمانیەكان مولحید بن، ئەوا كێشەی خۆیانە، مافی ئەوانە نییە كە بە ئاینەوە سەرقاڵن هەموو عەلمانیەكان بە مولحید وەسف بكەن. لێرەدا عەلمانی باوەڕدار هەن، سەرقاڵی كاروباری ئایین نین، بەڵام نكۆڵی لە ئایین ناكەن، نكۆڵی لە ڕەوشتیش ناكەن كە سەرچاوەی لە ئایین گرتووە. هەموو كێشەی ئەوان ئەوەیە كە بە ئاینەوە سەرقاڵ نین و قبوڵی دەسەڵاتی ئەوانەش ناكەن بەسەر خۆیاندا كە بە ئاینەوە سەرقاڵن.

لەوانەیە بەشێكی مەزن لە ناكۆكی نێوان پیاوانی ئاینی و عەلمانیەكان، بگەڕێتەوە بۆ بڕوای پیاوانی ئاینی بەوەی حەقیقەت قۆرخ دەكەن، مافی ئەوەیان هەیە دەسەڵاتیان هەبێ بە هەر شێوەیەك بێ، چونكە ئەوان جێنشینی خوان لەسەر زەوی و توانادارترن لە جێبەجێكردنی شەریعە ڕاستەكەی، عەلمانیەكانیش

دان بـەم مافـەدا نـانێن. ئەمـە بنچـینەی ململانێـی نێـوان پیـاوانی ئـاینی و عەلمانیەکانە، بۆ ئـەوەی ڕزگارمـان بـبێ لێـی، پێویسـتە هـەمووان واز لـە بیرۆکـەی قۆرخ کردنی حەقیقەت بهێنن.

## ئایا ئایین چارەسەرە؟

عەلمانیەکان باوەڕیان نییـە بـە دروشمـی (ئـایین چارەسـەرە)، لەبـەر ئـەوەی یەك ئیسلام و یەك مەسیحییەت و یەك یەهودیەت و یەك بوزیەت بوونیان نییە، هەر ئاینێك لەم ئاینانە چەند مەزهەبێکی هەیـە، هـەر مەزهـەبێکیش بانگەشـەی ئەوە دەکات حەقیقەت لای ئەوە.کەواتە دروشمـی ئـەوەی (ئیسـلام چارەسـەرە) بـە ڕەتکراوە دادەنرێ لەلایەن عەلمانیەکانەوە، چونکە پێیان وایـە ئیسـلام ژمارەیـە ك لە مەزهەبی تێدایە، هەر یەکێکیان بانگەشـەی قـۆرخکردنی حەقیقـەت بـۆ خـۆی دەکات، ئایا کامە لەم مەزهەبانە دەکـرێ کۆمەڵگە بـەڕێوە ببـات و چارەسـەری بـۆ دابنـرێ؟، سـەرباری ئەمـە هـەر مەزهـەبێك چـەندین ئاڕاسـتەی دژیـەکی تێدایـە، هەندێك جار ئەم ئاڕاستانە ململانێ و شەڕیش دەکەن لەگەڵ یەکتری، زۆر جـاران هەنـدێك هەنـدێکی تریـان کـافر دەکـەن. دروشمـی (ئیسـلام چارەسـەرە) لـە دیـدی ئەوانـدا بـە دروشمێکـی نـا واقیعـی دادەنـرێ، بـەڵام بڵاوبوونەوەیـەکی فراوانـی بەخۆیەوە بینی لە نێو خەڵکدا، چونکە هەستی خۆشەویستی خەڵك دەوروژێنێ بۆ ئیسلام و پێغەمبەر و هاوەڵانی و خانەوادەکەی، کۆمەڵـە سیاسـییە ئیسـلامییەکان ئەمە بەچاکی دەزانن.

لەبەر ئەوەی واقیعی ئاینی باو لە کۆمەڵگەکەمان شیاو نییە بۆ بەڕێوەبردنی سیسـتەمێکی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و ڕۆشـنبیری و ئـابووری، کـە خزمـەتی

بەرژەوەندی هەمووان بكات، هەر بۆیە سیستەمی سیاسی عەلمانی[٢] كە هەموو چینەكانی كۆمەڵگە كۆ دەكاتەوە و مافەكانیان دەپارێزێ ئەمە چارەسەرە. هەر بۆیە وردترین پێناسە بۆ عەلمانیەت لە دیدی مندا بریتییە لەوەی سادق جەلال ئەلعەزم پێشكەشی كردووە، تیایدا هاتووە: ((بێگومان عەلمانیەت بریتییە بێ لایەنی ئەرێنی دەوڵەت و دام و دەزگا و دامەزراوەكانی بەرامبەر ئایین و تاقم و رێباز و چین و توێژەكان، كە كۆمەڵگەی پەیوەندیداری لێ پێكهاتوون)). بەپێی ئەم پێناسەیە رۆڵی حكومەتە عەلمانیەكان بریتی دەبێ لە دابینكردنی خزمەتگوزاری و خۆشگوزاری بۆ تاكەكانی گەل بە تاقم و مەزهەب و چینەكانەوە بێ جیاوازی، ئەركی نییە هیچ هزرێكی ئاینی پێشكەش بكات، بەڵكو ئەمە بەجێدەهێڵرێ بۆ دەمەزراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی، بە دامەزراوە جیاوازە ئاینیەكانیشەوە. بەمەش روون دەبێتەوە عەلمانیەت ئایین لە كۆمەڵگە جیا ناكاتەوە، بەڵكو لە حوكمەت جیای دەكاتەوە.

---

(٢) پێم وایە نووسەر بە هەڵەدا چووە، بەڵكو سیستەمی سیاسی مەدەنی دەستەبەری ئەمە دەكات نەوەك عەلمانی. (وەرگێڕ).

# موسڵمانان بەندكراوی مێژوون

## بەندكراوانی مێژوو :

لەوانەیە هیچ گەلێك بێ مێژووی خۆێ نەبێ كە لەبەری بكات و پێی كاریگەر بێ، بەڵام هەندێك لەم گەلانە خۆیان ئازاد دەكەن لە ڕووداوەكانی مێژوو، هەندێكی تر خۆیان پێوە دەبەستنەوە، هەر چەندە ئەم مێژووە كۆن بێ، زۆربەی ئەو ڕووداوانەی مێژوو كە زاڵن بەسەر گەلانـدا، ئـەوا بـە ئاینـەوە یـان بەبەشێكی ئاینەوە پەیوەستن، ئەمە سەبارەت بە موسڵمانان ڕوویـدا، ئەوانـەی مێژوو زیـاتر حوكمیان لێدەكات زیاتر لەوەی ئەوان حوكم لـە ڕووداوەكـانی ئـەمڕۆ و ئاینـدەیان دەكەن، ئەوان بەندكراوی مێژوون.

موسڵمانان سورن لەسەر شكۆدار گرتنـی كەسایەتیەكانی مێژوو، زۆربـەی جاران ئەوانە كەسایەتی ئاینین، زۆربەشیان ئەو كەسایەتیانەن جـەنگ و شـەڕیان كـردووە لـە دژی كەسـانی بەرامبـەر، كـە بـە كـافر دادەنرێـت، هـەر بۆیـە ئێمـە دەناڵێنین لە گرێ كوێرەی كەسی بەرامبەر، گرێ كوێرەیەكە لـە مێژووی خۆمـان بۆمان ماوەتـەوە. موسڵمانان زیـاتر وێڵ و سەرگەردان دەبـن كاتێـك كەسـایەتییە موسڵمانەكانی مێژوو لەگەڵ یەكتر دەجەنگن، بەتایبەت كە لە تێڕوانینـی ئەوانـدا ئەوانە كەسایەتی پیرۆزن، چۆن بۆ كەسی پیرۆز هەیە كەسێكی تری پیرۆز بكوژێ؟ ئـەم مێـژووە تـێكگیراوە بـە قورسـایی خـۆی بـاڵی كێشـاوە بەسـەر ئێسـتای چەقبەستوودا، زۆربەی جاران ئەم مێژووە هۆكارێك بووە بۆ دروستكردنی ناكۆكی و ململانـێ لـە نێـوان پشـتیوانانی كەسـایەتییەكی مێـژووی لەگـەڵ پشـتیوانانی كەسایەتیەكی دیكەی مێژوویی، هەر یەكێك لە دوو لایەنەكە لە مێژووی ڕابردوودا

دەژیەت و ئێستا تەنها بە درێـژبووەوەی ئـەوە دەبـینێ کە لـە مێـژوودا ڕوویـداوە، ئەگەر زەید لەگەڵ عەمر پێش (١٤٠٠) ململانێیان کردبێ، ئەوا لەسەر پشتیوانانی زەیدە ئەمڕۆ شەڕ بکات لەگەڵ پشتیوانانی عەمر!!

## چیرۆکێکی سەرەنجڕاکێش:

دکتۆر عەلی وەردی لـە کتێبەکەیدا (گاڵتـەجاری عـەقڵی مـرۆڤ) چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشی هێنـاوە، ئەمـە ڕوویـداوە کاتێـك سـەرەدانێکی کـردووە بـۆ شـەقامی عەرەبی لە شاری دیترویت لە ئەمریکا، ئێمەش چۆن ئەو نووسیویەتی بەو شێوەیە بۆتان دەگوازینەوە، دەڵێت: ((سەرم سوڕما کاتێك ناکۆکییەکی توندم بینی لێرەو لـەوێ جـار جـار هەڵدەگیرسـا لـە نێـو موسـڵمانانـدا، لـە بـارەی عـەلی و عومـەر، تووڕەییـەکان گـرژ ببـوون و ڕق و قینـە بڵـاوببووەوە. منـیش لەگـەڵ یـەکێك لـە ئەمریکییـەکان قسـەم دەکـرد لـەبارەی ئـەم ناکۆکییـە گەوجانەیـە. ئەمریکییەکـە پرسیاری لێکردم لەبارەی عەلی و عومەر: ئایا ئێستا ئەوان کێبڕکێ دەکەن لەسـەر سـەرۆکایەتی حکومـەت لـەلای ئێـوە، هـەروەك "تـرومن" و "دیـوی" لـەلای ئێمـە کێبڕکێ دەکەن؟ منیش پێم وت: عەلی و عومەر لە حیجاز دەژیـان پـێش هـەزار و سێ سەد ساڵ، ئەم ناکۆکییەی ئێستا لەبارەی ئەوەیە کامەیان شایستەتر بـووە بـە جێنشینایەتی و خەلافەت! کابرای ئەمریکی لەهەمبەر وەڵامەکەم پێکەنی، خەریك بوو ڕاکشێت ئەوەندە پێکەنی. منیش لەگەڵی پێکەنیم، پێکەنینێك مانای گریـانی تێدایە. ئەوەش کە مایەی پێکەنینە ئاشوبەکەیە!)).

ئەم چیرۆکە زۆر جار لە ژیانی ڕۆژانەماندا دووبارە دەبێتەوە، هەر یـەکێك لە ئێمە بینیویەتی یان بەشداربووە لە ناکۆکیەکی لەو جۆرە، کە ئێستامان لـەبیر

دەباتـەوە و بەندیخانەکـەمان لـە مێـژوودا قـوڵتر دەکاتـەوە. هـەر بۆیـە زیـادەڕەوی ناکەم ئەگەر بڵێم زۆرێك لە ناکۆکییەکانمان ئەمڕۆ هۆکارەکـەی مێـژووی پڕاوپـڕە لە جەنگ و نـاکۆکی و پیلانگێـڕی، کـە تـەنها لەگـەڵ نـا موسـڵمان نـەبووە، بـەڵکو لەگـەڵ خـودی موسـڵمانان بـووە، زۆر جـاریش لــە نێـوان سـەرکردە و ڕێبــەرە موسڵمانەکاندا بووە، ئەوانەی وا تەماشایان دەکرا پیرۆز بن.

## بەندیخانەی مێژوو و بیرکردنەوەی زانستی:

دکتۆر فوئاد زەکەریا لە کتێبەکەیدا (بیرکردنەوەی زانستی) پێی وایە ملکەچ بوون بۆ دەسەڵات، بە دەسەڵاتی مێژوو و پیاوەکانیـەوە، پەیوەسـتە بـە پەیوەنـدی مشتومڕ ئامێز لەگـەڵ بیرکردنـەوەی زانسـتی، دەکـرێ ببێتـە هۆکـاری پەکخسـتنی بیرکردنەوەی زانستی یان ببێتە دەرەنجامی.

دکتۆر فوئاد زەکەریا پێی وایە ئەوەی خەڵك پێیان وایە دروسـتن، لـە هـزرە کۆنەکان و باڵادەستتر بوونیان بەسەر هزرە هاوچەرخەکان، ئەوا هەڵەیەکی مەزنە (چونکە پێشینان وەك ئێمە مـرۆڤ بوونـە، ئاسایی بـووە دووچاری ڕاسـت و هەڵـە ببنـەوە)، لەبـەر ئـەوەی (کـۆنی بۆچـوون پێویسـت نییـە بـە بەڵگـەی ڕاسـتیەکەی دابنـدرێ، مرۆڤایەتی هەزاران ساڵ ژیاون لەسەر چەند هەڵەیەك، کە بـوێری ئـەوە نەدەکرا تاوتوێ بکرێن، چونکە دەگەڕانـەوە بـۆ سـەردەمانی باووبـاپیرانی سـەرەتا، لەگەڵ ئەمەشدا هەڵەکەی بۆ دەرکەوتوو کاتێك بیرمەندێك دەرکەوتووە، کە توانای تەحەدداکردنی دەسەڵاتی کۆنی هەبووە). بەمەش ڕوون دەبێتەوە ملکەچبوون بـۆ دەسەڵاتی کۆن سەردەکێشێ بۆ پەکخستنی بیرکردنەوەی زانستی و لەکارخستنی لە

جێبەجێکردنی ئەرکەکەی لـە بەرزکردنـەوە و گەشـەپێدانی کۆمەڵگەکان و چاك کردنی ژیان و گوزەرانی خەڵك.

هۆکاری شاراوەی پاڵ بـەپیرۆزگرتنی کۆن، بـەپێی بۆچوونی دکتـۆر فوئـاد زەکەریا، بریتییە لەوەی: ((مرۆڤ، ئەگەر بە ئێستای خۆی دڵی تەنگ بێ، یان خۆی بەدەستەوەسان ببینێ لە چەسپاندنی بوونی خۆی لە ئێستادا، ڕابردوو بۆیە دەکات بە بۆیەیەکی زێڕین، دەیکاتە پەناگەیـەك و پـەنای پـێ دەگرێـت))، زیـاتر دەڵێـت: ((لە واقیعدا حەز کردن بە دەستگرتن بە دەسـەڵاتی پێشینانەوە لـەو سـەردەمانی چەقبەستوویی و پشت لە نوێسازی کردن زیاد دەبێ، ناکرێ بوترێ ئەمە حەزێکی سروشـتییە لـە عـەقڵی مرۆییـدا)). لەوانەیـە ئەمـە دۆخـی کۆمەڵگـە عـەرەبی و ئیسلامییەکان بێ، کە دەستەوەسانە لـە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی ئێسـتا، بۆیـە پـەنای برد بۆ بەپیرۆزگرتنی ڕابردوو تا ئاستێك، کە تیایدا بوومتە بەنـدکراوی مێـژوو و پیاوەکانی، هیچ ئازادیەك بەدی ناکات.

## عێراقیەکان لە بەندیخانەی مێژوودا:

ئەگەر بمانەوێ گەواهی بە نموونەیەك بێنینەوە لەسەر ئەندازەی کاریگەری مێژوو لەسەر واقیعەکەمان، ئەوا چاکتر نییـە لـەو نموونەیـەی واقیعـی هەنوکـەی عێراق پێشکەش بکەین. لە دوای ڕووداوی تەقینەوەی دووەمی گڵکۆی سامەڕا، کـە لای شیعەکان پیرۆزە، لـە (حـوزەیرانی ٢٠٠٧) پێشـبینی کـراو بـوو، کاردانـەوەکانی شیعە بەرامبەر پیرۆزییەکانی سوننە توونـد بێـت، پیـاوانی ئـاینی شـیعە و سـوننە هەوڵیانـدا بارودۆخـەکان ئاسـایی بکەنـەوە، بـە دەرکردنـی چـەند بەیاننامەیـەك، تیایـدا داوای هێوربوونــەوە و ئارامگریــان دەکــرد لەلایــەن شـیعەوە، بەیاننامــەی

شەرمەزارکردنی ئەم کارە لەلایەن سوننەوە دەرچوو، بەڵام ئەمە ڕێگری نەکرد لە هەڵسانی شیعە بە ڕووخاندنی پیرۆزییەکانی سوننە کە لە ناوچەکانی شیعەنشیندا هەبوون. هەندێك پرسیار دەکەن بۆچی شیعە وەڵامی ئەو بەیاننامانەی هێور کردنەوەیان نەدایەوە، کە زاناکانی ئەوان دەریان کردبوو؟ بە تێڕوانینی من وەڵامەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شیعە بەندکراوی مێژووون، ئەوەی کە زاناکانیان بۆیان گێڕاوەتەوە، شیعە ساڵانە یادی ڕووداوەکانی کوژرانی پێشەواکانیان دەکەنەوە لەسەر دەستی پیاوانێك، کە سوننەکان بەپیرۆزیان دەگرن و بە پایەداریان دەکەن، ئەمەش وێنای ئەوەی لای شیعە کردووە کە سوننە دەیانەوێ ئەوان بکوژن، وەك چۆن پێشینانیان ئەمەیان کردووە لەگەڵ پێشەواکانیان. شایەنی باسە هاووێنەی ئەم ڕووداوە مێژووییانە، ئەو کەسانە نەیانخوێندۆتەوە کە گڵکۆ و مەرقەدەکانی سوننەیان تەقاندۆتەوە، بەڵکو لە پیاوە ئاینیەکانیان بیستویانە، کەلتوری خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و تێگەیشتن لە ڕووداوەکان لە چوارچێوە و بارودۆخە مێژووییەکەیدا، نەگەیشتۆتە عەقڵی زۆرێك لە موسڵمانان. کەلتوری بیستن باو و زاڵە، ئەمەش یارمەتیدەر دەبێ لەسەر مانەوە لە بەندیخانەی مێژوودا.

پیاوانی ئاینی شیعە شوێنکەوتووانیان بارگاوی (شەحن) دەکەن بە ئاگری بوغز و قین دژی سوننە بە درێژایی ساڵ و لە گشت بۆنەیەکدا، کاتێك ناکۆکیەکە گەرم دەبێ و دروونەکان دەکوڵێن بەهۆی ڕووداوێکەوە، وەك ڕووداوی تەقاندنەوەی گڵکۆی سامەڕا، هەڵدەستن بە دەرکردنی بەیاننامەی ئارامکردنەوە و هێورکردنەوە!! هاوشێوەی ئەم بەیاننامانە لە توانایاندا نییە عەقڵی خەڵك

بگێڕنـەوە جێـی خۆیـان لـە کـاتی تورەییانـدا، ئـەوەی وتارەکـان تێکیـان داوە، بەیاننامەکان چاکی ناکەنەوە.

شایەنی باسە، ئەوەی پیاوانی ئاینی شیعە دەکەن، پیـاوانی ئـاینی سوننەش دەکەن، ئەوانیش بەهەمان شێوە خەڵکی بارگاوی دەکەن بە ڕق بوونەوە لە شیعە و بیروباوەڕەکـەیان، لەمەشـدا پشـت دەبەسـتن بـە ڕووداوەکـانی مێـژوو، تـا شوێنکەوتووانیان لە بەندیخانەی مێژوودا بهێڵنەوە، کە زاڵدەبێ بەسەر ئێستایان و ئایندەشیان ڕەت دەکاتەوە. ئـەوەی ڕوویـداوە و ئێسـتا ڕوودەدات و ئـەوەش کـە لـە ئایندەدا ڕوودەدات لە ناکۆکی نێوان موسڵمانان بە جۆر و ئاسـتە جیاوازەکانیـەوە، ئەوا کار دەکات لەسـەر ڕووخانـدنی ئێسـتایان، ئـەوان لـە مێـژوودا سـەرقاڵن، هـیچ خەیاڵێکیان نییە جگەلە سەلماندنی شایستەتربوونی کەسانێك، کە پـێش چـەندین سەدە شەڕیان کردووە.

## پیرۆزەکان و بەندیخانەی مێژوو:

بە ڕاستی ئەمە گاڵتەجارییە، موسڵمانان ململانێ دەکەن لە پێناو کەسانێك، کە شەڕ یان ڕاجیاییان هەبووە پێش چەندین سەدەی دوور و درێژ، بێ ئەوەی بیر بکەنەوە لە شوێنەوارە نەرێنیەکانی ململانێی مێژوویی لەسەر ئێستایان. بەڕاستی ئێمە بەندکراوی مێژووین، ئێستا و ئایندەمان نابێ مادەم لەم بەندیخانەیە خۆمان ڕزگار نەکەین، ئاسان نییە خۆمان ڕزگار بکەین لە بەندیخانەی مێژوو، تا عەقڵمان ڕزگار نەکەین لە بەندیخانەی پیرۆزی لە مێژوودا.

لەوانەیە گونجاو بێ بڵێین بڕوابوونمان بە پیرۆزی ململانێکاران لـە میانـەی مێژوودا، ئەو شتەبێ کە پاڵمان پێوە بنێ بۆ مانـەوە لـەم بەندیخانـەدا، هـەر بۆیـە

سەرەتا لەسەرمان پێویستە بزانین ئەوانەی ململانێیان کردووە لە نێوان خۆیاندا، تەنها کەسانێکی ئاسایی بوون، لەوانەیە پێیان وابووە ئەوەی دەیکەن ڕاستە و خزمەتی بیروباوەڕەکەیان دەکات، ئەوەی پەیوەستە بە ناکۆکییەکانیان ئەمڕۆ هیچ پەیوەندیەکی بەئێمەوە نییە، گرنگ نییە لەلامان کامەیان لەسەر حەق و ڕاستی بووە و کامەشیان لەسەر هەڵە بووە، چونکە ئەمە بڕیار نادات لەسەر ئەوەی کامەمان لەسەر حەقە و کامەشمان ناحەقە، شوێنکەوتووانی ڕاسترەوان لە مێژوودا مەرج نییە ئەمڕۆ ڕاست بن. ئێمە پێویستمان بەوەیە خۆمان ڕزگار بکەین لە پیرۆزی پیاوانی مێژوو و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین بەوشێوەیەی کە ئەوان کەسانی ئاسایین، ئەمە ڕێگەمانە بۆ ڕزگاربوون لە بەندیخانەی مێژوو.

# مزگەوتە هاندەرەکان

## ڕۆڵی مزگەوتەکان:

لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەم ئەگەر بڵێم، مزگەوتەکان چیتر ئەو دامەزراوە ئاینیە نین، کار بکەن لەسەر ڕێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و خێزانیەکان، بەپێی بنەماکانی خۆشەویستی و لێبوردەیی و ڕەحمەت، هەروەك پێشتر ناسراو بوو، بەڵکو بووەتە ناوەندێك بۆ هاندان و ئاشوب هەڵگیرساندن، زیاتر بە ڕۆڵی هاندان هەڵدەستێت لەوەی بە ڕۆڵی ڕێکخستن هەڵبستێت، هۆکاری ئەمەش لە دیدی ئێمەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سەرپەرشتیارانی ئەمڕۆی مزگەوت، بانگەشەی ئەوە بۆ خۆیان دەکەن کە حەقیقەتیان قۆرخ کردووە و بەو شێوەیەش دەیدەن بە شوێنکەوتووانیان لەوانەی دێنە مزگەوت، دواتر داوای ئەوە دەکەن بە ڕۆڵی چاکەکاری ڕێنیشاندەر هەڵبستن، پێش ئەوەی خۆیان چاك یان ڕێنوێنی بکەن. بەم ئایەتانەش ئاشنا نین، وەك:﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾ الكافرون: ٦ واتە: ("کەواتە" دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم). ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ۝٥٦ ﴾ القصص: ٥٦ واتە: (بەڕاستی ئەی پێغەمبەر "درود و سڵاوی خوای لێبێ" تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ئیمانی پێدەبەخشێت). ﴿ وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا ۝٢٩ ﴾ الكهف: ٢٩. واتە: (جا ئەوەی

دەیەوێت یا باوەڕ بهێنێت و ئەوەی نایەوێت یا کافرو بێ باوەڕ بێت). بەڵكو وتەكانی تر دەناسن وەك: (هەر كەسێك خراپەیەكی بینی ئەوا با بەدەستی بیگۆڕێت)، (بجەنگن لەگەڵ خەڵك، تا دەڵێن هیچ خوایەك نییە بە حەق جگە لە خوای مەزن نەبێ). بەهۆ گشت ئەمەوە دەبینین ئەوانەی دێنە مزگەوت بە بەردەوامی، زۆربەی جاران كەسی توونـدڕەون و بانگخوازی قۆرخ كردنی حەقیقەتن، لەوانەیە ئەمە لەسەر گشت مزگەوتێك جێبەجێ نەبێ، لەوانەیە مزگەوتی وا هەبن بە ڕۆڵی پەروەردەیی و كۆمەڵایەتی باش هەڵبستن، بەڵام بە داخەوە كەمن و ڕۆڵیان بە بەردەوامی كەم دەبێتەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ بەرامبەر فراوانبوون و بڵاوبوونەوەی مزگەوتە هاندەرەكان.

## تێكدانی كۆمەڵگە و خێزان:

ئەوەی خەڵك دووچاری دەبن لە ونبوونی عەقڵ و بیركردنەوە، ڕەتكردنەوەی خۆشەویستی و لێبوردەییە، هاندانە بۆ توونـد و تیژی و دەستدرێژی، لەلایەن پیاوانی ئاینیەوە، ئەوەی كە ناوی دەنێین هێرشی هاندانی ئاینی، دەبێ دەرەنجامەكەی تێكچوونی خێزان و بڵاوبوونەوەی دوژمنكاری و توڕەیی بێ لە نێوان تاكەكانی یەك كۆمەڵگە.

دكتۆر مەحمود تهامی لە گۆڤاری (روز ئەلیوسف) لە ژمارە (٤١١٩)، كە لە مێژووی (٥/ ٧ ٢٠٠٧) دەرچوووە، وتارێكی نووسیوە بەناویشانی (ئەوانەی ماڵەكانیان بە دەستی خۆیان دەڕوخێنن)، تیایدا هاتووە: ((جارێكیان ئامادەبووم لە نوێژی هەینی لە مزگەوتێكدا، كە پێشتر نەچووبوم بۆ ئەوێ، بە ڕێكەوت منیش لەوێ بووم، وتاربێژەكە بۆ ماوەی زیاتر لە پەنجا خولەك خەڵكی لە مزگەوتدا هێشتەوە

و قسەی کرد لەسەر هاندانی مۆسڵمانان لە تێکۆشان دژی گەندەڵی ڕەوشتی، کە لە وڵاتـدا بڵاوبووتـەوە، هانـدانی بـاوان و پیـاوان لـە دژی بـەڕەڵایی کـچ و ژنـەکانیان، ((ملی کچ دەشکێنم ئەگەر تەمەنی دوازدە ساڵ بێ و دەری بخات))، زۆر قسەی لەم جۆرەی کرد، هەموو قسەکانی هاندان بوو لەسـەر لێـدان و بەنـدکردن و سـزادان و قەدەغە کردنی تەلەفزیۆنی ((گاڵتەجار)) و فیلمـە ((لەناوبـەرەکان)) و داپۆشـینی شەرمگەی ئافرەت کە هـەموو جەسـتەی دەگرێتـەوە. دکتـۆر تهامی زیـاتر دەڵێـت: ((لە ڕاستیدا من سەرم سوڕما لەو وتاربێژەی ئەم وتانەی دەوت، لەو خەڵکەش کـە خۆیـان بەدەسـتەوەدابوو بـۆ گـوێگرتن لێـی، منـیش یـەکێك بـووم لـەوان، لەگـەڵ خەڵکی چوومە دەرەوە و لە جۆرێـك لـە ڕق و کینـەم لـە دڵـدابوو، بـەڵێ هەنـدێك ڕۆیشتنەماڵەوە تا لە ژن و کچەکانیان بدەن، هەندێکیشیان ئامادەن بۆ ئـەم کـارە، بە پێـی فـەتوای وتاربێـژی هـەینی. ئـا بـەم شێوەیە نوێـژی هـەینی بـووە شـوێنی هاندانی ناخەکان و بارگاوی کردنیان نەوەك هێور کردنەوەی دڵ و دەروونـەکان و چارەسـەرکردنی فشارە دەروونیـەکانی ژیـان، ڕێنـوێنی کردنـی خـەڵك بـۆ ڕێگـەی ڕاستی چارەسەری کێشەکانیان)).

## فیلمی (( دەرگا داخراوەکان )):

پرسی دەستەوەردانی نەرێنی پیاوانی ئاینی لە کۆمەڵگەدا، لەلایەن سینەمای میسـرییەوە لـە هەنـدێك لـە فیلمەکانیـدا ئامـاژەی پێـدراوە، ڕوونتریـن فـیلم لـەم لایەنـەدا فیلمـی ((دەرگـا داخراوەکانـە)). چیرۆکی فیلمەکـە لەسـەر گەنجێکـە لـە سـەرەتای هەرزەکاریدایـە، لەگـەڵ دایکـی لـە گـەڕەکێکی هـەژاردا دەژیـت، بـاوکی مـردووە، دایکـی وەك خزمـەتکاری ماڵـان کـار دەکـات. کوڕەکـە بـەردەوام دەچێتە

مزگەوتی گەڕەکەکە بـە مەبەستی وەرگرتنـی وانـەی بـەهێزکردن لـە بابەتـەکانی قوتابخانەدا، بەهۆی نەبوونی توانای دارایـی بـۆ خوێنـدنی وانـەی تایبـەت. بـەپێی دیدی فیلمەکە، ئەم وانانە لە مزگەوتدا هەنگاوی بەرایین بۆ ڕاوکردنی هەرزەکاران بە مەبەستی ڕاکێشانیان بۆ کۆمەڵانی ئیسلامی توندڕەو.

یـەکێك لـە دیمەنـە گرنگـەکانی ئـەم فیلمـە بریتییـە لـە دیمـەنی ڕووبـەڕوو بوونەوەی کوڕ و دایکەکە، کاتێك داوا لە دایکی دەکات لەچکی بکات و ڕێگەی بەرەو خوا بگرێتەبەر، هەروەها داوای لێ دەکات نەچێتە دەرەوە بـۆ کـار، چونکه ئەمـە دژی ئەوەیە کە لە قورئاندا هاتووە:﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ ﴾ الأحزاب: ٣٣

واتە: (ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر "درود و سڵاوی خوای لێبێ" لـە ماڵـەکانی خۆتانـدا بـە سـەنگینی و سـەلاری بسرەوون). ئەگـەر دایکـی ڕێنماییـەکانی قورئـان بەرجەستە نەکات، ئەوا بـەبێ بـاوەڕ هـەژمار دەکرێ. ئـەم ئاسـتە لـە تێگەیشتنی هەڵە، کـە کوڕەکە پێـی گەیشت، بـەهۆی ئـەو ڕێنمایانەوەیـە کـە وەریگرتـووە لـە شێخی مزگەوتەوە، کە باسی ئاشوبی ئافرەتە لاسار و بەڕەڵا و ڕووت و قوت و جل تەنك و تەسکەکانی بۆ کوڕەکە و برادەکانی دەکـرد، کـە سەرپێچی ڕێنماییـەکانی خـوا دەکـەن، لـە ئـایین دەرچـووینە، هۆکـاری ئـەو خەیاڵانـەن کـە هەرزەکارەکـە دەیانبینێ لە خەونیـدا و حـەزە سێکسیەکەی کـە دەسـتی کـردووە بـە گەشـەکردن تیایـدا. فیلمەکـە کۆتـایی دێـت بــە تـاوانی کـوژرانی دایکەکـە لەلایـەن کـوڕە هەرزەکارەکەی، دوای ئەوەی هەستی گومان لە ناخیدا گەشە دەکات بەرامبەر گشت

ئافرەتان و لەوانەش دایكی، كە پێی وابووە پەیوەندیەكی ناڕەوای هەیە لەگەڵ مامۆستاكەی.

## برایەتی لە دیدی پیاوانی ئاینیدا:

هەندێك لە پیاوانی ئاینی، یان زۆربەیان، داننانێن بە برایەتی نێوان مرۆڤەكاندا، مادەم فرە ئاینی و ڕا و بۆچوونی جیاواز هەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەی پێیان وایە سەرچاوەی برایەتی ئیمان و باوەڕە، یان بە گوزارشتێكی وردتر ڕێكەوتن بە ئیمانە، ئەگەر لەگەڵ ڕێك بكەوی لە ئیماندا، ئەوا تۆ برای منی، بەڵام ئەگەر جیاواز بی لەگەڵم ئەوا دوژمنی منی، برایەتی پەیوەندی نییە بە خزمایەتی یان ڕەچەڵەك یاخود مرۆڤایەتیەوە، بەڵگە بەم ئایەتە قورئانیە دێننەوە: [إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ] الحجرات: ١٠. واتە: (لەڕاستیدا هەر ئیمانداران برای یەكن). بۆ چەسپاندنی ئەم بۆچوونە، برایەتی لە دیدی ئەوان مەرجەكەی ئیمان و باوەڕە، (إنما) كە لە ئایەتەكەدا هاتووە بۆ كورت هەڵهێنانە، برایەتی كورت دەكاتەوە تەنها لە نێوان كۆمەڵەی باوەڕداران و ئەوانی تر ناگرێتەوە. تەنها پشت بەم ئایەتەش نابەستن بۆ وروژاندنی دوژمنایەتی لە نێوان گەلان یان لە نێوان تاكەكانی یەك كۆمەڵگە یان خێزان، بەڵكو پشت بەم ئایەتەش دەبەستن: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴿٢٩﴾﴾ الفتح: ٢٩ . واتە: (توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا). بۆ جیاكردنەوەی خۆیان، بەوەی ئەوان كۆمەڵەی باوەڕدارانن، لە جگە لە خۆیان لە دژەڕاكانیان، بەوەی ئەوان كۆمەڵەی بێ باوەڕانن، لەوانەیە ئەمە شرۆڤەی

دوژمنایەتی و کێشمەکێشی بەردەوامی نێوان ئەندامانی یەك خێزان دەکات، کە تاکەکانی لە بیروباوەڕ و بۆچوونەکانیان جیاوازە، نەریت وایە تاکە دیندارەکان سەرکردایەتی و ڕابەری ئەم کێشمەکێشانەی ناو خێزانەکانن.

یەکێك لە پیاوانی ئاینی لە وتاری هەینیدا دەڵێ، پێویستە دژایەتی ئەوانە بکرێ، کە دژەران لە هزر یان بۆچوون یاخود بیروباوەڕدا، ڕەخنە لەو بۆچوونە دەگرێ کە دەڵێ ڕاجیایی هیچ زیانێك بە خۆشەویستی ناگەیەنێ، لە وتارەکەیدا دەڵێت: ((هەندێك کەس بەشێك لە دێرە شیعرێك دەگوازنەوە، کە تیایدا هاتووە: "ڕاجیایی هیچ پەیوەندیەکی بە خۆشەویستیەوە نییە")) ئەمە ڕاست نییە، چونکە مەبەست لە ڕاجیایی، جیاوازی ئامانجە.. ئەگەر ئامانجی من نەبێ، چۆن خۆشم بوێ؟... ئەگەر ئامانجی لە هی تۆ جیاواز بوو چۆن خۆشت دەوێت؟.. دەشزانم ئامانجی من ڕاست و هی ئەویش پوچەڵە... ئامانجی من بۆ دواڕۆژە، ئامانجی ئەو دونیاییە.. ئامانجی ئەو نزمە، هی من بەرزە بە ویست و پشتیوانی خوا، جا چۆن خۆشم بوێت؟.. دەبێ هەست بەوە بکەم لەم دۆخەدا ئەو برای من نییە، بەڵکو دوژمنمە... ئەوان کۆمەڵەیەکن، ئێمەش کۆمەڵەیەکی تر... هەروەك لە هەندێك وتاری پێشوودا وتومە... ئەگەر چی لە یەك شوێندا بەیەکەوە بژین، یان لە ژێر یەك باندا بەیەکەوە بین... بەهەمان شێوە هی برایەکم نییە مەگەر براشم بێ لە ڕەچەڵەکدا... ئەو برام نییە لە باوەڕدا... هەر بۆیە لە داناییەوە وتراوە لەگەڵیان بە و لەوان مەبە... چۆن لەگەڵیان بم کاتێ لەگەڵ من ڕێك ناکەون لەو ئیمانەی سنووری ڕاستییە بۆ برایەتی لە ئیسلامدا؟)).

ئەمە بڕوای هەندێك لە پیاوە ئاینیەکانە، لە ئاینە جیاوازەکاندا، پێیان وایە ڕاستی و ڕێنوێنی و پشتیوانی خوایی لەواندا هەیە، پوچەڵی و گومڕایی و توڕەیی خوایی دەدەنە پاڵ جگە لە خۆیان، تەنها لەبەر ئەوەی لە بۆچووندا تەبا نین لەگەڵیان. بیرکردنەوەی دووانە، کە جیهان و خەڵك و پرسەکان بۆ دوانەی ڕاست و

نا ڕاست دابەش دەکات، زاڵە بەسەر بیرکردنەوەی پیاوانی ئاینی و وایان لێدەکات دوژمنایەتی دژمراکەیان بکەن، ئەگەر بڕوایان بە بوونی خاڵی ناوەندی هەبووبا لە نێوان ئەم دوانەییانەدا، لەگەڵ ئەوەی دەکرێ ڕاست لایی جگە لەوان بێ، یان بەلایەنی کەمەوە ئەوەی دەکرێ لەگەڵ دژمراکە بژیەن، ئەوا دەیانتوانی هانی برایەتی نێوان خەڵك بدەن، بەبێ ڕەچاوکردنی بیروباوەڕ و ئیمان و هزر و بۆچوونیان.

## ئەو ئافرەتانەی بە ئاشکرا تاوان دەکەن:

پرسی لەچکی وەك پرسەکانی تر دەقۆزرێتەوە، لە هاندانی موسڵمانان دژی یەکتر، ئەمە پیاوی ئاینیە پرسی لەچکی دەقۆزێتەوە و وەسفی دەکات بەوەی (گەورەترین و گرنگترین و گشتگیرترین کێشەیە لە کێشەکانی کۆمەڵگە و سەردەم) بۆ وروژاندن دژی ئەوانەی لەچك نابەستن و داوا دەکات پەیوەندیان لەگەڵ بپچڕێنن و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ نەکرێ و زیانیان پێ بگەیەنرێ و دروستە پاشملە باسیان بکرێ، چونکە تاوان بە ئاشکرا دەکەن، لە وتاری هەینیدا و بە ئامادەبوونی سەدان موسڵمان دەڵێت: ((ئەوەی بە ئاشکرا تاوان دەکات، ئەو تاکەیە کە هیچ ڕێگریەکی لا نەبێ لەوەی ئافرەت کار لەبەردەم خەڵك بکات... دەرەنجامەکەشی ئەوەیە بەریە لە خوا و پێغەمبەر، خوا و پێغەمبەریش لەو بەرین، ڕووی لە شەیتانە و پشتی لە خوای میهرەبانە، بە دڵنیاییەوە لە خەڵکی ئاگرە)). دواتر دوای ئەوەی گوێچکەکانی شەحن کردۆتەوە دژی ئەوەی تاوان بە ئاشکرا دەکات، زیاتر دەڵێت: ((یەکێك لە کردارەکانی ئەم بەرەڵایە، ئەوەیە هیچ ڕێگریەك نابینێ لە سوڕانەوە لە کۆمەڵگەدا بە پۆشاکە تەنکە سەرنجڕاکێشەکەی،

بـە ئاشـكرا تـاوان دەكـات، هـەموو ئـەو ئافرەتانـەی تـاوان دەكـەن بـە ئاشـكرا، بـە سروشتی دۆخەكە هیچ یەكێكیان لێ جیا ناكەمەوە.

ئەوەی شـارەزایە لـە شـەرعدا، ئـەوەی لـەلا ڕوونـە ئـەوەی تـاوان بـە ئاشـكرا دەكات هیچ پەیوەندیەكی بە ئیسلامەوە نییە، هەر بۆیە دروستە بە پاشملە باسی بكرێ، تەمبێ بكرێ، پێویستە پەیوەندی لەگەڵ بپچڕێنرێ، تەنها بە باسكردن یان بینینی، جەستە موچڕكەی پێدادێت. بە كرداری ئێستا لە كۆمەڵگەكەماندا ئافرەت ڕووت و قوت دەبێ، بە ئاشكرا گوناە دەكات، لەگـەڵ ئەمەشـدا خۆشمـان دەوێـت و پەیوەنـدی لەگـەڵ ناپچـڕێنین و هەڵسـوكەوتی لەگـەڵ دەكـەین و سـوودی پێدەگەیەنین و پێمان وادەبـێ هاوڕێمانـە لـە خوێنـدن یـان بازرگـانی یـاخود هـەر بەرژەوەندیەكی تردا. لەمەدا سەرزەنشت زیاتر ئافرەتە لەچكەكان دەگەرێتەوە لە پیاوان... لەوانەیە ئافرەت بەشێوەیەكی ڕێژەیی لەچك بێ و هیچ ڕێگریەكی نەبێ لە تێكەڵ بوون لەگەڵ ئـافرەتی بـەڕەڵا و كـاركردن لەگـەڵی و هاوڕێیـەتی كردنـی، لەچكەكە فەرمانی پێ ناكات بە چاكە و ڕێگری لێناكات لە خراپە، ئاماژە بەشتێك ناكات كـە دڵـی بـڕەنجێنێ یـان سـزای بـدات، سـەرباری پەیوەنـدی پچـڕاند یـان لـێ دووركەوتنەوەی، ئەمە چاوەڕوان نەكراوە لە لەچك، ئەگەر لەچكەكە ئەمەی كرد، ئەوا حەرامی خۆشویستووە و سزاكەشی لە دوارۆژدا هەمان سزای ئافرەتە ڕووتەكە دەبێ، چونكە مرۆڤ لەگەڵ ئەوە زیندوو دەكرێتەوە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەكرێ كـە خۆشـیدەوێ، لەچـكەكە ئافرەتـە ڕووتەكـەی خۆشـدەوێ، كەواتـە لەگـەڵ ئـەو زینـدوو دەكرێتەوە و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەكرێت).

ئـەم جـۆرە وتارانـە، هـەروەك ڕوون و دیـارە، هانـدان و وروژانـدن دەكەنـە پەیڕەو بۆ خۆیـان و خۆیـان دوورنـاگرن لـە بڵاوكرنـەوەی گیـانی دژایـەتی و ڕق و

كینە لە نێوان خەڵكدا، تەنها لەبەر ئەوەی لە بۆچووندا جیاوازن، بێ ڕەچاوكردنی بەرژەوەندی كۆمەڵگە، هەر بەهایەكی مرۆیی، كە دەكرێ خەڵك كۆ بكاتەوە و دڵەكانیان یەك بخات، تەنانەت ئەگەر ئەندامانی یەك ئاینیش بن. من یەكێك بووم لەوانەی دەرەنجامی ئەم وتارە هاندەرانەم بینی، كە زۆر لە نێو خەڵكدا بڵاوبووەوە بەتایبەت لە دامەزراوە فەرمییەكاندا، كە تیایدا تێكەڵاوی و ڕووت و قوتی (بەپێی دەربڕینی وتاربێژەكە) بڵاوببووەوە، لە نێویشیاندا دامەزراوە فێركارییەكان. لە زانكۆكانـدا هاوڕێیەتیـەكان گـۆڕان بـۆ دوژمنكارییـەكان، ئافرەتـە لەچـكەكە بـە كێشمەكێش هات لەگەڵ هاوڕێیەكەی كە لەچك نەبوو. قوتابیـان كـە پێیـان وابـوو هەموو ئافرەتە خوێندكارەكان دۆستی ئەوانن، بێ ڕوانینە ئەوەی لەچكیان لەسەرە یان نا، بوونە یـەكێك لەوانـەی دروشمـی پەیوەنـدی پچـڕاندنیان بـەرزكردەوە، بـە چاوی كەم و سوكایەتیەوە دەیانڕوانیە ئەوانەی لەچك نابەستن. ئەگەر قوتابیەكی لەچك نەبەستێت ویستی وانەیەك یان كتێبێـك لـە دۆسـتە لەچـكەكەی وەربگـرێ، ئەوا تەنها نكـۆڵی و بەرهەڵسـتی دەبـینێ. ئـەو لەچـك بەسـەرە وەڵامی بانگـەوازی پەیوەنـدی پچـڕاندنی نەداوەتـەوە، ئـەوا بـەخۆی دووچاری پەیوەنـدی پچـڕاندن بووەتــەوە، تۆمــەتبار دەكـرێ بــە پیلانگێــڕان دژی ئـایین، چـونكە یـەكێك نییـە لەوانەی فەرمان بە چاكە دەكەن و ڕێگری لـە خراپـە دەكـەن. بـە كـورتی زانكـۆ و دامـەزراوەكانی تـر بوونەتـە شـوێنێك بـۆ نـاكۆكی و ململانێكـان وتۆمـەت و تانـە گۆڕینەوە بە تاوان و سەرپێچی و دەرچوون لـە ئـایین و جگـە لەمانـەش، هـەموو ئەمـە بــە هــۆی وتــارێكی هانــدەری پیــاوێكی ئــاینی كــە پێــی وایــە حەقیقــەتی قۆرخكردووە و خاوەن سروشتێكی دوژمنكارانەیە.

## هۆشیار بن لە دینداری منداڵەکان:

لەوانەیە ئەمڕۆ لەسەر باوان پێویست بێ، چاودێری ئەو منداڵانەیان بکەن، کـە دەچـنە مزگەوتـەکان، دەبـێ سـوربن لەسـەر زانینـی هزرەکانیـان زیـاتر لـە منداڵەکانی تر. هەندێك مزگەوت وایان لێهاتووە منداڵەکان هان دەدەن دژی باوان، بـە پاسـاوی ئـەوەی سەرپێچـی ڕێنماییـەکانی ئـایین دەکـەن، گوێڕایـەڵی بـۆ بـەدیهێنراوێك نییـە کـە سەرپێچی بەدیهێنـەر بکـات. زۆر جـار دەبینـین منداڵـە دینـدارەکان دەنـاڵێنن بەدەسـت نـەگونجانی کۆمەڵایـەتی، گۆشـەگیر و کـەنارگیرن، ئەگەر توونـد و دوژمنکارانە نەبن. هەر بۆیە لەسەر باوان پێویستە لـە منداڵـە نـا دیندارەکانیان بترسن، بە ئەندازەی ترسانیان لـە منداڵـە دینـدارەکانیان، دینـداری بووەتـە هۆکارێـك بـۆ پڕکردنـی مێشـکی گـەنجان بـە چـەمکی دوژمنکاریانـە و قـۆرخکردنی حەقیقـەت، هـەروەها مێشـکیان پـڕ کـرد لـە کۆمـەڵێك لـە هـزری نـا واقیعی و لەوانەیە خەیاڵی و ئەفسانەیی بن. دینـداری لـە زۆر دۆخـدا و بـە وێنـە باوەکانی لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆماندا، گەنجان دەگۆڕێ بۆ نەخۆشییەکی دەروونی، کە ناتوانێ لەگـەڵ کۆمەڵگەکـەی بگـونجێ، ڕقـی لـە هـەمووان دەبێتـەوە، تەنانـەت لـە خۆیشی.

لەسـەر بـاوان پێویسـتە بـە دواداچـوون بکـەن بـۆ قۆناغـەکانی دینـداری منداڵەکان، بەهەمان ترس و بیم کە چاودێری لادانی منداڵـەکانیان دەکـەن، چیتر جیـاوازی زۆر نـەماوە، چـونکە هـەر دووکیـان دینـدار و لادەر توانـای گونجـانی کۆمەڵایەتیان لەدەستداوە. لەوانەیە زۆرێك لە وێنەکانی دینداری ئەمڕۆ گوزارشت بکەن لە لادانی کرداری، بۆیە پێویستە لەسەرمان جیاوازی بکەین لە نێوان ئەوەی لە ڕووی ڕەوشتیەوە پابەندە بە ئاینەوە، لەگەڵ ئەوەی پەیوەستە بە ڕێنماییەکانی

پیاوانی ئاینیەوە. ئەمە لەسەر باوانە بەدواداچوونی بۆ بکەن، زۆر دڵخۆش نەبن بەوەی منداڵەکانیان زۆر دەچنە مزگەوت، لەوانەیە ئەم مزگەوتانە ناوەندێکی هاندان بێ بۆ توندوتیژی، لەوانەیە سەرپەرشتیارانی مزگەوت لەو کەسانەبن کە بانگەشەی ئەوە بۆ خۆیان بکەن کە حەقیقەتیان قۆرخ کردووە، وەسفی ئەوانی تر دەکەن بە لاساری و تاوانکاری و لەوانەیە بە کوفر. لەسەر باوان پێویستە مزگەوتی گونجاو بۆ منداڵەکانیان هەڵبژێرن، وەك چۆن قوتابخانەی گونجاویان بۆ هەڵدەبژێرن، پیاوانی ئاینی لێبوردەیان بۆ دەستنیشان بکەن، وەك چۆن مامۆستای کۆڵنەدەری چەسپاوی بۆ دیاری دەکەن، قوتابخانەی شکست خواردوو، قوتابیەکانی بە شکستخواردووی دەردەچن، مزگەوتی توندڕەو، کەسەکانی تۆقێنەری بکوژیان لێ دەردەچێ.

لەوانەیە دیندار گەنجان بووبێتە مەترسی لەسەر وڵاتان، وەك لاساری گەنجان، هەردووکیان لادانن، لەوانەیە لاساری نەمێنێ لەگەڵ تەمەن پێگەیشتن، بەڵام دینداری هەڵە، لە ناخدا قوڵ دەبێتەوە و ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕەگ دادەکوتێ، لەوانەیە خاوەنەکەی بکاتە بانگخوازێك بۆ توندوتیژی و تۆقاندن، هەروەك چۆن مزگەوتە هاندەرەکان دەیکەن لە تێکدانی پەیوەندییە خێزانی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکان، کە وا پێویستە لەسەر لێبوردەیی و قبوڵکردنی بەرامبەر دامەزرابێ، ئەمە مەترسیدارتر لە زۆرێك لەو جەنگانەی وڵاتان دژی یەکتر هەڵی دەگیرسێنن.

# دینداری ئەوانەی تەندروستیان باشە و ئەوانەی نەخۆشن

## چیرۆکێکی واقیعی:

بۆچی هەندێك لە خەڵك بە شێوەیەکی لەناکاو دەبێتە کەسێکی دیندار، بێ هـیچ پێشـەکییەك؟ گـەنجێك دەناسـم هیـوا و ئـاواتی سـەمایە، ئاهـەنگی بـوك گواستنەوەی یان لە دایکبوون لە هەر شـوێنێك بگێـڕدرێ، یەکـەم کـەس دەبـوو لـە ئامـادەبووان، تەنانـەت ئەگـەر هـیچ پەیوەندیـەکی بـە خاوەنـانی ئاهەنگەکەشـەوە نەبێ، بە جۆش و خرۆش و ڕێکیەوە سەمای دەکرد، ئیرەیـی پێـدەبرا. وا ڕێکـەوت لـەم ماوەیـەدا پیـاوێکی ئـاینی دەرکـەوت، بـانگی گـەنجانی کـرد بـۆ لەخواترسـان و وازهێنـان لـە سەرپێچـی کردنـی خـوا، گـەنجان لـە دەوری کۆبوونـەوە، وایلێهـات شـوێنکەوتووانی پێگەیـەکیان هـەبوو لـە نێـو خەڵکـدا، ئـەم گەنجـە سـەماکەرەش یەکێك بوو لە شوێنکەوتووانی. زۆر بە سەیری گۆڕدرا، دەتبینی ڕیشی بـەردەدا و پرچی سەری کورت دەکرد، پانتۆڵی جینزی تەسکی گۆڕی بە دیشداشەیەکی سپی درەوشاوە، لە جیاتی ئەو مەدالیایەی لە گەردەنیدابوو تەسبیحێکی هەڵگرت.. پـاك و بێگەردی بۆ خوای مەزن کە دۆخەکان دەگۆڕێ.

ئەم دۆخەی هاوەڵەکەمان جیاواز نییە لە دۆخی زۆرێك لە خەڵك، ئەوانـەی کە لە نێوان شەو و ڕۆژێك لەم بەرەوە دەچنە ئەمبەر. ئێمـە نکـۆڵی لـەوە ناکـەین خوا ڕێنوێنی هەر کەسێك دەکات کە بیەوێت، نامانەوێ لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵك بکەین لەسەر مەبەست و نیازیان، بـەڵام تـەنها دەمانـەوێ جیـاوازی لـە نێـوان دوو

جۆری دینـداری بكـەین، كـە بـریتین لـە: دینـداری گـەڕان بـە دوای حەقیقـەت، دینداری شۆردنی ناوبانگ.

## دینداری ناوبانگ شۆردن:

ولیەم جیمس جیاوازی كردووە لە نێوان ئەوەی ناوی دەنێت دینداری ئەوەی تەندروستی عەقڵی و دەروونی تەواون لەگەڵ دینداری ئەوانەی نەخۆشن. دینداری لـەناكاو كـە ڕوودەدات لـەلای هەنـدێك كـەس، بـە تێڕوانینـی ئێمـە جۆرێكـە لـە دینداری نەخۆشی. یەكێك لە پاڵنەرەكانی دینداری نەخۆشی بریتییە لە هەوڵدان بۆ جوان كردنی ئەو وێنەیەی كەسەكە پێی ناسراوە. ئەم جۆرە لـە دینـداری پێـی دەوتـرێ شـۆردنی ناوبـانگ، كـە بریتییـە لـە (هەوڵـدان بـۆ پاككردنـەوە ناوبـانگی كەسێك لەو كرچ و كاڵیانە یان لەو ئابڕووبردنانەی ناوی ئەوی ناشرین كردووە، تـا بەخاوێنی لەناوماندا دەربكەوێ ((ناوبانگی نیو لوك))). ئاسـانترین دوو ڕێگـە بـۆ شۆردنی ناوبانگی پیس بوو، بریتین لە (ڕۆیشتنە ناو كاری سیاسی، خۆ هەڵواسـین بە لق و پۆپـەكانی ئـایین)، ئـەو كەسـە چاڵاكی زیـاتر دەبـێ كاتێـك ئـایین لەگـەڵ سیاسەت لـەلای ئـەو كۆدەبێتـەوە، چیرۆكەكان سـەبارەت بـە دروسـتی ئـەم قسـەیە زۆرن، زیادەڕەوی ناكەم ئەگەر بڵێم خوێنەر چەندین وێنەی واقیعی هەڵگرتووە لە مێشكی خۆیدا.

## ڕاستگۆیی دینداری لەناكاو:

كاتێك قسە لەسەر كەسێك دەكەین ناوبانگی خۆی دەشوات، وەك یـەكێك لـە پاڵنـەرەكانی دینـداری، نامانـەوێ ئەوانـە ناشـرین بكـەین كـە دینـداری بـۆ ئـەم

مەبەستە دەکەن، ئەوان زۆربەی جاران لە دینداریەکەیاندا ڕاستگۆن، بە ڕاستگۆیانە دەیانەوێ ژیانیان بگۆڕن لەم بەرەوە بۆ ئەم بەر، زانایانی دەروونزانی و کۆمەڵناسی جەخت لەمە دەکەنەوە، دەڵێن: ((زۆربەی جاران ئەو کەسەی دەیەوێ ناوبانگی خاوێن بکاتەوە ڕاستگۆیە، بە مانای هەنگاونان لەم بەرەوە بۆ بەرامبەرەکەی بە ڕاستگۆیانە)). هەروەك جەخت دەکەنەوە لەسەر ئەوەی ((هەندێك کەس لە شتێکەوە دەچنە سەر دژەکەی، بەمەبەستی سڕینەوەی گوناهەکان و بڕوابوونی بەوەی ئەمە مێژووی خراپی ناوبانگەکەی دەسڕێتەوە)). بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بەم بابەت، خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ گۆڤاری (روز ئەلیوسف) ژمارە (٤٠٧١) کە لە بەرواری (٦/ ٢٠٠٦) دەرچووە، ئێمەش هەندێك دەربرینمان لێی وەرگرتووە، لە نێو دوو کەوانەدا خستوومانەتەڕوو.

## گەنجان و ڕۆڵی دینداری:

هەندێك لە گەنجان بە دەمارگیری و توندگیریەوە دەستپێ دەکەن، بەڵام دەست دەکات بە تێگەیشتن لە ئایین و دینداری کردن بە پلەبەندی تا فێری لێبوردەیی و میهرەبانی و لێخۆشبوون لە تاوانەکانی ئەوانی تر دەبێ، لەوانەیە هۆکاری ئەم سەرەتایە توندە بگەڕێتەوە بۆ جۆش و خرۆشی گەنجان و حەز کردنیان لە بوونی ژیانێکی نموونەیی تەواوکار بەپێی تێڕوانینیان لەبارەی جوانی و کامڵی. سەرباری ئەمە، سەرچاوەی فێربوونی ئاینی ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەم توندگیریەدا، هەندێك لە ئایین یان مەزهەبە ئاینیەکان ڕێنماییەکانی لە بنەڕەتدا تایبەتمەندن بە هەندێك لە توندگیری، یان چەند ڕێنماییەك لە خۆ دەگرێ هەندێك جار داوا دەکات لێبوردەیی و هەندێك جاری تریش توندی پەیڕەو بکرێ

بەگوێرەی ئەو دۆخەی ئایین دەیەوێ چارەسەری بکات، بەڵکو جەختکردنەوەی پیاوانی ئاینی لەسەر ئەو بابەتانەی توندی دەخوازن، لەوانەیە ئەو تێگەیشتنە لای گەنجان بێنێتە کایە کە گشت پرسەکان بەم جۆرە چارەسەر دەبن.

## دانپێدانانی پیاوانی ئاینی:

زۆربەی جاران پیاوانی ئاینی کەسانی توندن، کاریگەریان لەوانی تر لەسەر گەنجان زیاترە. وتاربێژی یەکێك لە مزگەوتەکانی شانشینی عەرەبی سعودی دەڵێت: ((من لە سەرەتای ساڵانی وتاربێژیدا بووم، ئەوەندە توند بووم تا ئاستێك لە سەر مینبەری وتاربێژیدا وتم: ئەوەی مۆڵەت بدات بە ژنەکەی یان کچەکەی یاخود خوشکەکەی کە لە تەنیشتی دانیشتوە لە ناو ئوتومبێلدا نیقابەکەی لابدات و ڕووخساری دەربخات، ئەوا ئەو کەسە گەوادە، بەڵام من ئێستا دەزانم من ئەو کات هەڵە بووم، چاکەی زانینی هەڵەکانم بۆ پیاوە میانڕەوە ئاینیەکان دەگەڕێتەوە، کە بەشێوەیەکی لێبوردانە ئەو جێگایانەیان بۆ دەستنیشان کردم کە هەڵەم تیادا کردووە)).

## ڕۆڵی دینداری ئاینی لە کارە ئەدەبی و سینەماییەکاندا:

زۆرێك لە ڕۆمان و فیلمە سینەمایی و زنجیرە تەلەفزیۆنیەکان، ئاماژەیان کردووە بە خولی دینداری، کە بە توندگیری دەستپێدەکات و جۆرێك لە هەڵگەڕانەوەی نەرێنی بەدوایدا دێت، ئینجا گەڕانەوەی میانڕەوانەی بەدوایدا دێت. لەوانەیە دیارترینی ئەم کەسانە ئەم نووسەرانە بن: یوسف ئیدریس، نەجیب مەحفوز، ئیحسان عەبدلقدوس، زۆرێك لە کارە ئەدەبیەکانیان کراونەتە فیلم و زنجیرەی تەلەفزیۆنی. لەسەر خوێنەر یان بینەر ئاسانە نموونەیەك لەو

گەنجە دیندارە ببینێتەوە کە ڕیشەکەی بەرداوە و زۆر نوێژ دەکات و هاموشۆی مزگەوت دەکات، خۆی دابڕیوە لە خێزانەکەی، یان سروشتەکەی وشك بووە و پەیوەندیەکەی لەگەڵ خێزان و هاوڕێکانی تێکچووە، هەوڵ دەدات بۆچوونەکانی بسەپێنێ بەسەر کەسانی دەوروبەریدا، بەتایبەت خوشکەکانی، چاودێری جوڵە و وەستانیان دەکات و لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکات لەسەر پۆشاك و ئەوەی گوێی بۆ دەگرن لە گۆرانی یان ئەوەی دەبینین لە فیلم و زنجیرە فیلم، کە پێی وایە حەرامن. لەوانەیە کار بگاتە کەوتنە ناو کرچ و کاڵییەکانی کۆمەڵەی توندڕەودا، کۆمەڵەکە بیەوێ سوود لە جۆش و خرۆشی و دینداریەکەی وەربگرێ، یان کێشی بکات بۆ ڕێچکەکانی توندوتیژی و دەمارگیری و تاوانی بیروباوەڕی یان بەخت یاوەری دەبێ و سروشت و پەروەردە لێبوردەکەی و بارودۆخە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکەی ناچاری بکەن تا دەربپەڕێ لە چنگیان و مرۆڤایەتیەکەی ڕزگار بکات.

## دینداری و گونجانی کۆمەڵایەتی:

ئەم ڕۆمان یان فیلم یاخود زنجیرە تەلەفزیۆنیانە، بە ڕاشکاوانە ئاماژە دەدەن بەوەی گەنجی دیندار توانای خۆی لەدەستداوە لەسەر گونجانی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی خێزان و کۆمەڵگەکەی. لەوانەیە زۆرێك لە خوێنەران یادی سەرەتای دینداری خۆیان بکەنەوە، کە چۆن ڕووداوی توندوتیژی بەخۆیەوە بینیوە، لەوانەیە لەبەرامبەر نزیکترین کەسی خۆیان بووبێ. ئەوان ئەمە دەکەن پێیان وایە بەم کارانە لە خوا نزیك دەبنەوە، بەڵام لە دوای ململانێیەکی سەخت لەگەڵ دەروون و واقیعی کۆمەڵایەتی دەوروبەریان، دەبینن میانڕەوی و چاك

ڕەفتارکردن و چاوپۆشین لە هەندێك هەڵە تاکە ڕێگەیە، کە وایان لێدەکات بە ئاشتیانە بژین لەگەڵ دژەراکەیان.

ئەوەی بەسەر گەنج دادێت لە سەرەتای قۆناغی دینداریان، خۆی دەبینێتەوە لە لەدەستدانی تواناکەیان لەسەر گونجانی کۆمەڵایەتی، هەر بۆیە پێم وایە ئەرکی پیاوانی ئاینی یان بانگخوازانی دینداریيە ئاوڕ بەلای ئەم بابەتە گرنگەدا بدەنەوە، لە تاور و ئامۆژگاریەکانیاندا جەختی لەسەر بکەنەوە، لەوانەیە هەندێکیان بەکرداری دەستیان بەمە کردبێ.

# گفتوگۆيەك لەبارەی ئايين و دينداريەوە

## گفتوگۆيەك لە نێوان گەنجان :

مـاوەی گفتوگـۆی نێـوان چـوار گەنجـە زانكۆييەكـە، كـە هاوكـات منـيش پێنجـەميان بـووم، زيـاتر لـە دە خولـەكی نەخايانـد، ئەمـەش ئـەو ماوەيەيـە كـە ئوتومبێل پێويستی پێيەتی تا لە زانكۆوە بمانگەيەنێتە ماڵەكەم، من يەكەم كـەس بووم دەگەيشتمەوە ماڵەوە، ئينجا ئەوانی تر ڕێگاكەيان تـەواو دەكـرد. لـە ميانـەی ئەم ماوە كورتەدا گفتوگۆيەك لە نێوان گەنجەكان هاتـە ئاراوە، سـەبارەت بـە سـێ بابەتی گەرم، نەريت وايە گەنجەكان لەم تەمەنەدا گرنگی بەم بابەتانە دەدەن، ئەم بابەتانەش پەيوەست بوون بـە ئاينـەوە، ئـەوانيش بـريتی بـوون لـە: گـۆرانی: ئايا حەرامـە يـان حەڵاڵـە؟... پيـاوانی ئـاينی؟ ئايا كەسـانی پـيرۆزن؟... لـە كۆتاييـدا موسـڵمانە عەرەبـەكان، ئايا باشـترينی خـەڵكن؟ ئـەم سـێ پرسـيارە كـە چـەندين سەدەيە كێشمەكێشی لەسـەر دەكـرێ، ئـەم گەنجانـە بـە جـۆش و خرۆشـی خۆيـان ويستيان تاوتوێی بكەن و چارەسەری بۆ بدۆزنەوە، ئەوەی وەڵـامی هەڵـەی لەلايـە، دەبێ دان بە هەڵەكەيدا بنێت و هەڵسوكەوتی بگۆڕێت، ئەمە هەمووی لـە ميانـەی بيست خولەكدا.

مـن زۆر دڵخـۆش بـووم بـە گـوێگرتن بۆيـان، هەرچـەندە بەشـدار نـەبووم لەگەڵيان، نەم ويست هـيچ شـتێك لـە گفتوگـۆی ئـەوانم لـەكيس بچێت، هـەروەك حەزم نەدەكرد هەنگاونانی ئەوان پەك بخەم، وەك چۆن كەسانی گـەورە ڕاهـاتوون وا بكەن، ئەمەش حەزی ئەوان نەبوو بـۆ گواسـتنەوەی حەقيقـەت، بـەڵكو بـۆ خـۆ سـەلماندن بـوو، وەك چـۆن مـن بـۆی دەچـم. گفتوگۆيەكـە دەسـتی پێكـرد كاتێـك

یەکێکیان قسەی کرد لەسەر چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی لەگەڵ گۆرانیبێژێکی ناودار، وتی: ((ئەم گۆرانیبێژە سەری سوڕماندم، لە هەر بابەتێکی گفتوگۆکەدا وتەی کەسایەتییە ئاینیە مێژووییە درەوشاوەکانی دەهێنایەوە، خەیاڵی ئەوە بکەن باسی زیاتر لە هەشتا وتەی جێماوی عەلی کوڕی ئەبو تالیب کرد، بەڵام ئێمە تەنها کەمێکمان لەبەرە)). ئەمە ئەو گوزارشتە بوو، فتیلەی گفتوگۆکەی داگیرساند.

هاوڕێکەی کە لەسەر کورسی پشتەوە دانیشتبوو، نەیتوانی چاوبپۆشێ لەم هەواڵە، وتی: ((ئای لەم تێکگیرانە نامۆیە، گۆرانیبێژێك قسەی پیاوچاکان بێنێتەوە، بۆ ئەم گۆرانیبێژە نازانێ گۆرانی حەرامە، لەلای خوا لە زینا خراپترە؟)). وایلێهات گەرمی گفتوگۆیەکە گوازرایەوە بۆ ئەو گەنجەی لە پاڵ منەوە دانیشتووە، کە سیارەی بیجۆی بچوکی لێدەخوڕی، هاواری کرد و وتی: ((بەڕاستی خوا گەورەیە... هەموو شتێك لای ئێوە حەرامە. کێ وتویەتی گۆرانی حەرامە؟ من ناتوانم یەك ڕۆژ لە ژیانی خۆم بەبێ گۆرانی بەڕێ بکەم)). دەستی درێژکرد بۆ ڕادیۆی ئوتومبێل بۆ ئەوەی دەنگەکەی نزم بکاتەوە، دوای ئەوەی دەنگی خۆشی گۆرانیبێژێك ناو ئوتومبێلەکەی داگرتبوو، زیاتر وتی: ((ئەمە بۆ ئەوەیە بە تەواوی بچمە ناو قوڵایی گفتوگۆیەکە)).

گەنجی چوارەم، کە لەلای بەشی چەپی کوشنی پشتەوە دانیشتبوو، وتی: ((بۆچی گۆرانی حەرام دەکەن؟ بۆچی بە خراپتر لە زینا دادەنرێن؟ پەیوەندی گۆرانی بە زیناوە چییە؟)). شوفێرەکە چاوێکی لەسەر ڕێگە و چاوێکیشی لەسەر سێ هاوڕێکەی بوو لە بەشی دواوەی ئوتومبێلەکە، کاتێك گوێبیستی سەرنج و ڕوونکردنەوەی هاوڕێکەی بوو سەبارەت بە پەیوەندی زینا بە گۆرانیەوە، بە گونجاوی زانی ئەمە زیاد بکات و بڵێت: ((ئەگەر گۆرانی لە تاوان خراپتر بێت، ئەوا

گشت ڕۆژێك زینام دەكرد، من ڕۆژانە بەرگەی تاوانی گۆرانی دەگرم، ڕێگر چییە لەوەی تاوانێك زیاد بكەم بۆ خۆم، كە گوناهەكە كەمترە و چێژەكەی زیاترە؟)).

ئەوەی فتیلەكەی داگیرساند بێ دەنگی هەڵبژارد، تەماشای منی دەكرد وەك ئەوەی بانگم بكات بۆ ئەوەی بچمە ناو گفتوگۆكەوە، بەڵام من گوێم بەم بانگ كردنە نەدا، سەبارەت بە من بیستنی گفتوگۆكە خۆشتر و پڕ بایەختر بوو لە بەشداربوون تیایدا. ئەوەی پێی وابوو حەرامە وتی: ((ئایەت و فەرموودەكان جەخت دەكەنەوە لەسەر حەرامی گۆرانی، زانایان دەڵێن لە زینا خراپترە. ئایا گومانتان لە وتەی زانایان هەیە؟)). ئەم پرسیارە پاڵی بەو هاوڕێیەیەوە نا كە لەلای چەپ دانیشتبوو بۆ ئەم وەڵامە: ((بەڵێ گومانمان هەیە... ئەوەی شێخی كەناڵە ئاسمانیەكان پێمان دەڵێن، هەموو ئێوارەیەك دێنە سەر شاشە، گومان لە ناخماندا دەوروژێنن)). ئا بەم شێوە گفتوگۆیەكە گوێزرایەوە بۆ بابەتی پیرۆزی پیاوانی ئاینی، بێ ئەوەی ئاگاداركردنەوەی پێشوەختە بدرێ.

شوفێرەكە، لە هەمووان زیاتر بەرگری لە حەڵاڵی گۆرانی دەكرد، وەڵامی دایەوە و وتی: ((تكایە.. باسی هەر شتێك بكەن تەنها ئەم شێخە نەبێ، چونكە زۆر شیرین و خۆشەویستە لەلام... قسەكەی زۆر بە دڵی منە)). ئەو كاتە هاوڕێكەی وەڵامی ئەوانی دایەوە و وتی: ((بەڵام ئەو گۆرانیە حەرام دەكات كە حەزت لێیە)). ئێمە هیچ وەڵامێكمان نەبیست، بۆ ساتێك بێدەنگی باڵی كێشا، دواتر گفتوگۆیەكە زۆر بە توندتر لەوەی پێشوو دەستی پێكردەوە. ئەم گفتوگۆیە دەستی پێكردەوە بە وتەی ئەو كەسەی فتیلەی گفتوگۆیەكەی داگیرساندبوو: ((ئەم شێخە شێوازێكی جوانی هەیە، بەڵام گەوجە، گێڕانەوە و فەرموودەكان دەگوازێتەوە بێ ئەوەی بیریان لێ بكاتەوە)). ئەوەی لەلای ڕاست دانیشتبوو بەرپەرچی دایەوە و وتی:

((مەڵێ کەسێکی گەوجە... زۆر لە تۆ و ژەنیارەکانت باشترە)). ئەو کاتە زانیم گفتوگۆیەکە لە بابەتی مشتومڕەوە بۆ خودی مشتومڕکارەکە گوێزرایەوە، ئەمەش ئەوەیە کە مشتومڕە عەرەبیەکان جیا دەکاتەوە.

ئەوەی لای چەپ نەیتوانی بێ دەنگ بێ و هاواری کرد: ((ڕێز لەخۆت بگرە... ئەو شێخە لە ئێمە باشتر نییە... بەڵکو ئەو شێخە ئێمەی بۆ دواوە گێڕاوەتەوە... هۆکاری دواکەوتنمانە)). ئەوەی لای ڕاست وەڵامی دایەوە بە هاوارێکی بەرزتر لەوەی لای چەپ دانیشتووە: ((ئەوە چ دۆخێکە ئێمە تێیداینە... ئێمە چاکترین کۆمەڵەین کە بۆ خەڵك هێنرابینە بوون)). ئا بەم شێوەیە بێ ئاگاداری گفتوگۆیەکە گوێزرایەوە بۆ بابەتی سێیەم. ئەوەی لە ناوەند دانیشتبوو وەڵامی دایەوە، پێشتر بە بەردەوامی گوێی گرتبوو: ((ئەو ئوممەتە کامەیە کە قسەی لەسەر دەکەی؟ دۆخی ئێمە خراپترینە... ئێمە خراپترینی گەلانین ئێستا... سەبارەت بەو وتەیەی کە ئێمە باشترینی گەلانین، ئەوە ئەو کاتەیە کە ئێمە لە سەرەتای ئیسلام بووین)).

من گەیشتمە ماڵەوە، دەبوایە دابەزیبام، لە چاوی ئەواندا حەزی ئەوەم بینی گوێیان لە ڕای من بێ، یان وا هاتە بەرچاوم. نەمویست بچمە ناو وردەکاری گفتوگۆکە و لە هەمان کاتدا حەزم دەکرد ڕازیان بکەم، هەر بۆیە تەنها باسی دوو سیفەتم کرد کە لە گشت گفتوگۆکەدا هەبوون، پێم وتن: ((ئای گفتوگۆکەتان چەند منی دڵخۆش کرد، بەوەی باسی وازتان لە قسەی وتراوە و وتویەتی-تان هێنا کە لە ناو خەڵکدا باوە، حەزم لێیە ئاماژە بە دوو خاڵ بکەم: یەکەمیان، هەر چەندە گفتوگۆ بکەن و ڕاجیا بن ئەوا با هیچ یەکێکتان رقی لەوەی تر نەبێ، سەبارەت بە دووەمیان: بانگەشەی ئەوە مەکە حەقیقەتت قۆرخ کردووە، بەڵکو

بڵێ لەلای منە و لەوانەیە لای جگە لە منیش بێ)). ئەو کاتە لە ئوتومبێل هاتمە خـوارەوە و خواحـافیزیم لێکـرد، پرسـیارێکی مـەزن لـە خەیاڵمـدا دەخولایـەوە: ئەویش ئەوە بوو ئایا ئەو بابەتانەی تر چین کە قسەی لەسەر دەکەن؟

## سروشتی گفتوگۆکە :

لەوانەیە خوێنەر تێبینی ژمارەیەك خەسڵەت بکات، کە گفتوگۆی پێشوو پێی جیابووەتەوە، گفتوگۆیەکی ڕاستەقینە بوو بۆ ئێوەم گواستەوە. لە دیارترینی ئەم خەسڵەتانە:

١- گفتوگۆیەکە پشتی نەبەستووە بـە توێژینـەوە و لێکۆڵینـەوە و بەدواداچوون، یـان بـە گوزارشـتێکی وردتـر گفتوگۆیەکـە، لـە گەنجانێکەوەیـە کـە چـێژی خوێندنـەوە و دۆزینـەوەیان ئـەزموون نـەکردووە، سـەرباری ئـەوەی قوتـابی زانکۆن.

٢- گفتوگۆیــەکی نــا ڕێکخــراوە، ئەمــەش تایبەتمەنــدی زۆربــەی گفتوگۆیــە ڕۆژانەییەکانمانـە، لـە بابەتێکـەوە دەچـێتە سـەر بابـەتێکی تـر، بـێ ئـەوەی ئامانجێك هەبێ گفتوگۆکاران هەوڵی بۆ بدەن.

٣- گفتوگۆیەکە هەردەم لە بابەتی گفتوگۆوە دەگوازرێتەوە بۆ خودی گفتوگۆکار، تانە و تۆمەت خەسڵەتێکە، لە زۆربەی گفتوگۆی ئیسلامی نزیکەی لە جیهانی عەرەبیماندا هەیە.

٤- گفتوگۆیەکـە لەسـەر بنـەمای پـیرۆزی دامـەزراوە، جـا ئـەو پـیرۆزە دەق یـان کەسێکی پیرۆز بێ، نەوەك لەسەر بنەمای عەقڵ و بەرژەوەنـدی. گۆشـەنیگای

یەکەم کە زۆربەی گفتوگۆکان و مشتومڕەکانی لەسەر دادەمەزرێن، بریتییە لەو دەقەی کە نابێ کۆششی تێدا بکرێ یان سەرپێچی بکرێت، پیای ئاینی پیرۆزیش بۆ دەقی پیرۆز زیاد دەکرێ، کە دروست نییە تانە لە شارەزایی یان مەبەستی بدرێ.

٥- گفتوگۆیەکە پشت دەبەستێت بە ڕابردوو و باو و باپیرە کۆنەکانی، بێ ئەوەی پشت ببەستێ بەوەی ئێمە تێیداین لە دواکەوت و پاشکەوتوویی، زۆر دەگمەن وایە دەنگێك ببینین داوامان لێبکات بە لێکۆڵینەوە لە کاروباری ئێستامان و هەوڵدان بۆ ئایندەیەکی باشتر.

ئەمانە بەشێکن لەو خەسڵەتانەی ویستمان خوێنەری لێ ئاگادار بکەینەوە، چەند خەسڵەتێکن پێمان وایە لە زۆربەی گفتوگۆکانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا هەن.

# پیاوانی ئایین و فەتوا

## فەتوا و لۆژیکی عەقڵ و بەرژەوەندی :

زۆرێـك لـە پیـاوانی ئـاینی لـە دەركردنـی فەتواكانیانـدا پشت دەبەسـتن بـە بەڵگەی نەقلی، كە خۆی لە دەقی ئاینیدا دەبینێتـەوە، زۆر ئـاوڕ نادەنـەوە بـەلای بەڵگەی عەقڵیدا، تەنها لەو كاتەدا نەبێ كە فەتواكە ڕووبەڕووی ڕەخنە دەبێتەوە، چونكە پێیـان وایـە دەق بـەبێ عـەقڵ بەڵگەیـە لەسـەر خـەڵك. زۆربـەی جـاران دەبینین ئەوەی فەتوا دەجوڵێنێ دەقە، ئەگەر دەق نـەما فـەتواش ون دەبـێ، ئەمـە بەشێوەیەكی ڕوون دەردەكەوێ لە كۆمەڵگە ئیسلامییەكاندا، تیایاندا پیاوانی ئاینی كـار دەكـەن لەسـەر چاڵاك كردنـی هەنـدێك دەقـی بـێ كـەڵك، بەشـێوەی فـەتوا و فەرامۆشكردنی زۆرێك لە پرسە گـرنگ و مەترسـیدارەكان، تـەنها لەبـەر نـەبوونی دەقێك پەیوەست پێیـەوە. ئـەم واقیعـە دزێـوەی سروشـتی فـەتواكان لـە كۆمەڵگە موسڵمانەكاندا، پاڵمان دەنێ بۆ وتنـی ئـەوەی لـۆژیكی بەرژەوەنـدی دەبـێ زاڵ بـێ، فەتوا خزمـەتی كۆمەڵگە ناكات، پێویستە لـە تـاقی دیـوار بـدرێ، ئـەو فەتوایـەی خزمەتی كۆمەڵگە ناكات پێویستە لە تاقی دیوار بدرێ، سەبارەت بەوەی خزمـەتی كۆمەڵگە دەكات، ئەوا پێویسـتە بـە لـۆژیكی عـەقڵ و بەرژەوەنـدی سـەیری بكـرێ، نەوەك بە لۆژیكی خۆشویستن و گوێڕایەڵی، بەو مانایەی وەڵامدانەوەی تەنها بـەوە نابێ كە لە پیاوانی ئاینیـەوە دەرچووە، كـە پێویسـتە لەسـەرمان گوێڕایـەڵی بـین، بەڵكو لەبەر ئەوەیە ڕۆڵێكی ئەرێنی لە كۆمەڵگەدا دەگێڕێت.

## فەتواکانی بەڵگەی نەقڵی:

لێرەدا ژمارەیەك فـەتوا هـەن، تیایانـدا پیـاوانی ئـاینی پشتیان بـە بەڵگەی نەقڵی نەوەك عەقڵی بەستووە، هەندێك لەم فەتوایانەمان هەڵبژاردووە، بۆ ئەوەی ببنـە نموونـەی ڕوونکـەرەوە بـۆ ئـەوەی دەمانـەوێ، سـەبارەت بـە کۆکردنـەوە و باسکردنی گشت ئەم فەتوایانە لەوانەیە پێویستی بـە بـەرگێکی مـەزن یـان چـەند بەرگێك بکات:

١- حەرامی گواستنەوەی ئەندامەکان: هەنـدێك لـە پیـاوانی ئـاینی پێیـان وایـە دروست نییە ئەندامەکان بگوازرێنەوە، چ هی زیندووان یان مردووان بێ بۆ ئەوانـەی پێویسـتیان پـێ هەیـە، لەمەشـدا پشـت دەبەسـتن بـە ژمارەیـەك فـەرموودە و گێڕانـەوە. دەگێڕدرێتـەوە یـەکێك لـە پیـاوانی ئـاینی تووشـی لەکارکەوتنی گورچیلەکان بووە، لەگەڵ ئەوەشدا پێـی وابـووە دروسـت نییـە ئەندامەکان بگوزارێنەوە، سەرباری چەندین هەوڵ بۆ ڕازی کردنی سەبارەت بە پێویستی گواستنەوەی ئەندامان و سوودی لێدەبینێ، بەڵام ئەو هەر ڕەتی کردەوە تا دۆخە تەندروستیەکەی داڕوخـا بەشـێوەیەکی بەرچاو تـا مـردن یەخەی گرت.

٢- فـەتوای حـەرام کردنـی پەیکـەر: هەنـدێك لـە پیـاوانی ئـاینی پێیـان وایـە (ئەوانەی پەیکەر دەتاشن، چ بـە مەبەسـتی بـەکارهێنانیان لـە ڕازاندنـەوەی ماڵەکان یان شتەکانی تر، لـە ڕۆژی دوایـیـدا سـزا دەدرێـن و پێیـان دەوتـرێ: ئەو شتانە زیندوو بکەنەوە کە دروسـتان کـردووە). بـەهۆی ئـەم فەتوایـەوە ئـافرەتێکی سادە دەسـتی دایـە بیورێـك و ڕۆیشـتە نـاو مـاڵی پەیکەرتاشـی میسرِی حەسەن حشمەت و هەندێك لە نەخشکاریەکانی لە نـاو باخچەکەی

ئـەودا شـکاند، کاتێـك پرسـیاری لێکـرا لـەبارە پاڵنەرەکـەی، وتـی: ((پشـتی بەستووە بەو فەتوایەی پەیکەردانان لە ماڵدا حەرام دەکات)).

٣- حەرامی ڕیش تاشین: نزیکەی گشت مەزهەبـە ئیسلامییەکان بـە هـەر دوو تاقمی سوننە و شیعەوە کۆکن لەسەر ئەم فەتوایە، ئەمەش بەپێی بۆچوونی ئێمە هیچ شوێنەوارێکی تەندروستی یان کۆمەڵایەتی یاخود ئابووری نییـە، بەڵام شوێنەوارێکی سیاسی هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە ڕیـش بـەکارهێنراوە بـۆ جیاکردنەوە تاقمەکانی ئیسلامی سیاسی لە تاقمە سیاسییەکانی تر.

بەپشت بەستن بەم فەتوایانە، پێمان وایە لە بەرژەوەنـدی کۆمەڵگەدا نییـە تاکەکانی پشت ببەستن بەم فەتوایانە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەکانی کۆمەڵگە و واقیـع، چـونکە زۆربـەی فـەتواکان هـەروەك باسمـان کـرد، سەرچـاوەکەی دەقـی ئاینیە، نـەوەك واقیعـی کۆمەڵایـەتی یـان بەرژەوەنـدی گشـتی، بـەڵکو هەنـدێکیان، لەوانەیــە زۆربــەیان تێکــدەگیرێن لەگــەڵ بەرژەوەنــدی کۆمەڵگــە، هــەروەك لــە فەتواکانی سەرەوەدا هاتووە.

## پێویستی چاڵاك کردنی لۆژیکی عەقڵ و بەرژەوەندی :

لە بەرامبەر ئەم فەتوایەدا کە تێکدەگیرێ لەگەل لۆژیکی عەقڵ و ژیربێژی، دەبینین نیمچە یەکدەنگیـەك لەلایـەن پیـاوانی ئاینیـەوە هەیـە لـەبارەی بێـدەنگ بوون لەهەمبەر پرسە گرنگەکان، کە پەیوەندی نەرێنی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و تەندروستیان هەیە، تەنها باسی دوو پرس دەکەین، کە بریتین لە:

١- پرسی بڵاوبوونەوەی جگەرەكێشان، ناكرێ شوێنەوارە نەرێنیـە كۆمەڵایـەتی و ئابووری و تەندروستییەكانی بەراورد بكرێن – بۆ نموونە – بە ڕیش تاشین، بە هەر دۆخێك لە دۆخەكان، لەگەڵ ئەمەشدا دەبینین پیاوانی ئاینی سورن لەسەر حەڕامكردنی ڕیش تاشین و بە دروست دانانی جگەرەكێشان، ئەمەش بەسادەیی لەبەر ئەوەیە دەق هەیە سەبارەت بە هی یەكەم و دەربارەی هی دووەمیش نییە. لەبەر ئەمە كۆمەڵگە ناتوانێ بەرەنگاری دیاردەی بڵاوبوونەوەی جگەرەكێشان ببنەوە بە پشت بەستن بە دەقی ئاینی، یان بە دەستەوەردانی پیاوانی ئاینی و پشتیوانیان بۆی، بەڵكو پێویستە ژیرمەندان پشت ببەستن بە لۆژیكی عەقڵ و بەرژەوەندی، كە وا دەخوازن مرۆڤ لە جگەرەكێشان دوور بكەوێتەوە بۆ پاراستنی تەندروستی و سامان، جا پیاوانی ئاینی ئەمە قبوڵ بكەن یان نا، ئەمە ئەو بنەمایەیە كە ڕێكخراوەكانی بەرەنگاربوونەوەی جگەرەكێشان لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا لەسەری دامەزراون. شایەنی باسە، ئێمە لێرەدا داوای دەستەوەردانی پیاوانی ئاینی ناكەین لە پرسی جگەرەكێشاندا، داواشیان لێ ناكەین فەتوا بدەن سەبارەت بە حەڕامبوونی، بەڵكو دەمانەوێ ڕۆڵی عەقڵ چالاك بكەن و لۆژیكی بەرژەوەندی دوور لە دەق زاڵ بكەن، تا ئەوە بۆ خەڵكی فەراهەم دەبێ لێكۆڵینەوە لە واقیعەكەیان بكەن بە عەقڵی خۆیان و ئەوەی وەڵامی بەرژەوەندییەكانیان دەداتەوە، نەوەك بە عەقڵی جگە لە خۆیان و لۆژیكی دەق، كە دروست نییە پێشێل بكرێ بە پاساوی ئەوەی كۆشش (إجتهاد) لەبەرامبەر دەقدا نییە.

٢- پرسی دیاری کردنی وەچە، یەکێکە لە پرسە گرنگەکانی تر، هێشتا کاریگەریەکی مەزنی هەیە لە هەندێك کۆمەڵگەی موسڵماندا، وەك کۆمەڵگەی میسرى، لۆژیکی عەقڵ و بەرژەوەندی ڕۆڵی سەرەکی بینی لە چارەسەرکردنی، خەڵك وەڵامی دایەوە بەپێی ئەم لۆژیکە، سەرباری بەرهەڵستی زۆرێك لە پیاوە ئاینیەکان، نەبوونی و سەختی دابینکردنی پێداویستییە مەزنەکانی ژیان، پاڵی بە خەڵکەوەنا بۆ ئەوەی خێزانێکی کەم بە تەواو بزانێت. ئەم نموونەیە و زۆرێکی تریش جگە لەمە، جەخت دەکەنەوە لە ڕۆڵی گرنگی وەگەڕخستنی لۆژیکی عەقڵ و بەرژەوەندی لە چارەسەرکردنی پرسە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەکان و جگە لەوانیش دوور لە لۆژیکی ئەو فەتوایانەی پشتیان بەستووە بە دەق.

شایەنی باسە ئەمڕۆ ئێمە لە دۆخی هەنووکەماندا، ناتوانین ڕۆڵی فەتوا فەرامۆش بکەین، بەڵام زۆر گرنگە جێگرەوەیەکی بۆ بدۆزینەوە، کە بە ڕای ئێمە خۆی دەبینێتەوە لە لۆژیکی عەقڵ و بەرژەوەندی، چونکە فەتواکان لە گشت پرسێکدا بەسوود نابن، لە گشت دۆخەکانیشدا ڕاست پێکراو نابن، تا دەگەینە پشت بەستن بە لۆژیکی عەقڵ و بەرژەوەندی لە گشت پرسەکانماندا، پێویستە زۆر ئاگادار بین لە کاریگەری فەتوای نابەرپرسانە لە کۆمەڵگەکەماندا.

# فەتوایە سێکسییەکان

## پێگەی سێکس لە بیرکردنەوەی ئاینیدا :

سێکس پێگەیەکی دەگمەن دادەگرێ، رووبەرێکی بەرفراوان دەگرێتەخۆ لە گشت ئاینەکاندا، لەوانەیە لە سێ ئاینە ئاسمانیەکەدا پێگەیەکی جیاواز بگرێت، چ بەهۆی ئەو دەقانەوە بێ، کە پەیوەستن بە سێکس، کە دەقەکانی لەسەر هاتوون یان بە گرنگیدانی پیاوانی ئاینی بێ، کە سەریان بە ئاینەکەوەیە، بەڵام دەکرێ بوترێ پیاوانی ئاینی لە هەردوو ئاینی یەهودیەت و مەسیحییەتدا توانیویانە ئەم دەقانە پوختە بکەن و بەکاریان بهێنن بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵگە، سەرباری مانەوەی هەندێك پاشماوە کە جار جار دەبنە مایەی کێشە، بەڵام پیاوە ئاینیەکانی موسڵمانان زۆر زیادەڕەوییان کردووە سەبارەت بە سێکس و توندگیریان تێدا نواندووە و رۆڵی دەقەکانیان گەورە کردووە و زۆر جار بۆ جیا لەمانای خۆیان رایانکێشەوە، لەوانەیە ئەم توندگیریە لە پرسی سێکسدا لەلای موسڵمانان، لە بنەڕەتدا بگەڕێتەوە بۆ سروشتی دەشتەکیایەتی، کە شەرعناس و ڕاڤەکاری دەقەکان تیایدا گەورە بوونە، لە قۆناغە زووەکانی سەرهەڵدانی ئیسلام، ئەو زاڵبوونەی ئیسلامی دەشتەکی کە بەدوایدا هاتووە لە وڵاتانی خەلیج لە سەردەمی ئێستادا.

لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەین ئەگەر بڵێین، پیاوانی موسڵمانان لە هەر پرسێکی بایەخ بە پرسەکانی سێکس دەدەن زیاتر تر، ئەمە بەشێوەیەکی روون دەردەکەوێ لە ژمارەی ئەو فەتوایانەی پەیوەستن بە سێکسەوە، کە بە فەتوا سێکسیەکان ناسراون، بەراورد بە فەتواکانی تری پەیوەست بە بوارە جیاوەکانی

تری ژیان. ئەم فەتوا سێکسیانەی ڕۆژ دوای ڕۆژ دێنە ناو گشتماڵێکەوە لە ڕێگەی ئامرازە جیاوازەکانی ڕاگەیاندنەوە و بە تایبەت کەناڵە ئاسمانیەکان و ئینتەرنێت و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، سەرباری مزگەوت و ناوەندە ئاینیەکانی تر، کە ڕۆڵیان گێڕاوە لە لەقاڵبدانی عەقڵی ئیسلامی بە ڕێگەیەك، وایکردووە موسڵمانان سەغڵەت ببن لە پرسە سێکسییەکان و قسەی لەسەر ناکەن، هەر چەندە زۆر کێشەی پەیوەست بەمەوە هەن. زۆربەی ئەو فەتوایانەی دەردەچن، تەنها بابەتەکە ئاڵۆزتر دەکەن، ئەم فەتوایانە لە گۆشەنیگای بەرتەسك کردنی ڕووبەری سێکسی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەردەچن، هەروەها زیادکردنی ژمارەی قەدەغەکراوەکان، لە حەرام کردنی تەماشاکردنی ئەوەی خوا قەدەغەی کردووە، تا دەگاتە حەرامی تێکەڵاوی و قسەکردن لەگەڵ ئافرەتان و تۆقە کردنیان لەگەڵیان و جگە لەمانەش زۆر بابەتی تر، کە گوێچکەی موسڵمانانی سەرقاڵ کردووە، بەتایبەت گەنجانی موسڵمان، وای لەوان کردووە ببنە بەند و دیلی خەیاڵە سێکسییە نەخۆشەکان.

بەگشتی، سێکس لە عەقڵی دیندارەکاندا، بەتایبەت موسڵمانان، پەیوەستە بە تاوان و هەڵە و سەرپێچی و شەیتان، زۆربەی گێڕانەوە ئاینیەکان، کە لە سێ کتێبە ئاینیەکاندا (تەورات و ئینجیل و قورئان) دەڕژێنە ناو ئەم جۆرە تێگەیشتنە سەبارەت بە سێکس. ئەم تێگەیشتنانە وایان کردووە سێکس ببێتە گرێکوێرەیەك، گەورە ببێ نەوە دوای نەوە، تا وای لێهاتووە بووەتە یەکێك لە مەترسییەکان، کە هەڕەشە دەکەن لە کۆمەڵگەکان بە تەقینەوە و دەرچوون، زۆری ئەو کۆت و بەندانەی دانراون لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا وەك نموونە، پاڵی بە هەندێك گەنجی موسڵمان ناوە فەتواکانی پیاوانی ئاینی پشتگوێ بخەن، چونکە چارەسەری بنەڕەتی و لۆژیکی بۆ کێشەکانیان دەستەبەر ناکەن، گوزارشتەکانی وەك: ئارامگرتن و داوێنپاکی و چاوگرتن، کە پیاوانی ئاینی لە گشت بۆنەیەکدا

بەگوێچکەماندا دەدەن، چیتر بەکەڵك نین لە سایەی کرانـەوەی مـەزنی ڕاگەیانـدن لەسەر گشت کۆمەڵگەکانی جیهان، زۆربەیان کرانەوەیان پێوەیە لە بواری سێکس.

## گەشتێك بەناو جیهانی فەتوا سێکسییەکاندا :

ڕوانینێکی خێرای هەندێك فـەتوا و بۆچوون، کـە سـەبارەت بـە پرسـەکانی سێکسـی و سروشـتی پەیوەنـدی نێـوان پیـاو و ئـافرەت، کـە دەزگـا جیاوازەکـانی ڕاگەیاندن ڕۆژانە نەقڵی دەکەن و پڕی ناو زگی کتێبەکانن، دەکرێ ئەمە ڕۆشنایی بخاتەسـەر قـەبارەی پاشـکەوتنی مـەزن، کـە کۆمەڵگـە موسـڵمانەکان بەدەسـتیەوە دەناڵێنن، قەبارەی ئەو کێشەیەی گەنجان بەدەستیەوە گیرۆدەی بوونـە، بەتایبـەت لەگەڵ لە تواناداا نەبوونی هاوسەرگیری نەریتی، بەهۆی بارودۆخی خراپی ئابووری و بڵاوبوونەوەی بێکاری.

فەتوایـە سێکسـییەگان بـەوە جیادەکرێنـەوە بەشـێوەیەکی گشـتی کـە بیرکردنەوەکەیان سادەیە و کۆت و بەندن بە سنووری دەق، ئەمانە دوو خەسڵەتن بەرهەمەکانی بازاڕی فەتوا بەشێوەیەکی گشتی پێی جیا دەکرێنەوە، بەڵام فەتوای سێکسـی خەسـڵەتێکی زیاتریشـی هەیـە ئـەویش پاڵنـەری نەخۆشـییە لـە پـاڵ بڵاوبوونـەوەی خراپـەکاری لـە کۆمەڵگـە موسـڵمانەکان لەگـەڵ سـوربوون لەسـەر پیلانگێڕی کە خۆرئاوا دژی موسڵمانان دەیگێڕن. کە

لـە خـوارەوەدا هەنـدێك لـەو فەتوایانـە هـەن کـە دەنگدانـەوەی هـەبوو لـە ناوەنـدە جیاوازەکـانی ڕاگەیانـدن، خـاوەنی فـەتواکان پشـتیان بەسـتووە بـە بەڵگـە نەقڵی بێ بەڵگەی عەقڵی:

١- فەتوای شیردان بـە کەسی مـەزن: یـەکێك لـە مامۆسـتایانی فەرمودەناسـی لـە کۆلیژی بنەماکانی ئایین لە زانکۆی ئەزهەر، ئاماژەی کردووە بەوەی ئافرەتی هاورێ ئەگەر شیر بە هاورێکەی لە کاردا بدات، رووماڵێکی رەوا دەدات بـەوەی پێـی دەوترێـت خـەڵوەتی شـەرعی، بەلەبەرچاوگرتنی ئـەوەی دەبێتـە دایکـی شیری ئەو. وتویەتی بەم فەتوایەیدا پشتی بەستووە بـە رووداوەگـەی سـامی خزمەتکاری ئەبو حوزەیفە، بە بەکورکردن (تبنی) کوڕی ئەبو حوزەیفە بوو، کاتێك قورئان بە کوڕکردن (تبنی) حەرام کرد، پێغەمبەر داوای لـە دایکـەکان کرد شیر بدەن بەوانەی کردوویانەتە کوڕی خۆیان، تا بتوانن بە تـەنها بچـنە لایان، شیردەرەکە لە شوێنێك بـوو و عومـەری کـوڕی بـانگی کـرد دایکـە. ئـەم فەتوایـە رووبـەرووی زۆر رەخنـە بوونـەوە، بوونەتـە بابـەتێکی بـەپیت بـۆ وێنەکێشەکانی کاریکاتێر، بەڵام مامۆستاکە بە توندی بەرگری لە فەتواکـەی کرد، پێش ئەوەی پاساوی بۆ بهێنێتەوە، وتـی فەتواکـەی پشتی بەستووە بـە گێڕانەوەی هەر دوو پێشەواکەی بوخـاری و موسیلم، فەرمانبـەر کاتێـك شـیر دەداتە هاورێکەی لە کاردا، بۆی هەیە لەچکەکەی لەبەرامبەردا دابماڵێ. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ هەر سکرتێرێك بۆی هەیـە شـیر بـە بەرێوبـەری کـاری خـۆی بدات، چونکە لە زۆربـەی جارانـدا لەگەڵیـدا لـە خەڵوەتدایـە!! شـایەنی باسـە، واقیعی نەبوونی فەتواکان کۆمەڵێك هۆکاری هەیە، دیارترینیان ئەوەیە چۆن کەسێکی پێگەیشتوو بۆی هەیە شیر لە کەسێك بخوات کە هاو تەمەنی بێ، بێ ئەوەی بابەتەکە رەهەندێکی سێکسی هەبێ؟

٢- حـەرامی داکەنـدنی جـل و بـەرگ، لـە کـاتی سـەرجێیی کردنـدا: لـە فـەتوا سێکسییە ناودارەکان، کە یەکێك لە مامۆستایانی زانکۆی ئەزهـەر دەریکـرد و پاشان زوو لێی پاشگەزبووەوە و بە تەواوی رەتی کردەوە، ئـەم پیـاوە میـوانی

یەكێك لە بەرنامەكانی فەتوا بوو لە یەكێك لە كەناڵە ئاسمانیەكان، پرسیاری لێكرا لەبارەی داكەندنی جل و بەرگ لەلایەن ژن و مێردەوە لە كاتی سەرجێیی كردندا، وەڵامی دایەوە و وتی: داكەندنی جل و بەرگ لەلایەن ژن و مێردەوە تەنها حەرام نییە، بەڵكو دەبێتە مایەی لێك جیابوونەوەیان و هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری، پشتی بە چەند فەرموودەیەك بەست، كە سەرجێی كردنی ژن و پیاو ئەگەر هاوكات بوو بە ڕوانینە ئەندامەكانی زاوزێ بە حەرام دادەنێ، هەروەك ئاماژەی بە كۆت و بەندكردنی ئازادی جل داكەناندنی كرد لە كاتی سەرجێیی كردنی ژن و مێرددا، كە پشت دەبەستێت بە فەرموودەیەكی پیرۆز، ئەگەر یەكێكتان هاتە لای خێزانەكەی با خۆی داپۆشێت و خۆی ڕووت نەكات.

٣- فەتوای خەتەنەكردنی مێینە: یەكێك لە شێخەكانی ئەزهەر، هەڵسانی وەزیری تەندروستی بە ڕێگەگرتن لە (١٩٩٤) خەتەنەكردنی ئافرەتی ڕەتكردەوە، ڕایگەیاندن خەتەنەكردنی ئافرەت لە دروشمەكانی ئیسلامە و بۆ هیچ كەسێك نییە ڕێگری لێبكات، شێخەكە لە سەر هەڵوێستەكەی سوربوو، سەرباری سكاڵای دادگایی، كە ڕێكخراوی میسری بۆ مافەكانی مرۆڤ لە میسر لە دژی شێخیان تۆمار كردبوو، سەبارەت بە فەتوای ڕێگەدان بە خەتەنەكردنی ئافرەت. شتێكی زانراوە خەتەنەكردنی ئافرەت لە میسر و سودان و یەمەن و هەندێك وڵاتی عەرەبی تر، كێشەیەكی مەزنی دروست كردووە، زیاتر لە (٤٠٪) ئافرەتانی میسری خەتەنە دەكرێن، هەندێكیشیان دووچاری مردن دەبنەوە بەم كارە. هەروەك دەبێتە هۆی ژمارەیەك لە كێشەی

سێکسی بۆ ئافرەت لە ژیانی هاوسەرێتیدا، چونکە پەکی دەخات لە بە ئەنجام گەیاندنی هاوبەشی سێکسی تەواو.

٤- نادروستی دانیشتن لەسەر ئەو کورسیەی ئافرەت لەسەری دادەنیشێت: هەندێك لە پیاوانی ئاینی پێیان وایە دروست نییە پیاو لەسەر ئەو کورسییە دابنیشێ، کە ئافرەتی لەسەر دانیشتووە، تەنها دوای ماوەیەك نەبێ، کەمتر نەبێ لە پێنج خولەك. ئێمە نازانین ئەم فەتوایە ملکەچی عەقڵ بووە یان بێژەرەکەی بە ڕۆڵی گوێزەرەوەی فەرموودە هەڵساون؟ لە سایەی ئەم دۆخە تازانەی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان، ناگرێ کار بکرێت لەسەر پیادەکردنی هاووێنەی ئەم فەتوا نا واقیعیانە.

٥- حەرامی تۆقەکردن لەگەڵ ئافرەت: زۆربەی پیاوانی ئاینی پێیان وایە تۆقە کردن لەگەڵ ئافرەت لە هەر بارودۆخێکدا دروست نییە، هەندێکیش پێیان وایە دروستە. بەشی سێیەمی زانایان هەڵوێستی سێیەم دەگرنەبەر، پێیان وایە (تۆقەکردن لە ڕووی شەرعەوە دروستە، بەڵام بە ڕەهایی نا، ئەگەر ئافرەتەکە گەنج و لاو و ناسك و زۆر جوان بوو، دروست نییە تۆقەی لەگەڵ بکرێ، لە ترسی ڕوودانی ئاشوب و کەوتنە ناو حەرام، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە ناشرین بوو، ئەوا هیچ شتێك نییە لەوەی تۆقەی لەگەڵ بکرێ).

٦- حەرامی سەیرکردنە ئەندامەکانی زاوزێ: ژمارەیەك لە پیاوانی ئاینی موسڵمان و مەسیحی، پێیان وایە سەیرکردنە ئەندامانی زاوزێ کار دەکات لەسەر وروژاندنی شەهوەت و ئارەزوو. موسڵمانان دەڵێن عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بە درێژایی تەمەنی تەماشای ئەندامەکانی زاوزێی خۆی نەکرد. سەبارەت بە مەسیحییەکان، یەکێکیان نووسیویەتی و وتویەتی: ((کاتێك

جلەكانت دادەكەنى بۆ نموونـە لـە كـاتى خۆشـۆردندا، لـە ڕوانينتـدا پـاك بـە، سەيرى ئەندامەكانى زاوزێت مەكە تەنانـەت لـە ئاوێنەشـدا... چونكە ئەمـە ئارەزووەكانت دەوروژێنێ)).

## فەتواكانى دواى پاشكەوتن :

ئەمانە چەند نموونەيـەكى كـەمن لـە فـەتوا سێكسييەكان، ئـەوەى تێبينـى دەكەين ئەوەيـە ڕازى سێكسـى لـەلاى پيـاوانى ئـاينى بزوێنـەرى ئـەم فەتوايانەيـە، نـەوەك بەرژەوەنـدى گشـتى يـان شـەريعەت يـاخود ئـايين، تێبينـى ئـەوەمان كـرد، ئەمانە لەو بابەتانەن ڕاجياييان لەسەر هەيە، بەڵام ئەوەى پياوانى ئاينى پاڵ دەنێ بۆ دەركردنى ئەم فەتوايانـە، بريتييـە لـە عـەقڵى نـەخۆش، كـە زاڵـە بەسـەرياندا، لەوانەى لايـەنى نەسـتى بـێ، ئـەم فەتوايانـە دادەپۆشـن بـە وتـەى وەك: پاراسـتنى ڕێنماييـەكانى ئيسـلام يـان داوێنپـاكى لاى موسـڵمانان و چـەندينى تـريش، وەك ئەوەى ڕێنماييەكانى ئيسلام و داوێنپاكى موسڵمانان وەستاونەتە سەر ئەم فەتوايە بـۆش و بەتاڵانـە. ئـەم جـۆرە فەتوايانـە كۆمەڵگـە موسـڵمانەكان دەبـات بـەرەو قۆناغەكانى دواى پاشكەوتن، دواى ئەوەى بە تەواوى لە قۆناغى دواكەوتندا ژيا، لە كاتێكدا ئەوانى تر ئەمڕۆ دەگەڕێن بەدواى قۆناغى دواى نوێگەرى، پاش ئەوەى بە تەواوى لە قۆناغى نوێگەريدا ژيان.

## نزار قەبانی لە چەند قوتابخانەیەکی سەرەتاییدا :

لە نێو ئـەو چامە زۆرانـەی نـزار قـەبانی شـاعیر و بیرمەنـد نووسـیویەتی، چامەی (شتی پڕ و پوچمان) هەڵبژاردووە لە دیوانەکەی (چەند چامەیەکی نامۆ)، بـۆ ئـەوەی ببێتـە کۆتـایی و ڕۆشـنایی زیـاتر بخاتـە سـەر گاڵتـەجاری فـەتوا سێکسییەکان، کـە عـەقڵی زارۆك و گەنجـەکانمان دەشـێوێنێ، وێنـای گشت شتێکی ئافرەت دەکات بەوەی شەرمگەیە و هەرچی پێیەوە پەیوەستە بە ئافرەتەوە خراپە و شەڕە، ئەم دۆخەی شاعیر قسەی لەسەر کردووە لە سەردەمی نووسینەکانیدا، کە زۆر جیـاوازی نییـە لەگـەڵ دۆخـی هەنوکـەمان، کـە لەسـەرەتای سـەدەی بیست و یەکـداین، سـەردەمی پێشـکەوتنی تەکنـەلۆژیا و شۆڕشـی زانیـاری، لەوانەیـە ئـەو فەتوایانــەی لەســەرەوە باســان کــردن، حەقیقــەتی ئــەو داڕوخــاوەی فــەتوا سێکسییەکان لە کۆمەڵگە موسڵمانەکانمان دەربخەن.

کاتێك لە تەمەنی منداڵیدا لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بووین

بە شەو و ڕۆژ فێری ئەوەیان دەکردین

فێریان دەکردین:

((ئەژنۆی ئافرەت شەرمگەیە...))

((زەردەخەنەی ئافرەت شەرمگەیە...))

((دەنگەکەی...

- لە ودیوی کونی دەرگاوە – شەرمگەیە))

* * *

بە سزای خوا ئێمەیان دەترساند ئەگەر عاشق ببین

هەڕەشەیان بە چەقۆ لێدەکردین، ئەگەر باڵغ بووباین...

* * *

ئێمەیان شێواندووە...

هەستیان لێشێواندین...

جەستەکانیان لەمە دابڕاند...

چەندین سەدە... چەندین سەدە...

وێنای خۆشەویستیان بۆ کردین وەك دەرگایەکی مەترسیدار

ئەگەر بیکەینەوە... ئەوا بە مردوویی دەکەوین

بە سادەیی پێگەیشتین

پێمان وایە ئافرەت.. مەڕە یان وشترە

وا دەبینین جیهان.. سێکس و سیسەمە...

# سێ هەڵوێست لەبەرامبەر ئافرەتەوە

## ئافرەت لە نێوان پیاوانی ئاینی و بازرگانانی کۆیلە:

پیاوانی ئاینی وا هەڵسوکەوت لەگەڵ ئـافرەت دەکـەن بەشـێوەیەکی گشـتی، وەك ئەوەی شەرمگە (عەورەت) بێ، سەرچاوەی ئـارەزوو و شـەهوەت بـێ، هۆکـاری بەلارێدابردنی پیاو و خستنە ناو هەڵە و حەرام بێ، هەر بۆیە پێویسـتە رێگـە لـە ئافرەت بگیرێت لە تێکەڵبوون لەگەڵ پیاوان، دەبێ لەبەرچاوان بپۆشـرێن، یـان بـە رێگەگرتن لە دەرچوونی لە ماڵ یان بە داپۆشینی بە جلی رەش لە تۆقی سەریەوە تا بەری پێیەکانی. لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینـە توونـدڕەوانـە بـۆ ئـافرەت لەلایـەن پیاوانی ئاینیەوە، تێڕوانینێکی دیکەی توونـدڕەو هەیە بۆ ژمارەیەك لە بازرگانانی کۆیلەی سپی، کە پێیان وایە ئافرەت کاڵایەکە، ماف گشت پیاوێکە بەدەستی بخات و چێژی لێوەربگرێ، مادەم توانای پارەدانی لەبەرامبەر ئـەم چێژ وەرگرتنـە هەیـە، پێشیان وایە نابێ ئافرەت خـۆی بگرێتـەوە و دووربخاتـەوە لەهـەر کەسـێك حـەزی لێیەتی، مادەم توانای چێژ بەخشینی بە ئافرەتەکە هەیە، ئەمانـە ئافرەتیـان وەك سەرچاوەی قازانجی دارایی بەکارهێناوە، بەهۆیەوە ئامانجی مەزنیان بـەکارهێناوە. ئەگەر وردببینەوە لە بیرۆکەی هەر دوو لایەنەکە، دەبیـنین کـۆك و تـەبان لەسـەر ئەوەی ئافرەت سەرچاوەی ئارەزو و شەهوەتەوە و تەنها کەل و پەل و دەفرێکە.

لە نێوان ئەم دوو تێڕوانینە توونـدڕەوەدا، میانڕەوی ونبوو و هیچ شوێنێکی بۆ نەما، بەها مرۆییەکان کە پێویستە تاکەکانی رەگـەزی مرۆیـی بـە تێکڕایـی کـۆ بکەنەوە، بە نێر و مێیەوە، نەماون تەنها توێکڵەکەیان نەبێ، کە لە هەر دوو لایـە توونـدڕەوەکەدا چەقە چەقیان پێ دەکرێت، پیاوانی ئاینی بانگەشەی ئەوە دەکەن

ڕێز لە ئافرەت دەگرن، چونكە دایك و خوشك و هاوژینە. ئەوانەی بازرگانی بە ئافرەتان دەكەن دەڵێن خۆیان ڕێز لە ئافرەت دەگرن، چونكە ئازادی پێدەدەن لە بەكارهێنانی جەستەكەی و سوود لێبینینی، ئافرەت ئازادە، هیچ یەكێك لە دوو كۆمەڵەكە نەیوتوە ڕێز لە ئافرەت دەگرن لەبەر ئەوەی مرۆڤە. ئا ئەمە كێشەكەمانە، ئێمە هەڵسوكەوت لەگەڵ ئافرەت دەكەین بە چەندین سیفەت و ناوی جۆراو جۆر، لە نێویاندا سیفەت یان ناوی مرۆڤی تێدا نییە.

## ڕۆشنبیران و ئافرەتیش مرۆڤە :

ئێمە بانگەوازی بۆ ڕووت و قوتی و بەرایی ناكەین، بانگەشە بۆ كۆت و بەندن و دیلكردنیش ناكەین، بەڵكو بانگەوازی بۆ مرۆڤبوونی ئافرەت دەكەین، كە متمانەی بەخۆی هەیە و دەزانێت چ مافێكی هەیە و چ ئەركێكیشی لەسەرە، ئافرەتێك بایەخ بە عەقڵ و گیان و چێژی خۆی بدات، تەنها لە ئاست سنووری جەستەكەی نەوەستێت. ئەمەش تەنها كاتێك ڕوودەدات كە تێڕوانینی هەڵەی كۆمەڵگە بۆ ئافرەت بگۆڕێت، ئەو تێڕوانینە كە پێی وایە ئافرەت كەل و پەل و دەفرە، ئەمە تێڕوانینێكە پیاوانی ئاینی و بازرگانانی كۆیلە ڕەواجیان پێداوە، سەرچاوەی گۆڕانكاری لەمەدا پێویستە لە ڕۆشنبیران و بیرمەندانەوە بێ، سەبارەت بە پیاوانی ئاینی و بازرگانانی كۆیلە ئەوا هیچ هیوایەك بەوان نەماوە، ئەوەی بە چاوی هیوا و ئاواتەوە سەیریان بكات، ئەوا خەیاڵ پڵاویە، پیاوانی ئاینی پێیان وایە حەقیقەتیان قۆرخ كردووە، لەمەش دانابەزن بە هەر نرخێك بێ، بازرگانانی كۆیلە پێیان وایە ئافرەت سەرچاوەی قازانج و كاسبیەكەیانە، ئەوانیش واز لەم قازانجە ناهێنن بە هەر بەهایەك بێت.

پرسیاری گرنگ ئەوەیە، ڕۆشنبیران دەتوانن چی بکەن بۆ مسۆگەرکردنی مرۆڤایەتی ئافرەت؟ وەڵامەکەی ئەوەیە، پێویستە لەسەریان یەکەم کار بکەن لەسەر ڕزگارکردنی پیاوان لە بیرۆکە هەڵەکانیان لەبارەی ئافرەتەوە. واقیعی دۆخەکە ئاماژە دەکات بەوەی پیاوان دیلی دەستی کۆمەڵێك بیرۆکەی شێواون لەبارەی ئافرەتان، ئەمەش وایان لێدەکات هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەت بکەن وەك ئەوەی تەنها کەل و پەل و دەفرێك بێت. شایەنی باسە ئەو ڕۆڵەی ئەمڕۆ ڕۆشبیران لەم بارەوە دەیگێڕن زۆر سنووردارە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێزە مەزنەی پیاوانی ئاینی و بازرگانانی کۆیلە کە چەکدارن بە سامان و چەك هەیانە، ئەوەی نامۆیە ئەوەیە زۆر جاران دەوەستن لە پاڵ یەکتردا – سەرباری جەنگی ئاشکرای نێوانیان – بۆ دژایەتی کردنی ڕۆشنبیرەکان، کە بانگەوازی بۆ مرۆڤایەتی مرۆڤ دەکەن. لەبەر ئەمە دەڵێین: ئەوەی دەیەوێت ئەو دۆخە قێزەونە ڕزگار بکات، کە ئافرەتان بەدەستیەوە دەناڵێنن، سەرەتا پێویستە لەسەری دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی و بازرگانانی کۆیلە کەم بکاتەوە، لەبەرامبەر کار بکات لەسەر گەورە کردنی ڕۆڵی ڕۆشنبیرە چالاکە مرۆڤ دۆستەکان.

# سەردا پۆشین و شەرم

## لەچکی لە ئیسلامدا نییە :

هیچ جۆرە پۆشاکێکی دیاریکراولەسەر خەڵك پێویست نەکراوە، بە سادەیی چونکە پۆشاك و جل و بەرگ دەگۆڕێن بە گۆڕانی کات و شوێن. لەچکی لە هیچ ئاینێکدا نییە، بەڵکو ڕێزگرتن لە جەستە هەیە. ئەگەر لێکۆڵینەوە بکەین لە گشت کتێبە پیرۆزەکاندا، لە ناویاندا قورئان، سەبارەت بە وشەی (حیجاب) بە مانای پۆشاکی تایبەت بە ئافرەتان، ئەوا دەستمان ناکەوێ. کەواتە، ئەم سوربوونە بۆچی لەسەر بەکارهێنانی لەچکی (حیجاب) لەلایەن موسڵمانان؟ بەکارهێنانی ئەم وشەیە گوزارشت دەکات لە سڕینەوەی ژیان لە شانۆی ژیان، هەروەك مانای حەقیقی دەفەوتێنێ، کە ئایین دەیەوێت بۆ ڕێزگرتن لە جەستە.

ئیسلام جۆرە پۆشاکی تایبەت بە ئافرەتانی پێویست نەکردووە، بەڵکو چەند سیفەتێکی بۆ پۆشاکەکە داناوە. پۆشاکەکانی ئافرەت لە ئیسلامدا بەپێی دیدی پیاوانی ئاینی خۆی دەبینێتەوە لە سەرپۆش (خمار)، عەبا (جلباب)، ئەمڕۆ وشەی (حیجاب) تەنها بۆ سەرپۆش بەکاردێت، بە نیشانەی لەخواترسان و ئاین دادەنرێ. کورت هەڵهێنانی ڕێزگرتن لە جەستە بە سەرپۆش و فەرامۆشکردنی جگە لەمە، پەیوەندی بە حەقیقەتی تێگەیشتنی ئایین بۆ جەستە نییە. لە ئایندا لەچکی نییە، ئەمە ئەو حەقیقەتەیە کە دەبێ هەنگاوی لێوە بنێین بۆ تێگەیشتن لە بەهای جەستە لە ئیسلام یان هەر ئاینێکی تردا.

ئەوەی لە کۆمەڵگاکانماندا بە لەچکی (حیجاب) ناودەبرێ تەنها بریتییە لە سەرپۆشین، کە لەلای هەندێك کەسەوە هیچ شتێك ناگەیەنێ و بۆ هەندێکی ترش

زۆر مانا دەگەیەنێ، ئەمە لە بۆچوونی ئەواندا پێومری پاك و خاوێنیە، نەپۆشینی واتـە تـاوان. بـەم تێگەیشـتنە جەسـتە ڕێزەكـەی لەدەسـتداوە. تەنانـەت ئـافرەتی ڕووتـیش ئەگـەر سەرپۆشی پۆشـی ئـەوا دەبێتـە لەچك. ئـەم تێگەیشـتنە وای لـە ئافرەتی موسـڵمان كـردووە لەچـك بپۆشـێت و شـوێنە سەرنجڕاكێشـەكانی جەسـتە دەربخات. پێویستە بوترێ جەستە سەر نییە، ئەگەر بمانـەوێ ڕێـزی بگـرین، ئـەوا دەبێ ڕێـز لـە هـەمووی بگرین، سـەبارەت بـەوەی پێـی وایـە شـەرەف و پلەبـەرزی ئـافرەت لـە لەچـك دایـە، ئـەوا لـە مانـای ڕێـز و شـەرەف تێناگـات. ئـەوەی لەچـك دەپۆشێت و هەوڵ دەدات بۆ دەرخستنی شوێنە سەرنجڕاكێشەكانی جەستە، هێشـتا بڕوای وایە جەستە كەل و پەلە.

بەگشتی دوو جۆر تێڕوانین هەیە لـەبارەی لەچك لـە ئیسلامدا. تێـڕوانین یەكەم/ پێی وایە فەرزێكی پیویستە لە ئیسلامدا، دووەمیـان، پێـی وایـە فـەرزێكی پێویست نییە لە ئیسلامدا، هەر دووكیان بەڵگەی نەقڵی و عەقڵی دەخەنـەڕوو بـۆ چەسپاندنی تێڕوانینەكەیان. گرنگن نییە لەگەڵ یان لە دژی لەچك بیـت، گـرنگ ئەوەیە لەگەڵ ڕێزگرتن لە جەستە بیت، وا ببینیت جەستە شوێنی ڕۆحە، كار لـە جەستە دەكات، جەستەش كار لە ڕۆح دەكات، بـە میـانڕەوی و ڕێـز و حورمەتـەوە هەڵسوكەوتی لەگەڵ بكەیت، پێشت وابێـت ئەگـەر ڕۆحمـان ڕزگـار كـرد فێـر ببین چۆن ڕێز لە جەستە بگرین.

## ئافرەت لە نێوان لەچك و شەرمدا :

لە كۆمەڵگە ئیسلامییەكاندا چەند ئافرەتێك دەركەوتوون لەچك دەپۆشن، لەبەرامبەردا هەندێك ئافرەتی تر نایپۆشن، كۆمەڵگە وا سەیری ئافرەتانی جۆری یەكەم دەكات، بەوەی پابەندن بە ڕێنماییەكانی ئاینی ئیسلام و ئەوان دیندارن، ئەوانی تر پابەند نین یان دیندار نین، لەلای هەندێك كەس بە تاوانكار و گوناهكاری ئاشكرا وەسف دەكرێن. ئەم واقیعە كۆمەڵایەتییە نەخۆشە وا لێمان دەخوازێ بڵێین لێرەدا جیاوازی بنەڕەتی هەیە لە نێوان لەچكی باو لە نێو ئافرەتاندا، لەگەڵ شەرم، كە پێویستە باو بێت. پێش دەستپێكردن بە ڕوونكردنەوەی مانای شەرم، پێم وابێ گونجاوە ئاماژە بدەین بەوەی شەرم پێویستە بە یەكسانی لە ئافرەتان و پیاواندا بێتەجێ، تەنها لەسەر ئافرەتان قۆرخ نەكراوە، چونكە لە تێڕوانینی ئێمەدا پایە و چاكەیەكە پێویستە هەمووان خۆیان پێبڕازێننەوە. هەروەك دەمانەوێ تێبینی ئەوەش بدەین كە لەوانەیە لە هەندێك ڕستەدا وشەی (حیجاب: لەچكی) بەدی بكەیت و مەبەست لێی سەرپۆش بێ، بەڵام ئێمە تەنها لەبەر ئەوە ئەم وشەیە بەكاردەهێنین چونكە بڵاوە و زۆر بەكاردێت.

شەرم و شكۆ، لە تێڕوانینی ئێمە بەستراوەتەوە بە كرۆك و ڕووكار، ناكرێ لەگەڵ یەكێكیان بێ بەدەر لەوەی تر. ئەركی شەرم و شكۆ بریتییە لەوەی پەیوەندییەكانی نێوان تاكەكانی یەك كۆمەڵگە یان كۆمەڵگە جیاوازەكان، بكاتە پەیوەندی مرۆڤایەتی، كە لەسەر ڕێز و خۆشەویستی و حورمەت و ڕاستگۆیی و خاكی بوون دامەزراوە، دوور لە ساختەكاری و درۆ و گزی و خۆهەڵكێشان و لوتبەرزی. شكۆ و شەرم بەم وەسفە ناكرێ لەلای تاك بەرجەستە ببێ، ئەو تاكە

**پیاو یان ئافرەت بێ، مادەم خاوەن چاکە و بەهای مرۆیی قوڵ نەبێ، سەرچاوەکەی ئـەدەب و فەلسـەفە و ئـایین و زانسـت و هونـەرەکان بـن، واتـە ئـایین یەکێکـە لـە سەرچاوەکان نەوەك تاکە سەرچاوە. شەرم و شکۆ دەگۆڕێ بە گۆڕانی ئـەم چـاکە و بەها مرۆییە لە کات و شوێنێکەوە بۆ کـات و شـوێنێکی تـر. ئـەوەی گرنگـە بـەلای ئێمـەوە لـە ڕوونکردنـەوەی مانـای شـەرم و شـکۆ لـەم بابەتـەدا، بریتییـە لـە پەیوەندیەکـەی بـە پۆشـاك و جـل و بەرگـەوە، ئایـا پەیوەسـتە بـە سـەرپۆش و لەچکەوە یان نا؟ ماف ئەوەمان هەیە حوکمی تاوانکاری و دینـدار نـەبوون بەسـەر ئـەوانی تـردا بـدەین، تـەنها لەبـەر ئـەوەی گونجـاو نـین لەگـەڵ حـەز یـان تێڕوانینەکانمان، کە پیاوانی ئاینی نەخشەکەی بۆمانی کێشاوە؟**

**لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا، ئافرەتانێـك هـەن لەچـك (حیجاب) دەپۆشـن، هەشیانە ناپۆشن، لـە هـەر دوو جۆرەکـەدا ئـافرەتی بـە شـەرم و بـێ شـەرم هـەن، بەمـەش بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە کـە چـوار جـۆری ئـافرەت هـەن، بـەپێی جـۆری پۆشاکیان، ئافرەتی لەچکداری بە شەرم، ئافرەتی لەچکداری بێ شەرم، ئافرەتی بێ لەچکی بە شەرم، ئـافرەتی بـێ لەچـکی بـێ شـەرم. ئـەوەی ئێمـە دەمانـەوێ باسـی بکەین لەو چوار جۆرە ئەوەیە دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکرێتـەوە شـەرم و شـکۆ دەبێ پێوەری دینداری بێ نەوەك لەچك، دەڵێین پێوەری دینداری نەوەك پێـوەری ئایین، چونکە ئایین پەیوەندی نێـوان مـرۆڤ و پـەروەردگارە، نـاکرێ بـە ڕووکـەش بڕیـاری لەسـەر بـدرێ. هـەروەك شـایەنی باسـە شـەرم و شـکۆ لـەو بەهایانـەن کـە بەهۆی خود و دەرئەنجامەکـەی داوا دەکـرێن، جـا سەرچـاوەکەی ئـایین بـێ یـان نـا. بەپێی ئەم تێگەیشتنە لەسەر کۆمەڵگە پێویستە ڕێز پێشکەشی ئافرەتی بە شـەرم و شـکۆ بکـات، بـەبێ ڕەچـاوکردنی ئـەوەی لەچـکی پۆشـیوە یـان نـا، بـەڵام واقیعـی دۆخەکە ئاماژە بە پێچەوانەی ئەمە دەکات، ئەو ئافرەتەی لەچـکی نەپۆشـیوە، لـە**

زۆربەی شوێنەکاندا هەڵسوکەوتێکی جیاوازی لەو ئافرەتەی لەچکدارە لەگەڵی دەکرێت، زۆر جاریش دووچاری سوکایەتی و تانە و تەشەر و لەوانەیە هەڕەشە و کوشتنیش ببێتەوە.

## هۆکارەکانی بڵابوونەوەی لەچك :

بڵاوبوونەوەی لەچك لە ناو کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا، لەگەڵ سەرەتای چارەگی کۆتایی سەدەی ڕابردوو دەستی پێکرد، دوای ماوەیەك کە زیاتر لە نیو سەدە بوو، لەچك ئەوەندە کەمبووەوە تا گەیشتە ئاستی نەمان. هۆکارەکانی دووبارە دەرکەوتنەوەی لەچك لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا، لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، لەوانەیە لە وڵاتێك گرنگی زیاتر هەبێ لەچاو وڵاتێکی تر، لەوانەشە لە وڵاتێکی دیکە خاوەن کاریگەرییەك نەبێ شایەنی باسکردن بێ،لەگەڵ ئەمەشدا دەکرێ ئەم هۆکارانە کورت بکەینەوە لە هۆکاری سیاسی و کەلتوری و کۆمەڵایەتی و ئابووری.

١- هۆکارە سیاسییەکان : خۆی دەبینێتەوە لەوەی حیزب باوەڕی وایە بڵاوبوونەوەی دیاردە ئاینیەکان، لە نێویاندا لەچك، لە ناو کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا بەڵگەیە لەسەر سەرکەوتنی و بەدەستهێنانی بنچینەی جەماوەری، کە مسۆگەری گەیشتنی دەکات بە دەسەڵات. هەروەك بەرەنگاربوونەوەی هەندێك حکومەتی خۆسەپێن بۆ لەچك، پاڵی بە بەرهەڵستکارانی حکومەت ناوە دەستی پێوە بگرن وەك جۆرێك لە جۆرەکانی دەربڕینی ڕەتکردنەوەی حکومەت، هەروەك لە عێراق ڕوویدا لە سەروبەندی حکومەتی بەعسدا. سەرباری ئەمە، ئەوەی حکومەتە خۆرئاواییەکان پێی

هەڵدەستن لە قەدەغەکردنی لەچك لە فەرەنسا بۆ نموونە، پاڵی بە ئافرەتانی موسڵمان نـاوە دەسـتبگرن بـە لەچـکەوە، وەك ئـامرازی بەرەنگاربوونـەوەی بەرامبەر.

٢- هۆکارە کەلتوریەکان: خۆی دەبینێتەوە لە فراوانکردن کردن و بڵاوبوونـەوەی (کەلتوری کەنداو) بەهۆی توانا ئابووریەکانی، کە پاڵ بە زۆرێك لە عەرەب و موسڵمانانەوە دەنێ کار لەم دەوڵەتانەدا بکەن، پێیان کاریگـەر بـبن، هـەروەك ئەم لەلای زۆرێـك لـە میسـریەکان بـەدی دەکرێت. بەهـەمان شـێوە کـەلتوری کەنداو زاڵبووە بەسەر زۆرێك لە ئامرازەکانی ڕاگەیانـدنی بیستراو و بینـراو و خوێنـراو، بەتایبەت کەناڵە ئاسمانیەکان.

٣- هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان: گۆڕانی پێوەرەکانی شـەرەف و ڕەوشـت، بەشـداربووە لە گۆڕانی ڕێگەی هەڵسەنگاندنی پیاوان بۆ ئافرەتان، چیتر شەرەف پەیوەست نییە بە گوفتار و کردارەوە، بەڵکو بە جەستەوە بەستراوەتەوە، ئەمـەش پـاڵی بـە ئافرەتـەوە نـاوە بـەدەم داخوازییـە تازەکانـەوە بچـێ لـەبارەی شـەرەفەوە. هەروەها گەشەکردنی قەیرانی کۆمەڵایەتی، بەتایبـەت کێشـەی هاوسـەرگیری، بەرزبوونەوەی ڕێژەی قەیـرەیی، پێشکەشکردنی لەچك بەوپێیـەی قەڵایـەکی کۆمەڵایەتییە بۆ ئافرەت، هەموو ئەمانە پاڵپشتی بوونی لەچکیان کرد.

٤- هۆکارە ئابووریەکان: بارودۆخی ئابووری هەندێك لـە ئافرەتـان ناچـار دەکـات پـەنا ببەنـە بـەر لەچـك، ئەمـەش لەبـەر نـەبوونی پێداویسـتیەکانی ڕووت و قوتی و خۆدەرخستن، ئەمە لـە عێـراق ڕوویـدا، لـە کـاتی گەمارۆکـەدا کـە لـە ساڵی ١٩٩١ — ٢٠٠٣ بەردەوام بوو، هەمان دۆخ سەبارەت بە زۆرێك لـە وڵاتـان و

ناوچە هەژارەکان. سەرباری زاڵبوونی سەرمایەدارانی کەنداو بەسەر بازاری کار و سەپاندنی لەچك بەسەر ئەو ئافرەتانەی حەزیان لە لەچ نییە.

## هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی لەچکی بێ شەرم و شکۆ :

لە سەرەتای دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم، لەچکی بێ شەرم و شکۆ دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد، وایلێهات لەچك گوزارشتی دەکرد لە شەرم و شکۆ، سەبارەت بە جلەکانی تر ئەوا هیچ پەیوەندیەکی پێوە نییە. ڕۆماننوس (می خالد) تاوتوێی ئەم بابەتەی کردووە لە وتارێکدا بە ناونیشانی (لەچکپۆشان... کچانی تر) شیکردنەوەیەکی دەروون و کۆمەڵایەتییە بۆ دیاردەی لەچکی بێ شەرم و شکۆ، لە گۆڤاری (روز ئەلیوسف) ژمارە (٤١١١) لە بەرواری (٣/ ٢٠٠٧) دەرچووە، تیایدا باسی هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی لەچکی بێ شەرم و شکۆ کراوە لەوانە ((ڕۆژەیەکی زۆر لەو ئافرەت و کچانە، لە ژێر فشاری کۆمەڵایەتی، نەوەك ڕێنمایی ڕاستەقینەی ئاینی لەچك دەپۆشن))، و ((ئەم حەزە بۆ بێ شکۆیی یەکەم هەنگاوە بەرەو داکەندنی لەچك بە یەکجارەی)).

یەکێك لە لەچکپۆشان لە هەمان وتاری باسکراوی سەرەوەدا دەڵێت: ((من لەچك دەپۆشم، بەڵام خۆم بە لەچکپۆش دانانێم، چونکە ناچارکراوم لەسەر ئەمە... لەچك وام لێدەکات بەرامبەر دۆستەکانم شیرین بم، بەڵام بە خۆم داخراو و سەغڵەت بم، لەبەرچاوی خەڵك لەچکپۆش بم... هەروەك گەنج و لاوان لە زانکۆ ڕاستەوخۆ لەگەڵمان دێنە ناو مشتومڕکردن لەبارەی ئاین، چونکە مشتومڕەکانی ئاین کۆتاییان دێت بە کێشمەکێش، تەنها بەدۆڕانی هەندێکمان لێی دەردەچین)).

ئەوەی بەدواداچوون دەکات بۆ دیاردەی بڵاوبوونەوەی لەچکی بێ شەرم و شکۆ، دەکرێ بگاتە چەند هۆکارێك شاراوە، لە خوارەوەدا باسی هەندێکیان دەکەین:

١- نەگونجان لە نێوان ئەوەی بیری لێدەکەینەوە لەگەڵ ئەوەی کاری پێدەکەین، ئەمەشش گوزارشت دەکات لە دەرەنجامی سروشتی بڵاوبوونەوەی کەلتورە بەریەککەوتووەکان لە توندڕەویەکەیاندا، ئافرەت بەدەستەوەسانی دەوەستێت بەرامبەر کەلتوری توندڕەوی ئاینی، کە ژمارەیەك لە پیاوانی ئاینی ڕابەرایەتی دەکەن، کەلتوری بەرەڵایی کە کەناڵ و دەزگا ڕاگەیاندنە جیاوازەکان سەرکردایەتی دەکەن، ئەمانە زاڵن بەسەر چەندین کاتژمێر لە کاتی ئافرەتی موسڵمان.

٢- یەکتر قبوڵ نەکردن، نەبوونی گفتوگۆ، نەمانی توانای پێشکەشکردنی ڕا و بۆچوون و قبوڵکردنی بەرامبەر، دەرچوونی هەمووان بە بیرۆکەی ئەوەی ڕاجیایی باسەکە تێکەڵ و پێکەڵ دەکات، دواتر بڵاوبوونەوەی دیاردەی توندوتیژی بەکارهێنراو دژی بەرامبەر، لەوانە بڵاوبوونەوەی توندوتیژی دژی ئافرەتان چ لە ناو خێزان یان کۆمەڵگە یاخود کۆمەڵە ئاینیەکان، هەر بۆیە ئافرەت پەنای بردووە بۆ خۆ پاراستن بە لەچك لە بەرامبەر ئەم توند و تیژییە.

٣- نەبوونی هۆشیاری زانستی ڕەسەن، کە لە توانایدایە ڕەفتاری مرۆڤ ڕێك بخات و دۆخێك لە هەمان دروست بکات لە نێوان ناوەڕۆك و ڕووکەش، کەلتوری خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون خەریکە لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا نەمێنێ، بەرامبەر بە بڵاوبوونەوەی کەلتوری گوێگرتن و ملکەچبوون بە فەتوا، کە دەستەوەردەداتە گشت وردەکارییەکانی ژیانی موسڵمانان.

## نيقاب و شەرم و شكۆ :

هەندێك لە پياوانى ئاينى نيقاب لەسەر ئافرەت دەسەپێنن، كەسى وا تياپان دەركەوتووە پێى وايە ئافرەتى بێ نيقاب تاوانكارە و بە ئاشكرا تاوان دەكات، ئەگەر لەچك پۆشيش بێ. لە تێڕوانينى ئێمە دا نيقاب هيچ پەيوەنديەكى نييە بە شەرم و شكۆوە، چونكە ڕێگە نادات بە دەركەوتنى هيچ شتێكى ئافرەت، هەر بۆيە ناتوانرێ بزانرێ بە شكۆيە يان نا، كار دەكات لەسەر داپۆشينى ئافرەت هەر لە تۆقى سەرى تا بەرى پێيەكانى، تا وايلێهاتووە وەك كيسێكى گەورە لێهاتووە، كە بەكاردێت بۆ پاراستنى دەنكەكان. ناكۆكيەكى زۆر ڕوويداوە لەبارەى دروستى و نا دروستى نيقاب، چ لە نێو پياوانى ئاينى، ياخود لە نێو بيرمەندە ئيسلامييەكا، ياخود لە نێو كەسانى نا پسپۆر لە بوارى ئايندا، لێرەدا ئێمە نامانەوێ بچينە نێو ئەم جۆرە گفتوگۆيانەوە، بەڵام ئێمە ئەوەندە بە تەواو دەزانين كە باسى چەند دێڕێك بكەين، كە دكتۆر ئەحمەد شەوقى فەنجرى نووسيويەتى لە وتارێكدا بە ناونيشانى (چەند فەرموودەيەكى لاواز ئافرەت سووك دەكەن) لە گۆڤارى (روز ئەليوسف) ژمارە (٤١١١) لە بەروارى (٣/ ٢٠٠٧) بڵاوبووەتەوە، پێمان وايە ئەو تێڕوانينە مرۆڤايەتييە پوخت دەكاتەوە، كە پێويستە لەلاى هەمووان بەڕێز بێ، بەتايبەت ئافرەتان، تيايدا هاتووە: (( نيقاب كەسايەتى ئافرەت بە تەواوى ڕەت دەكاتەوە... ڕووخسارى مرۆڤ بەڕێزترين شوێنى جەستەيەتى...، لە ديدى مندا ئەوەى هەوڵى ڕەتكردنەوەى ڕووخسارى مرۆڤ بدات، خراپترە لەوەى هەوڵى كوشتنى دەدات... جيهان هەمووى بە خۆرئاوا و خۆرهەڵاتەوە بڕيارى لەسەر ئەو گەلە دەدەن كە پاشكەوتووە، ئەوەى نيقاب لەسەر ئافرەتانى پێويست دەكات.

نیقـاب تــەنها ڕەتکردنــەوەی ڕووخســاری ئـافرەت نییــە... بــەڵکو ڕەتکردنــەوەی ئــادەمیزادی و عەقڵەکەیــەتی، ڕەتکردنـــەوەی ڕۆڵەکەیـــەتی وەك مـــرۆڤ لـــە کۆمەڵگەدا... ئەگەر هەنـدێك لەوانـەی بانگەشـە بـۆ نیقـاب دەکـەن پڕوپاگەنـدەی ئـەوە بکـەن ڕۆڵـی سـەرەکی ئـافرەت لـە ژیانـدا پەیامەکەیـەتی وەك ژن و دایـك... نەوەیـەك پـەروەردە دەکـات... خێزانێـك پێدەگەیـەنێ... ئـەوا ئـەم نیقابـە وای لێناکات گونجاوبێ بۆ ئەم پەیامە)).

## پوختە :

جل و بەرگ و پۆشاك دەگۆڕێن، بـەپێی گـۆڕانی کـات و شـوێن. ئـایین، هـەر ئاینێـك بـێ، جـل و پۆشـاکێکی دیـاریکراوی لەسـەر شـوێنکەوتووان نەسـەپاندووە. ئامــانج لــە پۆشــاکەکان بریتییــە لــە شــەرم و شــکۆداری، نــەوەك پڕکردنــەوەی حـەزەکانی پیـاوان. سەرچاوەی شـەرم و شـکۆ چـاکە و بەهادارییـە. سەرچـاوەکانی بەهاداری ئەدەب و فەلسەفە و ئاین و زانست و هونەرە جیاوازەکانە، نەوەك تـەنها ئایین. ئـەوەی ئـەمڕۆ ئێمـە لـەبارەی شکۆ و شـەرمەوە دەیـزانین نـاگونجێ لەگـەڵ بەهاداری. چونکە وایلێهاتووە بەها و چاکەکاری کورت هەڵبێت بە لەچك، ئەمەش ڕاسـت و دروسـت نییـە. شـەرم و شـکۆ پەیوەسـتە بـە نـاوەڕۆك و ڕووکەشـی تـاك بەیەکـەوە. ڕووکـەش بـەش بـەش ناکرێـت، بـەڵکو یەکەیەکـە تـەواوی جەسـتە دەگرێتەوە. ڕێزگرتن لە ئافرەتان نابێ پشت ببەستێ بە لەچك، کە بـە هەڵـە بـە (حیجاب) ناودەبرێ، بەڵکو پێویستە پشت بە شکۆ و شەرم ببەستێ. بڵاوبوونەوەی چەمك و مانا هەڵەکان لەبارەی دینـداری ئەوانـەی لەچك دەپۆشـن و نـا دینـداری ئەوانەی ناپۆشن، دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی گفتوگۆ و بڵاوبوونەوەی چەمکی نا ورد لـەبارەی دینــداری ســەروەربوونی چــەمك و ماناکـانی قـۆرخ کردنـی حەقیقـەت،

سەرباری بڵاوبوونەوەی لەچك لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ژمارەیەك هۆكار، لەوانە هۆكاری سیاسی و كەلتوری و كۆمەڵایەتی و ئابووری.

# ئیسلامی نوێ

## نووسەرە هاوچەرخەکان :

بـارودۆخی واقیعـی هەنوکـەی بـاو لـە تێکـڕای جیهانـدا، ئـەوە بەسـەر موسـڵماناندا دەسـەپێنێ بەشـێوەیەکی جیـاواز هەڵسـوکەوت بکـەن لەگـەڵ ئـەو واقیعەی لەسەری ڕاهاتوون، بەڵام ئەوەی ورد دەبێتـەوە لـە بـارودۆخی موسـڵمانان دەبینێ ئـەوان هێشتا بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکەن، کـە جیـاواز نییـە لـەوەی ئیسلام لەسەری بـووە پـێش چـەند سـەدەیەك. ئەمـە ئـەو حەقیقەتەیـە پـاڵی بـە زۆرێـك لـە توێـژەر و لێکۆڵـەرە ئیسـلامییە هاوچـەرخەکانەوە نـاوە، ئەوانـەی لێکۆڵینـەوەیان کـردووە لـە شـێوازەکانی بیرکردنـەوەی زانسـتی سـەردەمی، بـۆ قوڵبوونەوە لە قوڵاییەکانی هزری ئاینی و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لێی، بەشێوەیەك جیـاواز لـەوەی پیـاوانی ئـاینی نـەریتی لێـی تێدەگـەن. دەرەنجـامی لێکۆڵینـەوە و توێژینەوەکانیان بریتی بوو لـە دەرکـەوتنی ژمارەیـەك چـەمك و مانـای ئیسلامی جیاواز لـەوەی پیـاوانی ئـاینی نـەریتی هەڵیـدەگرن، دواتـر سیمای تـازە بـۆ ئـاینی ئیسـلام، خاوەنـەکانی پێیـان وایـە بەشـدار دەبـێ لـە بنیاتنـانی ئیسلامێکی تـازەی گونجـاو و هەماهـەنگ لەگـەڵ داخوازیـەکانی سـەردەم، تواناشـی زیـاتر بـێ لەسـەر بەرهەمهێنانی شارستانیەتی ئیسلامی هاوچەرخ، کـە بـارودۆخی موسـڵمانان بـەرز بکاتەوە، دوای ئەوەی ئیسلامی هاوچەرخ دەستەوەسـان بـوو لـە بەرجەسـتەکردنی ئەم مەبەستە.

## ئیسلامی تازە :

ئیسلامی تازە دەکرێ لە گشت کات و شوێنێك پەیدا ببێ، ئەو ئیسلامەی ئەمڕۆ لەلامان هەیە، ئیسلامێکی تازەیە، بەراورد بەو ئیسلامەی لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانیدا هەبوو، کە بە خاوەنی ئیسلامێکی تازە دادەنرا، بەراورد بە ئیسلامی سەردەمی خەلافەتی عەبباسی... جا بەم شێوەیە، هەر سەردەمێك ئیسلامێکی تایبەت بەخۆی هەبوو، بە تازە دادەنرا بەراورد بەوەی پێش خۆی، ئەو ئیسلامەی ئێمە بانگەوازی بۆ دەکەین، ئیسلامێکی تازە، بەراورد بەوەی باوە لەم سەردەمەماندا، کە چیتر گونجاو نییە بۆ ژیانی تازەمان و باروذۆخ و وردەکاریەکانی، ئەوەی پێی دەوترێت ئیسلامی نەریتی. ئەو ئیسلامە تازەیەی بانگەشەی بۆ دەکەین ڕۆژێك لە ڕۆژان پێویستی بە نوێسازی و گەشەپێدان دەبێ، تا ئیسلامێکی نوێ لە پاشی دەربکەوێ، هەوڵی گۆڕانکاری کۆنەکە دەدات بۆ ئەوەی بگونجێ لەگەڵ داخوازیەکانی چەرخی نوێی پێشهاتوو.

## سیماکانی ئیسلامی تازە :

ئەو سیمایانەی بانگخوازانی ئیسلامی تازە وێنەیان کێشاوە زۆرن، بەڵام پەرش و بڵاون لە نێو کتێب و توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانیان، هەروەك شێوازی نمایشکردنی ئەم سیمایانە و ڕێگەی کێشانەی نەخشەکە لە توێژەرێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، بەپێی پسپۆری و شێوازی لێکۆڵینەوە، کە پشتی پێدەبەستێت، بەڵام ئەوەی ورد دەبێتەوە لەم سەرچاوانە دەبینێ سیمای هاوبەشیان لە نێواندا هەیە، ئەگەر کۆیان بکاتەوە لە شێوەیەکدا، ئەوا نزیك دەبێ

لـەوەی تەواوكـەر بـێ. لـە خـوارەوەدا دیـارترین و گرنگترینـی ئـەو سـیمایانە خراونەتەڕوو، هەروەك دەیبینین:

__یەكەم__: ئیسلامی تازە ڕێز لە عەقڵ دەگرێ، دەیكاتە چەقی بنچینە لە درك كردن بـە ماناكـانی بـوون و ئامانجەكانی، لەسـەر ئەمـە ئـەوە كەڵەكـە دەبـێ بیرۆكـەی شوێنكەوتن و لاسایكردنەوە قبوڵ نەبێ، دواتر هیچ شوێنی قەدەغە و هێڵی سوور بوونیان نییە، گشت پرسەكان ملكەچی دەسەڵاتی عەقڵن.

__دووەم__: ئیسلامی تازە بانگەشەی ئەوە ناكات حەقیقەتی قۆرخ كردووە، بـەڵام دژی ئەو بانگەشەیە نییە كە دەڵێت حەقیقـەتی لایـە، لەوانەیـە ئـەم بنەمایـە كێشمان بكات بۆ بنەمای فرەیی ئاینی، بەو مانایەی گشت ئاینـەكانی تـریش حەقیقـەتیان لایە و هەمووان لەسەر خێـرن، بەهەشـت تـەنها لەسـەر موسـڵمانان قۆرخ نـەبووە، بەڵكو مافی گشت مرۆڤێكە بەبێ ڕەچاوكردنی ئاینەكەیان.

__سێیەم__: ئیسلامی تازە ڕێز لە مـرۆڤ دەگـرێ، دەیكاتـە بـەهای باڵا لـە بوونـدا، هـەر بۆیە بەكارهێنانی تووند و تیژی ڕەت دەكاتەوە لە ژێر هـەر پاساوێكدا، سزای لـە ئایین هەڵگەڕانەوە لە ئیسلامی تازەدا بوونی نییە، مرۆڤ بـۆی هەیـە ئاینی خـۆی هەڵبژێرێت، ئەگەر قەناعەتی بە ئاینی باوانی نەما.

__چوارەم__: ئیسلامی تازە بیرۆكەی پیرۆزی ڕەت دەكاتەوە، بەتایبەت سەبارەت بـەوەی پەیوەسـتە بـە كەسـەكانەوە، هـەر بۆیـە دەكـرێ ڕەخنـە لـە هـەمووان بگـیرێ و بەرهەڵستیان بكرێ، چ كەسایەتی مێـژوویی یـان كەسـایەتی هاوچـەرخ بـن، دواتـر پیاوانی ئاینی، ئەگەر لە ئیسلامی تازەشدا هـەبن، ئـەوا پـیرۆز و پـارێزراو نـین لـە هەڵە، هیچ ڕاسپاردنێكیان لەلایەن خـواوە بەسـەر بەندەكانـدا نییـە، قەمچی خـوا نییە لەسەر زەویەكەی.

بە کورتی، ئەو ئیسلامە تازەیەی دەمانەوێ، قۆرخ کردن و توونـدڕەوی و دواکەوتوویی ڕەت دەکاتەوە.

## سەرکردەکانی ئیسلامی تازە:

سـەرکردەکانی ئیسلامی تـازە، پیـاوانی ئـاینی نـەریتی نـین، بـەو مانایـەی سـەریان بـە دامـەزراوە ئاینیـە نەریتیەکانـەوە نییـە، بـەڵکو توێـژەر و لێکۆڵـەری ئەکادیمین، هەردەم کار دەکەن لە دامەزراوەکانی زانکۆیی و لێکۆڵینەوەی پسپۆری، هەر بۆیە بەوە جیا دەکرێنەوە شوێن پەیڕەوەکانی توێژینەوەی زانستی دەکـەون، کە یەکێك لە گرنگترین خەسڵەتەکانی بریتییە لە گومان کردن لە گشت پرسێکدا، تا ئەو کاتەی ڕاستیەکەی دەسەلمێنرێ، دانپێدانی پێشوەختە بە دروستی پرسەکان ڕەت دەکەنەوە. یەکێك لە پرسەکانی تر ئەوەیە، ئەوان یەکێك لەوانەی شارەزان لە هزری ئاینی زۆربەی ئاینەکان، نـەوەك تـەنها ئـەو ئاینـەی لەسـەری پێگەیشـتوون، ئـەم تایبەتمەندییـە یارمـەتی ئـەوانی داوە بـۆ تێگەیشـتن لـە پەیوەنـدی سـەرەکی نێوان ئاینەکان، هەروەك یارمەتیدەری ئەوانیش بووە بۆ تێگەیشتن لە بەرامبەر و دۆزینەوەی پاساوەکان بـۆی، سـەبارەت بـەوەی بـاوەڕی پێـی هەیـە، بـێ پەنابردنـە ئەوەی بـە هەڵـە دایبنێ یـان تـەکفیری بکـات، هـەروەك پیـاوانی ئـاینی نـەریتی وا دەکەن.

پێمـان وایـە ئـەم نووسـەرانە، سـەرکردەی ئیسـلامی تـازەن، زۆرن و نـاکرێ بژمێردرێن، بەڵام کێشە نییە لە باسکردنی هەندێکیان، بۆ ئەوەی ببنە نموونەیەك بۆ ئەوەی باسمان کرد نەوەك بـۆ جیاکردنـەوەیان لـە نووسـەران و توێـژەرانی تـر، لەوانەش بۆ نموونە نـەوەك بـۆ کورت هـەڵهێنان: نەسرِ حامـد ئـەبو زەیـد، عـەلی وەردی، عەبدولکەریم سروش، سەید مەحمود قومنی، محەممەد سەعید عەشماوی،

فەرەج فودە، محەممەد ئەركون، جگە لەوانيش، هەر يەكێكيان بايەخى داوە بە لێكۆڵينەوە لە لايەنێك لە لايەنەكانى ئايين و دينداری بەپێی بواری پسپۆڕيەكەيان، ئەم لێكۆڵينەوانەيان پارمەتيدەريان بووە بۆ ڕۆشنايى خستنەسەر چەند ناوچەيەكی ئايين، كە ناڕۆشنى دەوری داوە و تاريكی دايگرتووە.

دەبينين نەسر حامد ئەبو زێد لێكۆڵينەوەى كردووە لە مانا دەقى ئاينى، لەلايەنى زمانەوانى و چۆنيەتى هەڵسوكەوت كردن لەگەڵيدا، بەدرێژايى مێژووى دوور و درێژى ئايين، كە چۆن ئەم دەقە بوومتە شتێكى پيرۆز، كە ناكرێ كۆشش لە تێگەيشتنيدا بكرێ، بەهۆى ئەوەى پياوانى ئاينى ڕاڤەكەيان قۆرخ كردووە، هەروەها چۆن ئەو بنچينەيان دانا (كۆشش لە بەرامبەر دەقدا نييە)، دواتر دەقيان چوارچێوەدار كرد و چەقيان پێبەست لە تابوتێكدا، كە ناتوانرێ لێی لابدرێ، ئەگەر لە ڕووى زانستيشەوە نەگونجاويەكەى بۆ واقيعى هاوچەرخ بسەلمێ.

سەبارەت بە دكتۆر عەلى وەردى، ئەوا گرنگى داوە بە لێكۆڵينەوە لە پەيوەندى نێوان كۆمەڵگە و ئايين، چۆن كار لە يەك دەكەن، جەختى كردۆتەوە لەسەر شێوازى وتاردانى باو لە ناوەندە ئاينيەكان، كە بەرپرسە لە بڵاوبوونەوەى دووڕوويى كەسايەتى لەو كۆمەڵگانەدا، كە ڕۆڵى پياوانى ئاينى بە بەرز دەگيرێ. زۆربەى پياوانى ئاينى بە درێژايى سەردەمە جياوازەكان، وتاربێژى دەسەڵات بووينە، نەوەك خزمەتكارى خوا و مرۆڤ.

عەبدولكەريم سروش پێی وايە زياد لە ڕێگەيەك هەيە، دەكرێ مرۆڤ پێی بگاتە كامڵى، فرمىی ئاينى تاكە ڕێگەيە بۆ ژيان لەم جيهانەدا بە سەلامەت و ئاشتى، ناكۆكيەكانمان ئەمڕۆ — هەروەك بە درێژايى مێژووش هەر وابووە —

ناکۆکی ئاینین لە بنەڕەتدا یان بەلایەنی کەمەوە بەشێوەیەکی زۆر ئاینی تێدا قۆزراوەتەوە.

سەید قمنی جەختی کردۆتەوە لەسەر ئەوەی ئاینەکان لە بۆشایەوە دروست نابن، بە یەك کەرەت نایەتە بوون، بەڵکو ملکەچی چەمکی گەشە و گۆڕانکارییە. جیاکراوە نییە لە یەکتری، بەڵکو لە نێو یەکدا بەیەکەوە بەستراوە، زۆرێك لە هزر و تێڕوانینەکان لەبارەی گەردوون و بەدیهێنەر، کە لە ئاینەکانی پێشوودا باو بوون، هێشتا لە ئاینە هاوچەرخەکانیشدا بوونیان هەیە، تەنها هەندێك گۆڕانی سادەی بەسەردا هاتووە، کە وایلێدەکات هەماهەنگ بێ لەگەڵ سروشتی ئەو کۆمەڵگانەی ئاینەکەیان تێدا پەیدابووە.

محەممەد سەعید عەشماوی تیۆرەکەی پێشکەش کردووە لەبارەی (یەکێتی ئایین و فرمیی شەریعەتەکان)، تیایدا جیاوازی کردووە لە نێوان ئایین و هزری ئاینی، لەنێوان شەریعەت و فیقهـ، لە نێوان حکومەتی خوا و حکومەتی خەڵکدا. ئەمە جیاکاریەکی پێویستە، دەبێ هەبێ بۆ تێگەیشتن لە ئایین بەشێوەیەکی ڕاست و سوودبەخش بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگە. ئەو هزرە ئاینیەی ئەمڕۆ باوە، لە زۆربەی جاراندا دەرەنجامی بارودۆخی کۆمەڵایەتییە، کە باوبووە لە سەردەمی پیاوانی ئایندا، کە دایانڕشتووە، کاریان لەسەر نووسینەوەی کردووە، وەك ئەوەی خودی ئایین بێ، ئەمەش دروست نییە.

بە سروشتی حاڵ ناتوانرێ بەدواداچوون بۆ هزرەکانی گشت ئەم نووسەرانە بکرێ، بەڵام پێویستە لەسەرمان بڵێین، پێویستە لەسەرمان بڵێین تەبا یان نا تەبا بین لەگەڵ ئەم هزرانە، شارەزابوون لێیان بە دیدی ئێمە لە پێویستییەکانە. چونکە ئاسۆکان دەکاتەوە لەبەردەم عەقڵ بۆ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و ژیان لە

دۆخێك لە ڕامان و بیرکردنەوە، کە کار دەکات لەسەر بەرز کردنەوە و پێشخستنی مـرۆڤ، لـە کـاروانی کـامڵبوونی ویـژدانی و شـارەزاییەکەیدا، دواتـر تێگەیشتنی لـە مانای بوون و ئامانج و ڕێگە و ڕێبازەکانی ژیان، بە مانایەکی تر وای لێدەکات لـە مانا و ناوەڕۆکی ئایین بگات.

## ڕابەرە بەراییەکان :

ئەو ناوانەی کەمێك پێش ئێستا باسمـان کـردن، ڕێبـەر نەبوونـە لـە بـواری لێکۆڵینەوەی ئاینـدا، بەتایبەت ئیسلامیدا، چـەندین نـاو و کەسـی تـر پـێش ئـەوان ڕۆڵی باڵایان گێڕاوە لە نوێکردنەوەی ئاینی ئیسلامی و ڕێگەی بیرکردنـەوە و درك پێکـردن و هەڵسوکەوت کـردن لەگـەڵی، لـەو نـاوە دیارانـە: تاهـا حوسـێن، عـەباس عەققاد، ئەحمەد ئەمین، محەممەد حوسێن هەیکەل، تۆفیق حەکیم. شایەنی باسە خوێنەر ئەم نووسەرانە دەناسـێ وەك ئـەوەی لێکۆڵـەر بـن لـە بـوارە ئەدەبیەکانـدا (شیعر و چیرۆك و شانۆ و جگە لەمانەش لە هونەرەکانی ئەدەب)، بەڵام لەوانەیـە ئـەوان وەك لێکۆڵـەر نەناسـێ لـە بابەتـە ئیسلامییەکان، لەوانەیـە هۆکـاری ئەمـە بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی ئـەم نووسـەرانە شـتیان نووسـیوە لـە بـواری ئەدەبیـدا، نەچوونەتە سەر بابەتە ئیسلامییەکان، تەنها نزیکەی لە سیەکانی سەدەی ڕابردوو نەبێت.

هەنـدێك لـە توێـژەران پێیـان وایـە وەرچـەرخانی ئـەم نووسـەران بـۆ توێژینەوەی بابەتە ئیسلامییەکان، جۆرێکە لە هەڵگەڕانەوە شارستانی یان شکست، کە وای لەوان کردووە واز بهێنن لە بەخشین و بە تەواوی ڕووبکەنـە توێژینـەوەی مێـژوو و کەسـەکانی، لـە جیـاتی توێژینـەوەی ئێسـتاش و ڕوو لـە ئاینـدە کـرد. هەندێکی تـر پێیـان وایە وەرچەرخانی ئـەو نووسـەرانە بۆ توێژینـەوەی بابەتـە

ئیسلامییەکان (هەڵکوتانەسەرێك بوو لەلایەن ڕۆشنبیرانەوە بۆ سەر نەزانی و ئەفسانە)، پێشتر و ئێستاش لەلای زۆربەی پیاوانی ئاینی نەریتی باون.

لەوانەیە ڕۆژگار ئەوەی سەلماندبێ ڕای دووەم ڕاستترە، لە ئامانج پێکانەوە نزیکترە، ئەوەی ئەم نووسەرانە کردویانە شایستەی ڕێز و حورمەتێکی مەزنە. لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەم ئەگەر بڵێم زۆرێك لەو ناوانەی باسمان کردن وەك: عەلی وەردی، سەید قمنی، فەرەج فۆدە، نەسر ئەبو زەید، محەممەد سەعید عەشماوی، جگە لەوانیش، لەوانەی کە کاریگەربوونە یان قوتابی ئەو نووسەرە پێشەنگانەن، هەر بۆیە ڕۆڵی نوێکاری، کە تاها حوسێن و ئەحمەد ئەمین و عەققاد و هەیکەل و حەکیم گێڕایان، لە سەدەی ڕابردوو، هەمان ئەو ڕۆڵەیە کە قمنی و نەسر ئەبو زەید و عەشماوی و جگە لەوان دەیگێڕن لە سەدەی ئێستادا. ئەوەی لەبارەی نووسەرە ڕابەرەکانەوە وتراوە، هەمان ئەو شتە دەوترێ لەبارەی نووسەرە هاوچەرخەکانیش، هەمووان (ویستویانە ئیسلام زیندوو بکەنەوە بەشێوەیەکی تازە، پشت نەبەستێ بە مەتەڵ و تەلیسم، کە لەسەر پەراوێزەکان کۆببوونەوە، تا وایلێهاتووە عەرەبی موسڵمان توانای شیکردنەوە و زانینی ئەمانەی نییە). هەر بۆیە (پێویستە سوپاسیان بکەین، چونکە خۆیان ڕۆشن کردۆتەوە بە زانستە شارستانیە نوێیەکان، وەك زانستەکانی دەروونزانی و کۆمەڵناسی و مێژوو و فەلسەفە، ئا ئەوان قەرزی کەلەپوری ئوممەتەکەیان دەدەنەوە، دووبارە چاوی پێدادەخشێننەوە، لێی ڕادەمێنن، لە تاریکییەکانی گۆڕ و کفنە کۆنەکانی زانیاری زیندوو و تازەبووەوەی هاوچەرخ دەردەهێنن).

پێش کۆتایی هێنان بەم برگەیە دەبینین گونجاوە ئەوە یاد بخەینەوە، کە تاها حوسێن وتویەتی لەبارەی ئەو ڕۆڵەی خۆی و هاوڕێکانی لە نووسەران

گێڕاویانە، لە بواری لێکۆڵینەوە لە بابەتە ئیسلامییەکانی و ڕووبەڕووبوونەوەی قۆرخکاری، کە پیاوانی ئاینی نەریتی پیادەی دەکەن، دەڵێت: ((زۆرینە کەوتبووە ژێر قورسایی ڕاڤە نازانستییەکانی شێخەکان، لە وەرگرتنی ئیسلامدا. ئێمە گیان فیدایی ڕاستەقینەمان هێنا و خۆمان کرد بەم گۆڕەپانە داخراوە بەسەریاندا. ڕۆیشتنە لای ئەوان لە چەقی ماڵەکەیاندا، بۆ ئەوەی موسڵمانان ئاگادار بکەینەوە لە مێژووی حەقیقیان... ئایا هۆکارەکانی ئەو تورەیی بڵێسەدارە و شۆڕشە مەزنە چییە کە سەلەفییە پارێزگارەکان هەڵیان گیرساندووە؟ ئایا ئەمە لەبەر ئەوە نییە ئێمە هێرشی پێگە تاریکەکانی ئەوانمان کردووە، ڕووناکی خۆر و هەوای پاکمان زاڵ کردووە تیایدا و پەردە گومڕاکەرەکانمان لاداون. وامان پێباشتر بوو هەزاران کەس ڕزگار بکەین لە زاڵبوونی دیکتاتۆری نەزانی و بەندایەتی کردنی دەوڵەتی ئەفسانە، لە جیاتی ئەوەی وەك دیلی پێ سەرسام بوونی ڕۆشنبیران، پوختەی ڕۆشنبیران بمێنینەوە)).

## ناسینی ئایین لەسەرچاوەیەکی تر :

لەوانەیە وا گونجاو بێ بوترێ، لەسەر تاك پێویستە تەنهل پشت بە پیاوانی ئاینی نەریتی نەبەستێ بۆ ناسینی ئایین و دینداریەکەی، بەڵکو لەسەری پێویستە پەنا بۆ لێکۆڵەران و توێژەرانی ئەکادیمی ببات لە دەرەوەی دامەزراوەی ئاینی نەریتی، بۆ بەدەستهێنانی ئەم مەبەستە، چونکە توانیویانە زانست و زانیاریەکانی تازە بزانن، کە شایستەیان بکات بۆ تێگەیشتن لە سروشتی ئایین و دینداری بە ڕێگەیەکی جیاواز لەوەی پیاوانی ئاینی نەریتی دەیزانن، لەوانەیە ئەم تێگەیشتنەیان بەسوودتر بێ بۆ تاك و کۆمەڵگە، هەماهەنگتر بێ لەگەڵ واقیعی

ژيانى هاوچەرخ. لەوانەيە زيادەڕەوى نەكەم ئەگەر بڵێم ئەوانـەى تـەنها پشت بـە پيـاوانى ئـاينى نـەريتى دەبەسـتن، بـۆ ئاشـنابوون بـە ئـايين و دينداريەكـەيان، لـە هەموو خەڵك نەزانـترن سەبارەت بە ناوەڕۆك و ماناى ئايين، چونكە پياوانى ئاينى ئەمڕۆ، زۆربەى جاران لە هەموو خەڵك دەمارگيرترن بۆ ئـايين و مەزهەبەكـەيان، زۆر جـاريش لەوانــەن كـە بانگەشـەى قـۆرخ كردنـى حەقيقـەت و قـۆرخ كردنـى بەهەشـتيش دەكـەن بەهـەمان شـێوە، بـە ديـدى ئێمـە ئـەو پياوانـەى ئـەم جـۆرە بيروباوەڕەيان هەڵگرتووە، ناتوانن درك بكەن بە ناوەڕۆكى ئايين و ماناى دينداري، هـەر بۆيـە پێمـان وايـە هەڵەيـە پشتيان پـێ ببەسـتين تـەنها لـە ناسـينى ئـايين و دينداري، چونكە ئەوەى شتێكى نەبێ پێى نابەخشرێ.

## لێكۆڵەرە ئەكاديميەكان و پياوانى ئاينى نەريتى :

لەوانەيە ئەم بانگەوازەى بانگەشەى بۆ دەكەين، هۆكارى ئـەو دوژمنايەتيـە بێ، كە دامەزراوەى ئاينى هەيەتى، بەرامبەر توێژەران و لێكۆڵەرە ئەكاديمييەكان، بەتايبەت ئەوانەى كار لەسەر بابەتەكانى ئايين و دينداري دەكەن. لەوانەيە ئەوەى ڕاستى وتەكەمان دەسەلمێنێ ئەوەبێ كە هەموو توێـژەران، كـە لـە پێشـتردا باسمـان كـردن، ڕووبـەڕووى چـەندەها جـۆرى تـەنگپێ هەڵچـنين بوونەتـەوە، كـە دوور خستنەوە لە وڵات دەگرێتەوە، هەروەك ئەمە ئەنجامدرا لەگەڵ نەسـر حامـد ئـەبو زەيد، يان هەڕەشە لێكـردن بـە كوشـتن، لـە دۆخـى تۆبـە نـەكردن و نەوەسـتان لـە نووسـين، هـەروەك لەگـەڵ سـەيد قمنـى ئەنجامـدرا، يـان تەنانـەت بـە كوشـتنيش، هەروەك لەگەڵ فەرەج فۆدە پەيڕەوكرا.

پیـاوانی ئـاینی نـەریتی پێیـان وایـە، توێـژەران و لێکۆڵـەران کێبڕکێکـاری ئەوانن، دەترسن لە بڵاوبوونەوەی هزر و بۆچوونەکانیان، کە بانگەشـە دەکـەن بـۆ ملکەچ نەبوون بۆ دەسەڵاتی دامەزراوەی ئـاینی، کە وایلێهاتووە دەستەوەسـانن لـە دابینکردنـی سـوود بـۆ تـاك و کۆمەڵگـە، هەنـدێك پێیـان وایـە زیـانی لـە سـوودی زۆرتـرە. لەوانەیـە ئـەم ترسـە کـۆن بـێ لـە نـاخی پیـاوانی ئاینیـدا، خوێندنـەوەی مێـژووی دامــەزراوە فێرکارییــەکان لــە عێراقــدا بــۆ نموونــە ئامــاژە دەکــەن بــە بەرهەڵسـتی پیـاوانی ئـاینی، بـە پاسـاوی ئـەوەی لـە پیلانـی داگیرکەرانـە، بـۆ لاوازکردنی دامەزراوە ئاینیەکان، کەم کردنەوەی لایـەنگیری خـەڵك بۆیـان، هێشـتا ئەم هزرە ماوە لە گوێچکەی زۆرێکیاندا، دەبینی جار بۆ جار خەڵکی پاڵدەنێن دژی قوتـابیی و زانکۆکـان، بـە پاسـاوی ئـەوەی گەنـدەڵی و لادان و تێکـەڵاوی تێدایـە، تێکدەگیرێ لەگەڵ ڕێنماییەکانی ئاینی یەکخواناسی!!

ئەم ململانێیە شاراوەیە و هەندێك جار ئاشکرایە، وایلێهاتووە لـە چارێکی کۆتایی سەدەی بیستەمدا، دەڕژێتە خزمـەت بەرژەوەنـدی پیـاوانی ئـاینی، بـەهۆی چەندین مەبەستەوە، لێرەدا بوار نییە بۆ باسکردنیان. لەوانەیە ئەمە پاڵی بە بە ژمارەیـەك لـە پیـاوانی دامـەزراوە ئەکادیمیەکانـەوە نـابێ، لایـەنگیری خۆیـان بـۆ پیاوانی ئاینی دەرببڕن، ئەمەش یان بەهۆی ترسانە لە دەسـەڵاتیان یـاخود بـەهۆی حەزکردنە لە سوود لێ بینینیان. وای لێهاتووە شـتێکی بـاوە مامۆسـتایەکی زانکـۆ ببینی، هزری پیاوانی ئـاینی نـەریتی لـە مێشـکیدا هـەڵگرتبێ، چونکە بـۆ نموونـە دانەوەی وانەی پەرەسەندن بە کوفر و ئیلحاد دەزانێت. ئەوەم دۆخە کە مامۆستای زانکۆ پێی گەیشتووە، تەنها ناگەڕێتەوە بۆ زاڵبوونی دەسەڵاتی دامەزراوە ئاینیـەکان و زاڵبــوونی بەســەر لایەنــەکانی ژیــان و کۆمەڵگــەدا، بــەڵکو بەلایــەنی زۆرەوە دەگەڕێتەوە بۆ پاشەکشەی ڕۆڵی دامەزراوەی فێرکاری لە دەرچوواندنی توێژەران و

لێکۆڵەرانی توانادار لەسەر ڕووبەڕووبوونەوەی هزری ئاینی نەریتی. لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەین ئەگەر بڵێین، پاشەکشەی ڕۆڵی دامەزراوەی فێرکاری بەرامبەر گەورەبوونی ڕۆڵی دامەزراوەی ئاینی نارژێتە خزمەتی بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵگە، لەوانەیە ئەمە ئەو شتەبێ کە واقیعی ژیان جەختی لەسەر دەکاتەوە، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕوو لە داڕوخان دەکات.

# ئایین و دینداری لە دیدی عەبدولکەریم سروشەوە

## پسپۆری زانستی :

عەبدولکـەریم سـروش لـە تـەهرانی پایتـەختی ئێـران لـە سـاڵی (١٩٤٥) لەدایکبووە، لە خوێندنی زانکۆیەکەیدا هاموشۆی کردووە لە نێوان خوێندنی ئاینی و نا ئاینیدا، سەبارەت بە خوێندنی زانکۆیەکەی، ئەوا لە کۆلێـژی دەرمانسازی لـە تەهران بووە، دواتر توانی هەلی خوێندن بەدەست بخات لـە بـەریتانیا لـە ڕێگـەی شاندەوە، لە شاری لەنـدەن لقـی کیمیـای ئـەزموونی خوێنـد، لـە هـەمان کاتـدا لـە زانسـتی مێـژوو و فەلسـەفەی زانسـتەکان لـە هـەمان زانکـۆدا دەیخوێنـد. لەگـەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئێران لە ساڵی (١٩٧٩) گەڕایەوە تاران، دوای ماوەیەك چووەتە زانکۆی تاران و بڕوانامەی دکتۆرای بەدەستهێناوە لە فەلسەفەی ئیسلامدا.

## چوار تیۆرەکەی سروش :

ئەم تێکەڵە زانستیەی عەبدولکەریم سروش هەیبوو، وای لێکـرد شایسـتەبێ بۆ ئەنجامدانی توێژینـەوە لە چەندین پرسی ئایندا بە شێوەیەکی بوێر و ورد، زۆر یارمەتیـدا لـە قوڵبوونـەوە لـە چـەندین بابەتـەدا، کـە هەنـدێك کـەس دوودڵـن لـە دەسـتەوەردان لـەم بابەتانـەدا. دیـارترین دانراوەکـانی سـروش: (بەرتەسـککاری و بەرفراوانکاری لە شەریعەتدا)، (بەرفراوانی ئـەزموونی پێغەمبـەر)، (چـەند ڕێگـە ڕاستەکە)، (ئاینی عەلمانی)، (عەقڵ و ئازادی). گشت ئەم دانراوانەی پشت دەبەستن بە فەلسەفەی زانست و زانستی مەعریفە (ئەبستمولوژیا).

سروش لە دانراوەكانی پێشوویدا، بیرۆكەكانی سەرەكییەكانی خستۆتەڕوو، لەبارەی ئایین و شارەزایی ئاینی، كە چوار چەمك یان تیۆری سەرەكی لە خۆ دەگرێ: ١) مرۆیی و مێژوویبونی شارەزایی و زانستی ئاینی، ٢) مرۆیی و مێژوویبونی ئایین و ئەزموونی ئاینی، ٣) فرەیی ئاینی، ٤) عەلمانیەتی ئایین. ئەم چوار چەمك یان تیۆرانە، بەپێی تێڕوانینەكەمان، گوزارشت دەكەن لە چەند بنچینەیەكی سەرەكی لە بنچینەكانی ئیسلامی تازە، كە كار لەسەر دامەزراندنی دەكات، بێ هیچ ڕێكەوتنێكی پێشوەختە، بەڵكو لەبەر ئەوەی بوونەكەی پێویستە، ژمارەیەك لە لێكۆڵەرانی ئەكادیمی و لە نێویاندا عەبدولكەریم سروش كار لەسەر دامەزراندنی دەكەن.

## مرۆییبوونی زانست و شارەزایی ئاینی:

عەبدولكەریم سروش جیاوازی دەكات لە نێوان ئایین و شارەزایی ئاینی، ئەمە جیاكارییەكی هاوشێوەی ئەوەیە كە محەممەد سەعید عەشماوی كردی، كاتێك جیاوازی كرد لە نێوان ئایین و هزری ئاینی. ئەم جیاوازیە پێویستە بۆ تێگەیشتن لە ئایین، چونكە یارمەتیدەرە بۆ جیاوازی كردن لە نێوان شەریعەتی شوێنكەوتووی ئایین، لەگەڵ فیقهی شوێنكەوتووی شارەزایی ئاینی. سروش ناوی (بەرتەسككاری و بەرفراوانكاری لە شەریعەتدا)، ئەو مەبەستی لە بەكارهێنانی هەر دوو وشەی (بەرتەسككاری و بەرفراوانكاری) ئاماژەدانە بە ڕەگەزی وەرچەرخان و گۆڕان، فراوانی و تەسكی، نەرمی و ڕەقی، كە لە هەموو شتێكدا هەن، لە نێویاندا شارەزایی ئاینی (فیقە)، سروش ئەم خاڵانەی خوارەوەی نووسیوە: (١) ئایین، لە دیدی باوەڕداراندا، هیچ تێكگیران و دژیەكیەكی تێدا نییە،

سەبارەت بەشارەزایی ئاینی ئەوا تێکگیران و ڕاجیایی تێدایە. (٢) ئایین، لە دیدی باوەڕدارانـدا هـەمووی ڕاسـتی و حەقـە، بـەڵام شـارەزایی و مەعریفـەی ئـاینی تێکەڵەیەکە لە ڕاستی و هەڵە. (٣) ئایین تەواو کامڵە، بەڵام شارەزایی ئاینی تـەواو کامڵ نییە. (٤) ئایین چەسپاو و جێگیرە، بەڵام شارەزایی ئاینی گۆڕاوە.

سروش سورە لەسەر ئەوەی شارەزایی ئـاینی وەك گشت زانیاریـە زانسـتی و فەلسەفیەکانی تر، زانیاری مرۆیین، مانای ئەوەی مرۆییە، ئەوەیە: یەکەم، لەسـەر دەسـتی مـرۆڤ پەیـدا دەبـێ و لـەدایك دەبـێ. دووەم، خەسـڵەتەکانی مـرۆڤ و سیفەتەکانیان کۆ دەبنەوە لە ناو ئەو زانیاری و شارەزایەی کۆیان کردۆتەوە، نـەك تەنها هێزە ژیرەکەیان، کە ڕاست لە ناڕاست جیا دەکاتەوە، هەوڵ دەدات بـۆ کـورت هەڵهێنانی حوکم لە دەستی بەڵگە و لۆژیکدا.

بەهەمان شێوە پێی وایە، زانیاری و شارەزایی ئاینی، پەیوەستە بە شارەزایی و زانیارییـە مرۆییـەکانی تـرەوە، لێیـان وەردەگـرێ، دواتـر زانیارییـە مرۆییـەکان، تێگەیشـتنی ئـاینی دەوڵەمەنـد و قـوڵ دەکەنـەوە. ئـەم بەسـترانەوەیە لـە نێـوان شارەزایی ئاینی و گشت زانیاری و شارەزاییەکانی تر، وا دەکەن شارەزایی و زانیاری ئاینی ملکەچی هەمان ئەو شتە بن کـە زانیـاری مرۆیـی ملکەچیەتی، لـە گـۆڕان و گەشەپێدان و گۆڕین و سڕینەوە و بۆ زیـادکردن، واتـە دووچاری بەرتەسـککاری و فراوانکاری دەبێتەوە، سروش لەم بـارەوە دەڵێـت: ((ئەگـەر زانیاریـە نـا ئاینیـەکان دووچـاری بەرتەسـککار و فراوانکـاری بوونـەوە، ئـەوا دەبـێ تێگەیشـتنی ئێمـەش ڕووبەڕووی بەرتەسکی و فراوانی ببێتەوە، هەنـدێك جار بەشـێوەی لاواز و سـوك، هەندێك جاریش بەشێوەی توونـد و بەهێز)).

## مرۆییبوونی ئەزموونی ئاینی :

سروش تەنها دەستی بەوە هەڵنەگرت جەخت بكاتەوە لەسەر مرۆییبوونی زانست و زانیاری ئاینی، بەڵكو بۆ زیاتر لەمەش ڕۆیشتووە، ئەویش مرۆییبوونی خودی ئاینە، لە میانەی مرۆییبوونی ئەزموونی پێغەمبەرایەتی. پێی وایە ئایین وەڵامدانەوەی پێویستیەكانی مرۆڤ و بارودۆخەكەیانە، نەوەك بە پێچەوانەوە، بەو مانایەی ئایین هاتووە تا خزمەتی مرۆڤ بكات، نەوەك مرۆڤ خزمەتی ئایین بكات. ئەم هزرە بەرەو ئەوە دەمانبات كە ڕێنماییەكانی ئایین بە هەماهەنگی و هاوئاوازی هاتوون لەگەڵ بارودۆخە كۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەكانی پێغەمبەر، ئەگەر ئەم بارودۆخانە نەبووبان، ئەوا ئایین بەم شێوازە نەدەهات، ئەگەر پێغەمبەر ناچار نەبووبا كاری سیاسی بكات، ئەوا ئایین ڕێنمایی لە بواری پرسە سیاسییەكاندا لەخۆ نەدەگرت، ئا ئەمە بارودۆخەكەیە لەگەڵ گشت پرس و هەڵوێست و ڕووداوەكان، كە ئایین چارەی كردوون (قورئان و فەرموودە). لەسەر ئەمە ئەوە كەڵەكە دەبێ كە سروش هاتووە وەك وەڵامدانەوەی پێویستی دەروونی و كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری پێغەمبەر، بەو مانایەی سروش شوێنكەوتووی كەسایەتی پێغەمبەر بووە، نەوەك پێغەمبەر شوێنكەوتووی سروش بێ. لەبەر ئەوەی پێویستییەكانی پێغەمبەر گۆڕاو و نوێبووەوە و گەشەكردوون، ئەوا ئایین بە چەند جارێك هات نەوەك بە یەك جار و كەڕەت، ئایین بە پلەبەندی هاتووە لە كاتی ژیانی پێغەمبەردا، پێویستە بە پلەبەندیش لە دوای ژیانی پێغەمبەر گۆڕاو بێ. ئەمە ئەو هزرەیە سروش پێشكەشی كردووە و ناوی ناوە (بەرفراوانی ئەزموونی پێغەمبەر)، بەو مانایەی ئەزموونی پێغەمبەر بەرفراوان و كراوەیە بە ڕووی گشت سەردەم و بارودۆخێكدا، بەرتەسك و داخراو نییە لە هەمبەر

وەڵامدانـەوەی پێویستییەکانی ژیـان و مـرۆڤ. سـروش ئـەم هـزرەی خـۆی پوخـت کردۆتەوە بە وتنی ئەوەی: ((هەڵسوکەوتی پێغەمبـەر لەگـەڵ واقیعـی دەرەوە، بـە دڵنیایەوە سەریکێشا بـۆ بـەرفراوانی پەیامەکـەی و دواتـر بـەرفراوانی و کراوەیـی ئەزموونی پێغەمبەرایەتیەکەی. واتـە ئـاینی ئیسلام کـە لەبەردەسـتمانە بـە یـەك جار دانەبەزیوەتـەوە سـەر پێغەمبـەر بـەم دۆخـەش تـا هەتایـە مابێتـەوە، بـەڵکو پێکهاتووە و دروستبووە بە پلەبەنـدی، ئـەو ئاینـەی پلەبەنـدی دەبـێ، ئـەوا دواتـر ژیان و جوڵەکەشی پلەبەندی دەبێت)).

سروش ژمارەیەك بەڵگـەی خستەڕوو، بـۆ چەسپاندنی ئـەم تیـۆرەی خـۆی، لەوانـە قورئـان هـاتووە وەك وەڵامدانەوەیـەکی ئـەو ڕووداوانـەی پێغەمبـەر یـان موسڵمانان دووچاری هاتوون، بۆ نموونە: ڕووداوی جەنگەکان، یان ئەو پرسیارانەی ئاڕاستەی پێغەمبەر دەکـران، یـاخود پەیوەنـدی پێغەمبـەر بـە شـوێنکەوتووانیوە، جگە لەمانەش، هەموو ئەم ڕووداوانە قورئان لەبارەیانەوە دواوە، ئەمەش جگە لە مرۆیی و مێژووییبوونی ئاینی چیتر ناگەیـەنێ، (لـە میانـەی ڕووبەڕووبوونـەوەی ئەم ڕەگەزە مرۆییانە، ئاینی مرۆیی لە دایك دەبێ لە ناوەندەکانی مـرۆڤ و کەشـی مرۆییدا...، دواتر ئـەوەی ئایەتـەکان دەیڵێن لـە ڕەگـەزی وەڵامەکەیـە، نـەوەك لـە ڕەگەزی وتاردانە لەلایەن یەك لایەنەوە... ئای ژمارەی ئەو ڕووداوانە چەندە زۆرن کە لە سەردەمی پێغەمبـەردا ڕوونـەدراون، هـەر بۆیـە وەڵامێکی دیـاریکراو بـەدی ناکەن لە دەقە ئاینیەکاندا، پێغەمبەر هەڵوێستێکی تایبەتی لەبارەیانەوە نییە).

ئەو دەرەنجامەی سروش دەیەوێ پێی بگات، بریتییـە لەوەی پێویستە ئـایین هەماهەنگ بێ لەگەڵ بارودۆخەکانی ژیان، مەرج نییە لە گشت دۆخێکدا پشتگیری بێ، بەو مانایەی ئایین لە خزمەتی ژیاندابێ، نەوەك مرۆڤ لە خزمـەتی ئاینـدابێ،

ئەم پێشنیازە پێویستی بەوەیە ئایین نوێبووە و چارەسەری گشت کێشەکانی مرۆڤ و ژیان بداتەوە. لەم مانایەدا سروش دەڵێت: ((لەم سەردەمەدا پێویستە دینداری ئەزموونێك بێ، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و قەناعەت پێکردنی دڵان و کردنەوەی ئاڵۆزکاریەکان لە ئاسۆکانی هۆشی موسڵماندا، وەك ئەوەی سروش سەرلەنوێ داببەزێ، وەك ئەوەی ئەزموونی ئاینی لەسەر زەوی واقیع دروستکراوە، بۆ ئەوەی تێگەیشتنە باوەکان ڕەچاو بکات. پێویستە لەسەرمان لەم سەردەمەدا ئایین بخەینەڕوو وەك ئەزموونێکی جوڵاو لە دۆخی وەرچەران و کارلێك و لەدایکبوونەوەی بەردەوامدا، نەوەك لە میانەی هزری داخراو و دیاریکراو و سنووورداری پێشوەخت)).

## فرەیی ئاینی :

سروش لە دوو تیۆرەکەی پێشووی، تیۆرە نوێیەکەی هەڵدەهێنجێ، ئەویش قبوڵکردنی فرەیی ئاینیە، کە بەشێوەیەکی تێروتەسەل لە کتێبەکەی (ڕێگە ڕاستەکان) خستویەتیەڕوو. سروش پێی وایە فرەیی ئاینی بریتییە لە دەرەنجامی نەگۆڕی مرۆییبوونی ئەزموونی پێغەمبەر و مرۆییبوونی زانیاری و زانستی ئاینی، ئەمەش دەمانبات بەرەو ڕاجیایی و فرەیی لە ڕێباز و مەزهەب و ئاینەکاندا، ئەمەش وەك دەرەنجامی جیاوازبوونی بارودۆخ و سروشت و پێویستییە بەردەوامەکانیان، بۆ هێنانەکایەی چەند پرسیارێك، کە لەسەردەمی پێغەمبەردا نەکراون، یان دۆزینەوەی چارەسەری چەند کێشەیەك، کە لە بنەڕەتدا هەر نەبوونە. لەم بارەوە سروش دەڵێت: ((خەڵك لە ڕووبەڕووبوونەوەی کتێبە پیرۆزەکان و فەرمانی باڵا و خودی پیرۆز، پێویستیان بە ڕاڤە و ڕوونکردنەوە

هەیە، هەروەها لابردنی پەردەی ناڕۆشنی لە دەقی بێ دەنگ یان ئەزموونی ئاینی خاو و دەربڕینەکانی، ئەم دۆزینەوە و دەربڕینانە بەیەك شێوە نابن، بەڵكو جیاواز و فرە جۆر دەبن، ئەمە هۆكاری فرەیی ئاینیە لە ناوە و دەرەوەی ئایین)). پرسیار دەكات و دەڵێت: ئایا پێویست نییە فراوانكاری و بەرتەسككاری لە شەریعەتدا پەیڕەو بكرێ، پێویست نییە فراوانكاری لە ئاین و ئەزموونی پێغەمبەرایەتیدا بگیرێتەبەر (تاقم و مەزهەبی جیاواز پێكبهێنێ، شت لە ڕێنماییەكانی وەربگرێ؟ ئایا دەركەوتنی مەزهەبی شیعی و سوننی داخواز و دەرەنجامی ئەم فراوانكارییە مێژووییە نین؟... ئایا شتێكی سروشتی نییە لە دۆخی ئامادەنەبوونی پێغەمبەر وەرگرتن و بەخشین و مشتومڕ و گفتوگۆ بەردەوام بن، وروژاندنی پرسیاری تازە بە خودی خۆی فرە لقی بیروباوەڕی و سیاسی لای موسڵمانان پێویست دەكات؟).

لە تێڕوانینی سروشەوە، فرەیی ئاینی بریتییە دەرەنجامی حەزی خوایی و ئەنجامی جیاوازی درەوشانەوەكانی خوا، ئەم فرەییە هەماهەنگە بە تەواوی لەگەڵ دادگەری خوایی، كەواتە سروش پێی وایە جیاوازی ئاینەكان ڕوودەدات ((بەهۆی درەوشانەوە جیاوازەكانی خوا لە جیهانی بووندا، هەروەك جیهانی پێكهاتن فرە جۆرە، ئەوا جیهانی بەرنامە دانانیش بەهەمان شێوە فرە جۆرە)). سەرباری ئەمە دەڵێت: ((یەكەم خود كە تۆوی فرەیی چاندووە لە جیهاندا، بریتییە لە خوای پایەبەرز، كە پێغەمبەر و پەیامبەرانی جیاوازی ڕەوانە كردووە، بۆ هەر یەكێكیان بە دیمەنێكی تایبەت دەركەوتووە، هەر یەكێكیانی بۆ كۆمەڵگەیەكی تایبەت ناردووە و ڕاڤەیەكی نەخشاندووە بۆ حەقیقەتی ڕەها لە هۆشی گشت یەكێكدا كە جیاوازە لەوەی تر. بەمەش دیاردەی فرەیی كارا كراوە).

سروش پێی وایە، بۆ ئەوەی فرەیی ئاینی بەرجەستە ببێ، ئەوا پێویستە لەسەرمان درك بەوە بکەین کە هیچ کەسێك حەقیقەتی کامڵ یان دادگەری کامڵ یاخود یەکخواناسی کاملی قۆرخ نەکردووە، دەڵێت: ((شیعەگەرێتی یان سوننەگەرێتی بریتی نییە لە ئیسلامی پوخت و ڕاستی تەواو، نە مەزهەبی ئەشعەری و نە موعتەزیلی، نەفیقهی مالیکی و نە فیقهی جەعفەری، نە ڕاڤەی فەخری ڕازی، نە ڕاڤەی تەباتەبائی، نە زەیدیەت و نە وەهابیەت، نە بیروباوەڕی پاکی موسڵمانان لە هاوبەشدانان و نە بیروباوەڕی مەسیحییەکان، گوزارشت ناکەن لە ڕاستی و حەقی ڕەها. جیهانی دونیا پڕیەتی لە هیوا و ئاواتی پیس و نا پوخت، هیچ ڕاستیەکی ڕاشکاو و پوخت لەلایەن، نا ڕاستی و پوچەڵیەکی چڕ و پوخت لەلایەکی ترەوە نییە، کاتێك ملکەچی ئەم ڕاستییە دەبین، ئەوا زۆرینەی قبوڵکراوتر دەبێ)).

ونبوونی چەمکی فرەیی ئاینی لە هەر کۆمەڵگەیەکدا، لە دیدی سروشدا، دەگەڕێتەوە بۆ سەروەری هزرگەرایی و بڵاوبوونەوەی ڕاڤەکارانی فەرمیی، کە هەر یەکێکیان بانگەشەی ئەوە دەکات ئەو حەقیقەتی قۆرخ کردووە، ئەمان چەند هۆکارێکن سەردەکێشن بۆ لاوازکردنی هزری فەلسەفی، کە عەقڵ پشتی پێدەبەستێت نەوەك هەست و سۆز، لە لێکۆڵینەوە لە پرس و کێشەکاندا، بەرپرسیارێتی تەواو دەخاتە ئەستۆی پیاوانی ئاینی و دامەزراوە ئاینیەکان، کە ڕەواج بەم هزرە نادەن، بەڵکو زۆر جاران کار دەکەن لەسەر دژایەتی کردنی، جا دەڵێت: ((کاتێك کۆمەڵگەیەك دەبینین بیرۆکەی فرەیی قبوڵ دەکات بە هێواشی، بەخێرایی کارلێك ناکات لەگەڵی، ئەوا ئەمە بەهۆی لاوازی ڕەوتی فەلسەفی و بەتایبەت کەلامییە لە نێو موسڵماناندا، چونکە هەندێك پێیان وایە ڕەواج

پێدەرانی لێکۆڵینـەوە کەلامییـەکان، سەردەکێشێ بـۆ لاوازی بیروبـاوەڕی خـەڵکی سـادە...، لـەم دۆخـەدا بەرپرسـیارێتی تـەواو دەکەوێتـەی ئەسـتۆی زانایـان سەرپەرشتیارانی ئایین، نەوەك کەسانی سادە و لاساییکەرەوان، پێویستە لەسەریان دەرگای ڕێگە ڕاستەکان لە ئـایین و سیاسـەت بکەنـەوە، دانبنـێن بـە مـافی ئەوانـەی ڕێگاکانیان گرتووە و بەردەوامن...).

شایەنی باسە، بیرۆکـەی فرەیـی ئـاینی نـوێ نییـە، چونکە (جـۆن لـوك) بـە بـانگخواز و سەرپەرشـتیاری دادەنـرێ لەسـەردەمی هاوچـەرخدا، چـەندین وتـار و دانـراوی نووسـیوە لەبارەیـەوە، بـەڵام ئـەوەی سـروش کردوویـەتی، وتنـی ئەوەیـە فرەیی ئاینی تێکناگیرێ لەگەڵ گشت ئاینەکان و لەوانیش ئاینی ئیسلام، هـەروەها لەگـەڵ هەوڵـدان بـۆ چەسـپاندنی پوچـەڵی بۆچـوونەکە بـە ڕێگەیـەکی پـەیڕەوی ڕەسەن. سەرباری ئەو لێکۆڵینـەوە و توێژینەوانـەی باسـی بابـەتی فرەیـی ئاینیـان کـردووە لـە ئاینـدا، ئـەوا ئێمـە پێمـان وایـە چاکترین کـەس کـە لێیکۆڵیوەتـەوە و پێشکەشی کردووە، عەبدولکەریم سروشە.

## عەلمانیبوونی ئایین :

دانـان بەبیرۆکـەی مرۆییبـوونی ئـایین و ئـەزموونی پێغەمبـەر و زانیـاری ئاینی و فرەیی ئاینی، سەردەکێشێ بۆ بیرۆکەی عەلمانیبوونی ئـایین یـان بیرۆکـەی (ئاینی عەلمانی)، ئەمەش ناونیشانی کتێبێکە، عەبدولکـەریم سـروش بیرۆکـەکانی تێـدا خستۆتەڕوو لـەبارەی پەیوەنـدی ئـایین بـە کۆمەڵگـەی مـەدەنی و لیبڕاڵـی و عەلمانی و دەسەڵاتی یاسا و بنـەما هاوڵاتیبوون و ژمارەیـەك لـە هـزر و بۆچـوونی هاوچەرخی تر، بۆمان ناکرێ بەم پەلەیە تیشك بخەینەسەر گشت ئەوەی سـروش

پێشکەشی کردووە لەم بارەوە، هەر بۆیە تەنها باسی پەیوەندی ئایین بە کۆمەڵگەی مەدەنیەوە دەکەین، بەو هیوایەی خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ دانراوەکانی سروش، بۆ ئاشنابوون بە پرسەکان بە تێروتەسەلی.

لە یەکەم وتاری کتێبی (ئاینی عەلمانی)، کە ناونیشانەکەی بریتییە لە (ئایین و کۆمەڵگەی مەدەنی)، سروش هەوڵیداوە ئەم پرسیارەی خوارەوە وەڵام بداتەوە: ئایا هیچ تێکگیرانێك لە نێوان ئایین و کۆمەڵگەی مەدەنیدا هەیە؟ لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە مانای کۆمەڵگەی مەدەنی و مێژووی دروست بوون و گەشەکردنی، سروش ئەم وەڵامە دەخاتەڕوو: ((هیچ کێشەیەك نییە لە نێوان ئەوەی مرۆڤ بژیەت لە کەشی دینداری و پابەندی ئاینیدا، لە هەمان کاتدا لە ژیانێکی مەدەنی خۆشدا بژیەت، بەڵکو هەر یەکێك لەم دوو شتانە یارمەتی ئەوەی تر دەدەن و تەواوی دەکەن))، ئەم یەکتر تەواوکردنە لە نێوان ئایین و کۆمەڵگەی هۆدار دەکات، بەوتنی ئەوەی ئایین هەوڵ دەدات بۆ ڕێك و پێك کردنی مرۆڤ لە ناوەوە، بەهۆی دەسەڵاتی ویژدان، کۆمەڵگەی مەدەنی هەوڵ دەدات بۆ ڕێك و پێك کردنی مرۆڤ لە دەرەوە، بەهۆی دەسەڵاتی یاسا. بەڵام دوای خستنەڕووی ئەم وەڵامە پرسیارێك دەکات: ((کەواتە گریمانەی بوونی تێکگیران لە نێوان دینداری و مەدەنیەتدا لە کوێدایە)). وەڵامی ئەم پرسیار کردنە دەداتەوە بەشێوەیەکی ڕوون و ڕاشکاو و بوێرانە، لەم بارەوە دەڵێت: ((تێکگیران دەست پێدەکات کاتێك دیندار دەجوڵێت بۆ ڕەتکردنەوەی فرمیی و بە فەرمی دانی پێدانانێت، هەر بۆیە ئێمە پێویستمان بە ڕاڤەیەکی تازەیە بۆ ئایین... ناکرێ یەکێتیەك لە ئایین و بۆچوونەکان بسەپێنرێ بەسەر خەڵکدا، چونکە ئەم مانایە بەخۆی دادەبڕێ لەگەڵ کۆمەڵگەی مەدەنی و ژیانی حەقیقی و ڕێزداری خەڵك، ئەگەر ئایین ویستی

ڕەگەزی دەمارگیری بوروژێنێت و ئاگری جیاوازی مەزهەبی زیاد بکات، یەکێتیەکی خـەیاڵاوی بەسـەر خەڵکـدا بسـەپێنێ، ئـەو کاتـە تێکگـران لـە نێـوان دینـداری و کۆمەڵگەی مەدەنیدا ڕوودەدات)). کەواتە مەرجی قبـوڵکردنی کۆمەڵگەی مـەدەنی بریتییە لە قبوڵکردنی فرەیی و ڕاجیایی، ئەمەش ئەو شتەیە کە زۆربەی پیاوانی ئاینی و ئەو دیندارانەی شوێنی کەوتوون ڕەتی دەکەنەوە.

## وتەی کۆتایی :

بڕوامان وایە سروش توانیویەتی تیۆرە کامڵەکەی دابنێ، نزیکەی مەبەستی گەیشتنە بە ئیسلامێکی تازە، گونجاوبێ لەگەڵ داخوازییەکانی ژیانی هاوچەرخ بەگشت ئاڵۆزیـەکانی... ئیسلامێك پشت ببەستێ بـە نوێبوونـەوەی بـەردەوام و فرەیـی و قـۆرخ نـەکردنی حەقیقـەت و ڕێزگـرتن لـە ڕای جیـاوازی بەرامبـەر، وەگەڕخسـتنی ڕۆڵـی عـەقڵ، ڕێزگـرتن لـە مـرۆڤ. لەوانەیـە ئەمـە تیۆرێـك بـێ شایسـتەی زۆر بایـەخ پێـدان و ڕامـان و بیرکردنـەوە بـێ لەلایـەن خوێنـەری خۆشەویست، ئێمە هەست دەکەین بەوەی ئێمـە باسمان کـردووە پوختەیـەکی زۆر کورتـە، شـایەنی ئـەو کۆششـە مەزنـە نییـە کـە عەبدولکـەریم سـروش خـەرجی کردووە.

# قومنی و پەیوەندی ئایین بە کەلەپورەوە

## قومنی و مێژووی ئاینەکان :

سەید مەحمود قومنی، نووسەرێکی میسرییە، لە دایکبووی (١٩٤٧)، بڕوانی دکتۆرای لە زانستی کۆمەڵناسی ئاینی بەدەستهێناوە. لەسەر چەندین بابەتی جۆراو جۆر دەنووسێ، زۆربەی جاران بابەتەکانی دەبنە مایەی مشتومڕ، بەهۆی بوێری و نوێیەکەی. یەکێك لەم بابەتانە بابەتی مێژووی ئاینەکانە، قومنی باسی کردووە لە چەند دانراوێکیدا و بە چەندین ڕێگەی جیاواز، ئامانجەکەی لە توێژینەوەی مێژوو بەپێی وتەی خۆی بریتی بووە لە هەوڵدان بۆ ((خوێندنەوەی ئەم مێژووە بە شێوەیەکی تر، دەق ببەستێتەوە بە واقیع، دەرەنجامەکان بگێڕێنێتەوە بۆ پێشەکی و بنچینە حەقیقیەکانی نەوەك خەیاڵیەکانی، لە پێناو دووبارە پێکهێنانی بنیاتی عەقڵی و پەیڕەوەکەی، هەروەها لە پێناو ئایندەیەکی باشتر بۆ نەوەکانی ئایندەمان و بۆ خودی کەلەپورەکەمان)).

## دوو بیرۆکەی بنەڕەتی :

لە بواری مێژووی ئاینەکان، قومنی ڕا و بۆچوونی وای پێشکەش کردووە، زۆر جیاوازە لەو نووسینە مێژووییە ناسراوانەی هەن، لەوانەیە گرنگترین ئەم ڕا و بۆچوونانە بە تێڕوانینی ئێمە ئەمانە بن:

١- گشت ئاینەکان ملکەچی یاسای پەرەسەندن و گۆڕان و دەستکارین، ئەوەی ئێمە ناوی دەنێین ئاینی نوێ، لە بنەڕەتدا دەرەنجامێکی سروشتی گەشەی

ئايين يان ئاينەكانى پێش خۆيەتى. چەمكى گەشە ئەوە ناگەيەنێ ئاينـەكانى پێشـوو كـەم و كـورت و نـا تـەواون لـە سـەردەمى دەركەوتنيـدا، بـەڵكو ئـەوە دەگەيـەنێ ئـايين لـە دواى تێپـەڕينى كـات دەستەوەسـانە لـە ڕۆيشـتن لەگـەڵ گۆڕانكاريەكان، كە هاتوونەتە كايە لە لايەنەكانى ترى ژياندا، دواتر پێويست بووە ئاينى تازە دەربكەوێ و بگونجێ لەگەڵ ئەم گۆڕاوانە، ئاينێك هزرەكانى لە ڕابردوو وەردەگرێ و لەگەڵ ئێستا بگونجێ. ئەمـە بەشێوەيەكى ڕوون لـە كتێبەكەيدا (ئەفسانە و كەلەپور، ١٩٨٦) دەردەكەوێ.

٢- ڕووداوەكـانى ميـژووى ئـاينى بـە تێكـڕا، ملكەچـى چـەند ياسـايەكى بابـەتى چەسـپاون، هـەمان ئـەو ياسـايانەن، كـە ڕووداوە مێژووييـەكان ملكەچـيانن، لەمـەدا ئـاينى ئيسـلامى جيـا ناكرێتـەوە، كـە وەك دەرەنجـامى سياسـى و كۆمەڵايەتى و كەلتورى و ئابوورى دەركەوتووە. قومنى بەشێوەيەكى ڕوون و ڕاشكاو لـە كتێبەكەيـدا (حيزبـى هـاشمى و دامەزرانـدنى دەوڵـەتى ئيسلامى، ١٩٩٦) گوزارشتى لەم ڕايە كردووە، ئەمە لەلاى هەنـدێك كـەس بـە يـەكێك لـە گرنگترين دانراوە عەرەبيە هاوچەرخەكان بە ڕەهايى دادەنرێ.

سەيد قومنى پێى وايە دەركـەوتنى ئاينـەكان و كـپ بوونيـان ملكەچى ئـەم دوو ياسـانەن، نـەوەك ملكەچـى جيهـانى پـەنهان (غيـب) يـان دەرئاسـاكان (موعجيزەكان)، كە پياوانى ئـاينى پـەناى بـۆ دەبـەن، ئـەم پـەنا بـۆ بردنـەش يـان بەهۆى دەستەوەسانيە لە تێگەيشتن لەم ياسايانە ياخود بۆ بە بەرداكردنى شكۆ و ڕێزە بە باڵاى ڕووداوە مێژوويەكان. چالاكى مرۆيـى و كارەكـەى و پلاندانانەكەى، بارودۆخـە ئـابوورى و سياسـى و كۆمەڵايەتيـەكانى و جگـە لـەوانيش، جوڵێنـەرى ڕووداوەكانى مێژووە، نـەوەك جيهـانى پـەنهان و موعجيزەكان. بـۆ نموونـە ئـاينى

ئیسلام، بە تێڕوانینی قومنی بە دابڕاوی نەهاتووە لەو کەلەپورە کەلتوریە باوەی هەبووە لە کاتی دەرکەوتنیدا، بەڵکو دەرەنجامێکی سروشتی کۆی کارلێکەکانی نێوان ئەم کەلەپورەیە بە گشت ئەو ئاینانەی تیادایە (یەهودیەت و مەسیحییەت و سابیئیەت و بتپەرستی و جگە لەوانیش) لەگەڵ داب و نەریت و عورف.

## قومنی و بەرهەڵستکارانی :

قومنی دووچاری ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی توونـد بـووەوە، لەلایەن پیاوانی دامەزراوەی ئاینی، لەوانە بەرهەڵستی کردنیان بۆ هزر و ڕا و بۆچوونەکانی، کە لە سەرەوەدا باسکران. قومنی چەند ڕەتدانەوەیەکی لەسەر نووسیون، ئەوانەی لێ باس دەکەین کە پەیوەستن بە بابەتەکەوە، لە پێشەکی چاپی چوارەمی کتێبەکەیدا (حیزبی هاشمی و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی ١٩٩٦)دا هاتووە، کە دوو خاڵی گرنگی لەخۆگرتووە، ئەوانیش ئەمانەن:

١- ((ئەگەر خودی پەیڕەوی ئاینمان بەکارهێنا، بەشێوەیەکی ڕێزدارانەتر بۆ خودی ئایین، بۆ خوای خاوەنی ئەم ئاینە، درکمان بەوە دەکرد تێگەیشتمان بۆ ئایین جوانترە، کاتێك پەروەردگار ڕێك دەبوو لەگەڵ خودی خۆیدا، پێشێلی ئەو یاسانە ناکات کە بڕوا وایە ئەو دایناون، بۆ ئەوەی مەبەست پەروەردگاری خەڵك و هەڵسانی پێغەمبەری ئیسلام بە بانگەوازەکەی بەرپا بێ، ئەوا دەبێ ڕێگەی واقیع خۆش بکرێت، بۆ ئەوەی دەرەنجامە لۆژیکییەکانی ببژێردرێن، کە ڕێکن لەگەڵ ئەم پێشەکیانە، لەگەڵ کامڵی ئەو پەروەردگارە، ئەو کامڵیەی پێویستە بڕیارەکانی تەبابێ لەگەڵ یاسا و ڕێساکانی)).

٢- شوێنكەوتنى ئەم ڕێبازە بەشدار دەبێ لە چاك كردنى ئاستى پەروەردەيى عەقڵ، دواتر ((دەردەچين لە دۆخى چەقبەستوويى گەوجانە، كە بەوپەڕى نەخۆشيەوە چاوەڕوانى دەرئاسا لەناكاوەكانە، بمانگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمى كردارەكانى ڕزگاركردن "فتوحات")). ئەمە ئەو هۆكارميە پاڵى بە قومنيەوە ناوە داوا بكات پەيڕەوەكانى خوێندن بگۆڕدرێن، كە پەيوەستن بە مێژووى ئيسلامى و پەروەردەى ئيسلاميەوە.

## گرنگى توێژينەوەى كەلەپور :

لەبەر گشت ئەوەى پێشتر خرايەڕوو، قومنى پێى وايە پێويستە لەسەرمان لە كەلەپور بكۆڵينەوە، كە پێش ئيسلام هەبووە، نەك تەنها ئەوە بە بەس بزانين كە لێكۆڵينەوە لە ئيسلام بكەين، چونكە خاڵى دەستپێك نييە، لە سفرەوە دەستى پێكردبێ، بەڵكو ئەمە بەردەوامبوونى ئەوەى پێش خۆيەتى. دەكرێ گرنگى توێژينەوەى كەلەپورى كۆن (ئاينە كۆنەكان و ئەفسانەكان) كورت بكەينەوە، لە تێڕوانينى قومنيەوە لەم خاڵانەى خوارەوە:

١- توێژينەوەى كەلەپور، وامان لێدەكات تێبگەين لە هۆكارەكانى ڕەفتارى باوى ئەمڕۆ، چونكە كەلەپورى كۆن هێشتا ئامادەيە لە زۆربەى لايەنەكانى ژيانـدا، بەڵام پەردەپۆش كراوە بە چەندين جۆرى ئايين، ئەو دەڵێت: توێژينـەوەى مێژووى كۆن (بريتييە لە ڕێگەى گەيشتن بە ڕەگ و ڕيشەكانى زۆرێك لە بيروباوەڕەكان، كە ئاڕاستەى هزر و هەڵسوكەوتى مرۆڤەكانى ئەمڕۆ دەكەن، لەوانەيە هەموارى ئەم هەڵسوكەوتەش بكەن).

٢- توێژینەوەی کەلەپور وامان لێدەکات شایستەبین بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هزرە نەگونجاوەکان لەگەڵ داخوازیەکان سەردەم، بەشێوەیەکی زانستی ڕەسەن، جا ئەم هزرانە ئاینی یان سیاسی یاخود کۆمەڵایەتی یان ئابووری یاخود جگە لەمانە بێ، ئەو دەڵێت: ((توێژینەوەی زانستیانەی کەلەپوری کۆن، دەگرێ لە کۆنترینی چەکەکان بێ لە ناکۆکی هزری، کە ئەمڕۆ هەیە)).

## هزرەکان باڵیان هەیە :

سەید مەحمود قومنی ژمارەیەك لە نامە و گوتاری هەڕەشە ئامێزی پێگەیشتن، دواهەمیان نامەیەك بوو، لە یەکێك لە کۆمەڵە توندڕەوە ئاینیەکانەوە لە ساڵی (٢٠٠٥)، کە بە (کۆمەڵەی تێکۆشان و یەکخواناسی) ناسراوە، لەم هەڕەشەی ئەواندا پشت بەستراوە بەم وتەیە (هەر کەسێك ئاینەکەی گۆڕی بیکوژن). لە دەرئەنجامی ئەم هەڕەشە قومنی وای پێ باشتربوو واز لە نووسین بێنێ، بۆ پاراستنی خۆی و خانەوادەکەی، لە نامەی وازهێنانیدا هاتووە: ((بە هەڵە وێنای لێکدانەوەکانم کرد بۆ کات، بەوەی وامدانا توانام هەیە وەك میسرییەکی موسڵمان ئەوە بنووسم کە توێژینەوەکەم پێی دەگات، بڵاوی بکەمەوە بەسەر خەڵکدا، دواتر بە هەڵە ئەندێشەی ئەوەم کرد ئەم لێکۆڵینەوە و کۆششە ڕاستە و من خزمەتی ئایین و نیشتمانەکەمی پێ دەکەم، بۆیە هەڵسام بە خستنەڕووی ئەوەی پێیگەیشتووم بۆ خەڵك، وای بۆچووم من ڕاستم و لەسەر حەقم، کەچی بینیم لەسەر هەڵە و پوچەڵیم، هەرگیز گومانم نەدەبرد ڕۆژێك لە ئاینەکەمدا تۆمەتبار دەکرێم، چونکە جێگرەوەیەکم بۆ ئاینەکەم پێشنیاز نەکرد، بەڵام خوا لە بەدیهێنراوانیدا چەندین بواری داناوە)).

قومنى وەستا لە نووسين بە ناچارى، چيتر هزر و بۆچوونەكانى بۆمان نەهاتن، وەك چۆن پێشتر واى دەكرد، بەڵام هزر و وشەكانى هەر مانەوە، كە ناكرێ بەند بكرێن لە قەفەزى تەكفير و هەڕەشەدا، مافيان هەيە بەرەو ڕووناكى دەربكەون، بە ئاسمانى هزرى ئازاددا بفڕن، هزريش باڵى هەن.

سەيد قومنى دواى دوو ساڵ لە وازهێنانى، دەستى بە بڵاوكردنەوەى نووسينەكانى كردەوە، بە لێهاتووى و بوێريەكى زياتر لەوەى پێشوو، وا دەردەكەوێ ماوەى وازهێنانەكە، ماوەى ڕامان و توێژينەوە و لێكۆڵينەوە و بەدواداچوون بێ، واى كرد نووسينەكانى بەهێزتر بن و جۆرەكەشيان چاكتر و داهێنانيان زياتر بێ.

# عەشماوی و پەیوەندی ئایین بە سیاسەتەوە

## ژیاننامە و دانراوەكانی :

ناوی ڕاوێـژكار محەممـەد سـەعید عەشماویـە، سـەرۆكی دادگـای تاوانـەكان و دادگـای باڵای ئاسایشـی دەوڵەتـە لـە میسـڕ. لـە كۆلیـژی مافناسـی لـە ساڵی ١٩٥٥ دەرچـووە، دواتـر كـاری لـە بـواری دادگـادا كـردووە لـە دادگـانی قـاهیرە و ئەسكەندەرییە. وەك مامۆستای دانەمەزراو وانەی دەوتەوە لە بنـەماكانی ئـایین و شەریعەت و یاسادا لە چەندین زانكۆدا، لەوانە: زانكۆ لە قاهیرە، زانكۆی توبنغن لە ئـەڵمانیای خۆرئـاوا، ئوبسـالا لـە سوێد، پەیمانگـەی توێژینـەوە خۆرهەڵاتییـەكانی بلینینغراد لە ڕوسیا، سوربۆن لە فەڕەنسا.

لە دیـارترین دانـراوەكـانی (پـەیامی بـوون، ١٩٥٩)، (بەرهـەمی عـەقڵ، ١٩٧٧)، (بنەماكانی شەریعە، ١٩٧٨)، (جەوهـەری ئیسلام، ١٩٨٢)، (ئیسلامی سیاسـی، ١٩٨٨)، (مەشـخەڵ و سـیماكانی ئیسـلام، ١٩٨٨)، (عـەقڵ لـە ئیسـلامدا، ١٩٩٨)، (ئیسـلام و سیاسەت، ٢٠٠٤)، چەندین كتێبی دیكەی جگە لەمانە.

## دیارترین ڕاو بۆچوونەكانی لە بارەی ئایین و دینداری:

عـەشماوی لـە پێشـەكی كتیبەكەیـدا (بنـەماكانی شـەریعەت، ١٩٧٨) لـەبارەی سەختی نوێسازی و هـەمواركردن دەدەوێ، لە كەلـەپوری ئیسلامیدا، بـەهۆی ئـەو شێواندنە زۆرەی بەسەریدا هاتووە، وتویـەتی: ((ئـەوەی بەڕاسـتی سـەرنجڕاكێش و

سەرسـورهێنەرە، ئەوەیــە بــە ڕووبەڕووبوونــەوەی هــەر خاڵێـك لـە كەلـەپوری ئیسلامدا، ئەوە ڕوون دەبێتەوە كە موسڵمانان بـە درێـژایی مێـژوو بـە هەڵە لێـی تێدەگەن و بە هەڵـەش جێبـەجێی دەكـەن، تـا وایلێهاتووە ئـەم كەلـەپورە بووەتـە شێلراوێك لەگەڵ هەڵە و پڕ لە كرج و كاڵی، بەڵكو وای لێهاتووە هەڵـە و نـەپێكان بووەتە ئەو بنچینەیەی لـە تێگەیشتنەكاندا جێگیربـووە، لـە عەقڵەكانـدا جێگـەی گرتـووە، ئەمـەش كـاری ڕاسـتكردنەوە و بـژار كـردن دەكاتـە جـەنگ لـە زیـاد لـە لایەكەوە، بۆ ڕەچاوكردنی ڕاست و پێشكەشكردنی بۆ خەڵك)).

ئـەو بیرۆكـە و ڕا و بۆچـوونانەی عــەشماوی نووسـیویەتی، وای لێكـردووە دووچاری ژمارەیەك ڕەخنە ببێتەوە لەلایەن پیاوانی دامەزراوەی ئـاینی فـەرمی و جگە لەوانیش، بە عەلمانیەت تۆمەتبار كراوە، كە بە تێڕوانینی ئـەوان كوفرە، بـە شـێواندن و سـاختەكردن و پیلانگێـڕی و هەڵبەسـتن بــە نـاوی ئیسـلام و جگـە لەمانەش تۆمەتبار كراوە، ئەو تۆمەتـە نەریتیانـەی گشت بـانگخوازانی نوێخـوازی ئیسلامی دووچاری هاتوون.

ئەو بیر و بۆچوونانەی عەشماوی هێناویـەتی، زۆر سـەختە هـەژمار بكـرێن، زۆر و فرە جۆرن، هەیانـە پەیوەسـتە بـە پرسـەكانی جیاكاری لـە نێـوان ئـاین و هزری ئاینی، لـە نێـوان شـەریعەت و فیقـە، ئـاین و شـەریعەت، حكومـەتی خـوا و حكومەتی خەڵك، گشت ئەم جیاوازیانە ئامانج لێی دروستكردنی تیـۆرێكی كامڵـە، عەشماوی ناوی دەنێـت (تیـۆری یـەكێتی ئـاین و فـرە شـەریعەتی)، لـە خـوارەوەدا دیارترین بۆچوونەكانی سەبارەت بـە حكومـەتی ئیسلامی و چـەمكی خەلافـەت و حـوكمڕانی دەخەینـەڕوو، كـە بەشـێوەیەكی زۆر توونـد لەلایـەن پیـاوانی ئـاینی نەریتی و شوێنكەوتووانیان ڕەتكرایەوە.

## حکومەتی خوا و حکومەتی خەڵك :

عەشماوی جیاوازی دەکات لە نێوان حکومەتی خوا و حکومەتی خەڵك، ئەم جیاوازیە پێویستە بۆ تێگەیشتن لە پەیوەندی ئایین بە سیاسەتەوە، دانانی سنووری ڕوون و ڕاشکاو لە نێوانیاندا. بیرۆکەکەی سەبارەت بە ڕۆڵی ئایین و ئەرکەکانی بەم وتەیەی پوخت دەکاتەوە: ((ئایین بایەخ بە مرۆڤ و کۆمەڵگە دەدات، نەوەك بە دەوڵەت و ئیمپراتۆریەتەکان. دامەزراندنی دەوڵەتان و دروستکردنی ئیمپراتۆریەتەکان لە کرۆکی ئایین نین، بەڵکو لە سروشتی مرۆڤ و ئەرکی کۆمەڵگەکانی نێودەوڵەتییە. ئەو ڕۆژەی سروشتی مرۆڤ بەرز دەبێتەوە، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بڵندتر دەبێ، ئەوا سیستەمە سیاسیەکان دەگۆڕێن و شێوە باوەکانی دەستکاری دەکرێن، بەمەش کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە تێکڕایی دەبێتە کۆمەڵگەی مرۆڤ، لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ)).

<u>یەکەم</u>: حکومەتی خوا: عەشماوی پێی وایە حکومەتی خوا یان حکومەتی خوایی لە ئیسلامدا نەبووە مەگەر لە ماوەی سەردەمی پێغەمبەردا نەبووبێ لە مەدینە، کاتێك کۆچی دوایی کرد، سروش کۆتایی هات و پچڕا، ئەوا حکومەتی خواییش کۆتایی هات، کە حکومەتێکە لەسەر بنەمای فەرمانڕەوایی خوا دامەزراوە، بەو مانایەی: ((خوا تاکە فەرمانڕەوای کۆمەڵ بێ، جا ئەمە بە ڕێگەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بێ. حکومەت خوا بە کرداری فەرمانڕەوایی دەداتە دەست خوا، پێغەمبەریش تیایدا تەنها جێبەجێکاری ویستی خوا دەبێ. بەمەش سەرپێچی کردنی و ملکەچ نەبوون بۆی، سەرپێچی کردنی خوا و دەرچوون دەبێ لە میهرەبانیەکەی)). عەشماوی چەند تایبەتمەندیەکی بۆ ئەم حکومەتە داناوە، لە چەند کتێبێکیدا، کە ئەمانەن:

- فەرمانڕەوایی بە کرداری بۆ خوا بێ.
- حوکمڕان لەسەر زەوی، ویستی خوا جێبەجێ بکات، ئەم ویستە وەربگرێ لە ڕێی سروشەوە، بە وشەی دیاریکراو یان بە مانای گشتی.
- سروش لە حوکمڕان نەپچڕێ، لەلای حوکمێکی دیاریکراو نەوەستێ، بەڵکو بەردەوام بێ لە سەرکردایەتی کردنی کۆمەڵگە لە ڕێگە بەرژەوەندییە گشتییەکان و ڕووداوە گۆڕاوەکان و تازەکان.

ئەم تایبەتمەندیانە، کە حکومەتی خوا پێی جیا دەکرێتەوە، لە هیچ حکومەتێکدا نەهاتۆتەدی لە دوای پێغەمبەر و پچڕانی سروش، هەر بۆیە هەر بانگەوازێك بۆ بەرپاکردنی حکومەتی خوا لە دوای پێغەمبەر، بە پاساوی ئەوەی بڕیار و فەرمان تەنها بۆ خوایە، لە دیدی عەشماویدا، بانگەوازێکی پوچەڵە، چونکە هەر حکومەتێك لە دوای پێغەمبەرەوە هاتبێ، حکومەتی مرۆییە، عەشماوی بە حکومەتی خەڵك ناوی دەبات.

<u>دووەم</u>: حکومەتی خەڵك: عەشماوی پێناسەی حکومەتی خەڵك دەکات بەوەی بریتییە لە: (گشت حکومەتێك، بەدەر لە حکومەتی خوا، ئەمە ئەو حکومەتەیە بارودۆخە کۆمەڵایەتی و هۆکارە ئابوورییەکان دەیسەپێنن، لەوانەیە واقیعی هێز بیسەپێنێ. سەبارەت بە چوارچێوەکەی ئەوا دیاری دەکرێ بە بەها و پێویستیەکانی کۆمەڵگە، هۆشیاری و ویستی خەڵك، ویستی چاودێری و توانای گۆڕین. شێوە وەردەگرێ بە بارودۆخی واقیع و دۆخەکانی، بەمەش حکومەت دەبێتە حکومەتی پوختەی ڕۆشنبیران (ئەرستۆقراتی) یان بەرژەوەندییە خێزانیەکان (ئولیغارشیەت) یاخود ویستی گەل (دیموکراسیەت) یان پشت بە ئایین

دەبەستێ (سیۆقراتی) یاخود پشت بە هێز و ویستی حوكمڕان دەبەستێ (تاكڕەوی و دیكتاتۆری)... بەم شێوەیە).

عەشماوی لە كتێبەكەیدا (بەرهەمی عەقڵ) حكومەتی خەڵكی لە مێژووی ئیسلامی كۆن و نوێدا، بۆ سێ جۆر حكومەت دابەش كردووە: حكومەتی ئاینی، حكومەتی ڕەگەزی، حكومەتی مەدەنی.

١- حكومەتی ئاینی: بریتییە لە حكومەتی جێنشینە سەرراستەكان، كە لە (٦٣٢ – ٦٦٠ز) بووە، حكومەتێكی خاوەن سروشتێكی تایبەتە، پێكهاتەكەی جیاواز بووە لە پێكهاتەی تێگەیشتنی هاوچەرخ بۆ حكومەت و دەوڵەتان، هەروەك خاوەنی بنەمای زۆر ورد و توندی خۆشگوزەرانی و هەستیار بووە، ئەگەر كرچ و كاڵی تێكەوت، ئەوا چیتر بە حكومەتی ئاینی دانانرێ، ئەم بنەمایانە بریتین لە:

- حوكمڕان لەلایەن هاوڵاتیانەوە هەڵبژێردراوە، بە ئامرازێك لە ئامرازەكان – هەڵە دەكات و ڕاستیش دەپێكێت، بۆ هاوڵاتیان هەیە چاودێری بكەن و لە دژی دەربچن – ئەگەر بینیان حوكمەكەی ئەو پێشێلكردنی یاساكانی ئاین و شەریعەتە – بە ڕێگەیەكی نەرێنی خۆی لە گوێڕایەڵ نەبوون دەبینێتەوە یان بە ڕێگەیەكی ئەرێنی شێوازی ڕاستكردنەوە دەگرێتەبەر.
- ئامانجی بڵاوكردنەوەی ئایین بێ، حوكم كردن بەسەر باوەڕداران بە بڕیارەكانی شەریعەت، بەشێوەیەك مافی ڕاڤەكردنی شەریعەت بۆ هەمووان ڕەوا بێت، لە چوارچێوەی ئەو مەرجانەی لە خودی ئاینەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەو كەسە كافر ناكرێ كە ڕای پێچەوانەی حوكمڕانە، یان ڕاڤەیەكی

جیاواز لە هی ئەوی پێ پەسەندە، مادەم بە شایستەیی کۆششی تێدا کردووە.

- ئاراستەکەی جیهانی و ڕەوتەکەی مرۆیی بێ، خاکەکەی دڵەکان بێ، گەلەکەی گشت خەڵك بێ، پارمەتی باوەڕداران دەدات بۆ ژیانیان و بێ باوەڕانیش دەپارێزرێ، هیچ خاکێك داگیر ناکات، هیچ ڕەگەزێك جیا ناکاتەوە، دەمارگیر نابێ بۆ هیچ نەتەوە و کۆمەڵەیەك.

٢- حوکمەتی ڕەگەزی: ئەو حکومەتەیە لە (٦٦٠ — ١٩٢٤) درێژەی کێشاوە، واتە لەسەرەتای سەردەمی ئەمەوی تا کۆتایی خەلافەتی عوسمانی (تورکی). حکومەتێکە بنەماکانی حکومەتی ئاینی تێدا نەبوو، بەڵکو بنەمای دژی ئەوی تێدابوون. (حکومەتی ڕەگەزی بەردەوام باو بوو لە وڵاتانی ئیسلامیدا بەگشتی، تا ئەم وڵاتانە گەیشتن بە سیستەمی ئەو حکومەتانەی شارستانی خۆرئاوا دایگرتبوون، ئەویش سیستەمی حکومەتی مەدەنیە).

٣- حکومەتی مەدەنی: (حکومەتێکی ئاینی نییە و پشت نابەستێت بە ئاینەوە لە چەسپاندنی بنەماکانی و لەناوبردنی دژەکانی، لەسەر بنەمای هاوڵاتیبوون و سەروەری یاسا دادەمەزرێ، ئامانجە سەرەکییەکانی خۆی دەبینێتەوە لە پاراستنی خاك، چاودێری کردنی بەرژەوەندی هاوڵاتیان، هەر چەندە ئایین یان نەتەوە یان زمان یاخود ڕەچەڵەکیان جیاوازبێ. دەوڵەت بەو مانایە وەك جێگرەوەی ئایین بەرپابوو لە کۆکردنەوەی خەڵك و ڕاکێشانی خۆشەویستی و لایەنگیری، لە کاتێکدا ئایین ناوەندی کۆکردنەوەی مرۆیی و چەقی خۆشەویستی و لایەنگیری پێکدەهێنا).

حكومەتی مرۆڤ بەم سێ جۆرەوە (ئـاینی و ڕەگـەزی و مـەدەنی)، بـە دیـدی عەشماوی، ناكرێ بانگەشەی ئەوە بكات نوێنەری فەرمانڕەوایی خوا دەكات، چونكە تایبەتمەندیەكانی حكومەتی خوای تێدا نییە. هـەروەها عـەشماوی پێـی وایـە ئـەو حكومەتانەی بانگەشەی ئـەوە دەكـەن حكومـەتی ئـاینین، وا نییـە، چونكە (تـەنها پاراستنی ئاین وا ناكات دەوڵەتەكە ئـاینی بـێ، دەوڵـەتی ئـاینی چـەندین بنـەمای هەیە، هۆكارە مێژووییەكان پاشكەوتوون لەوەی لە كاتی ئێستادا پێشكەشی بكەن).

## ئیسلامی سیاسی و حكومەتی خوا :

عـەشماوی هۆشـداری دەدات لـە تێكـەڵكردنی حكومـەتی خـوا و حكومـەتی خەڵك، یان حكومەتی ئاینی – كە پیاوانی ئیسلامی سیاسی نەریت وایە پەنای بـۆ دەبەن – لەبەر چەندین هۆكار، عەشماوی بەشێوەی پەرش و بڵاو باسی كردووە لە دوو توێی كتێـب و وتارەكـانی، پوختـەكـەی ئەوەیـە تێكـەڵكردنی توونـد لـە نێـوان حكومەتی خوا و حكومەتی خەڵك، بریتییە تێكـەڵ كردنێـك وا دەكـات خـەڵك بـە ناوی خواوە حوكم بكەن – بێ هیچ چاودێر و كۆت و بەندێك – ئەمەش زیان بـە مانـای خوایـەتی دەگەیـەنێ و بـەهاكان سـاختە دەكـات و مافـەكان پێشـێل دەكـات. هەروەك تێكەڵكردنی دوو سیستەمی جیاواز و تۆڕ دروسـتكردن لـە دوو داومبـەنی دژ بەیەك، سەردەكێشێ بۆ دروستكردنی دەوڵەتی ڕەگەزی، كە پشت دەبەستێت بە ئاین بۆ ئەوەی كۆمەڵەیەك بەسەر ئەوانی تردا بە چاكتر دابنێت یـان چـنگی بـە توونڈی بەسەر هاوڵاتیاندا توونـد بكات، بەوەی ئەوەی لێی دەربچێ حوكمی كوفر و ئیلحادی لەسەر بدات.

## ئاين و سياسەت :

لەوانەيـە يـەكێك لـە گـرنگترين كێشـەكان، كـە موسـڵمانان بـە دەسـتيەوە دەناڵێنن ئەمڕۆ، بريتييە لـە كێشـەى بـەكارهێنانى ئـايين لـە كـارى سياسـيدا. زۆر كۆمەڵە و حيزبى سياسى دەركەوتوون، وەسفى خۆيـان دەكـەن بـەوەى ئيسـلامين، بانگەشـەى ئـەوە دەكـەن دەتـوانن حكـومى خـوا بـەرپا بكـەن، دروشـمى (بڕيـار و فەرمان تەنها بۆ خوايە) بەكاردەهێنن، لە بەدەستهێنانى مەبەستەكانى بۆ گەيشتن بە دەسەڵات، سەربارى بانگەشەكردنى بـەردەوامى بـەوەى هـەوڵ بـۆ ئەمـە نـادات، بەڵكو داواى ڕاستى و حەقيقەت دەكات – لە ديدى خۆيەوە – و بۆ بەرزكردنەوەى وشەى خوا و كردنى بە وشەى باڵا. لەوەى پێشوودا تێبينى ئەوەمان كرد محەممەد سەعيد عەشماوى پێى وايە نموونەى ئـەم بانگەوازانـە هەڵـەن، چـونكە حكومـەتى ئاينى گشت بنـەما مێژووييـەكانى لـە دەسـتداوە، چـونكە ئامرازێكـە بـۆ زاڵبـوونى دەسەڵاتى كۆمەڵێك بەسەر دژەڕا و ئاڕاستەكانى تردا، كـە بانگەشـەى ئـەوە دەكات حەقيقـەتى قـۆرخ كـردووە. هـەر بۆيـە دەبيـنين عـەشماوى هەڵوێستى هـەبووە و دەشيبێ بەرامبەر بەم بانگەشانە، لەگـەڵ ئـەوەى بـە توونـدى دەسـتى گرتـووە بـە پێويستى پاراسـتنى دەسـتكەوتەكانى دەولـەتى مـەدەنى و پێشخسـتنيان، چـونكە ئەمڕۆ لە كۆمەڵگە ئيسلاميەكاندا شێوەى حەقيقيان وەرنەگرتووە، ئەوانـە چـەند حكومـەتێكن هێشـتا دەنـاڵێنن بـەهۆى بـوونى چـەند تايبەتمەنديـەكى دەوڵـەتى ڕەگەزيەوە، كە زاڵ و باوبووە لە سەردەمەكانى حكومـەتى ئەمـەوى و عـەبباسـى و عوسمانى.

# ئەبو زەيد و گوتاری ئاينی

## ژياننامە و دانراوەكانی :

نەسرِ حامد ئەبو زەيد لە ساڵی (١٩٤٣) لە ميسرِ لەدايكبووە. لە قوتابخانەدا فێری خوێندن و نووسين بووە، لە تەمەنی هەشت ساڵيدا قورئانی لەبەركردووە. ساڵی (١٩٥١) ڕۆيشتووەتە قوتابخانەی سەرەتايی. بارودۆخە كۆمەڵايەتييەكانی يارمەتی ئەوی نەدا لەسەر بەردەواميدان بە خوێندنی دواناوەندی، هەر بۆيە هەوڵيدا ديبلۆمی ناوەندی پيشەسازی بەشی بێ تەلْ بەدەستبهێنێت، ساڵی (١٩٦١) ڕۆيشتووەتە كار لە بەشی بێ تەلْ، بەڵام خەونی ڕۆيشتنە زانكۆ هێشتا زيندوو بووە لە ناخيدا، ساڵی ١٩٦٨ بڕوانامەی ناوەندی گشتی بەدەست هێناوە، دواتر ڕۆيشتووەتە بەشی زمانی عەرەبی لە كۆليژی ئادابی قاهيرە و لە ساڵی ١٩٧٢ بە پلەی ناياب لەوێ دەرچووە، بە ياريدەدەری توێژەر لە زانكۆ لە هەمان ساڵدا دامەزرێنرا.

نەسرِ حامد ئەبو زەيد ژمارەيەك كتێبی نووسيوە، لەوانە: (مانای دەق... توێژينەوەيەك لە زانستەكانی قورئان، ١٩٩٠)، (ڕەخنەگرتن لە گوتاری ئاينی، ١٩٩٢)، (دەق و دەسەڵات و حەقيقەت... ويستی زانين و ويستی دەسەڵات، ١٩٩٥)، (گوتار و لێكدانەوە، ٢٠٠٠)، چەندين كتێب و توێژينەوەی تری نووسيوە.

### ئەبو زەید و ڕەخنەگرتن لە گوتاری ئاینی:

لە كتێبەكەیدا (ڕەخنەگرتن لە گوتاری ئاینی، ١٩٩٢) نەسرِ حامد ئەبو زەید مانای گوتاری ئاینی و ئامراز و گۆشەنیگاكانی شرۆڤە كردووە. ئەبو زەید لەم كتێبەیدا هەنگاوی ناوە بە دیاریكردنی سێ هەڵوێست سەبارەت بە دیاردەی هەڵكشانی ئاینی ئیسلامی، كە بریتییە لە: (١) هەڵوێستی دامەزراوەی ئاینی فەرمی، چ ئەوەی پشتیوانی دەسەڵاتە یان ئەوەی دژیەتی، (٢) هەڵوێستی چەپڕەوی ئیسلامی، (٣) هەڵوێستی ڕۆشنگەران یان عەلمانیەكان. بە دیدی ئەبو زەید هۆكاری بوونی ئەم سێ هەڵوێستە، بریتییە لە جیاوازی خوێندنەوەی دەقە ئاینیەكان، ئەمە ئەو بابەتەیە كە ئەبو زەید جەختی لەسەر كردۆتەوە لە گشت كتێبەكانیدا بەشێوەیەكی تێروتەسەل و ورد. ئەبو زەید پێی وایە هەڵوێستی یەكەم، هەڵوێستێكی ڕەتكراوەیە، چ ئەگەر لە میانڕەوانەوە یان لە توندڕەوانەوە بێ، سەبارەت بە هەڵوێستی دووەم، ئەوا هەڵوێستێكی هەڵبەستراوە نەوەك كۆشش بۆكراو، هەروەك خاوەنەكانی بانگەشەی بۆ دەكەن، سەبارەت بە هەڵوێستی سێیەم، ئەوا لەو هەڵوێستانەیە كە پشتی دەگرێت و ئەبو زەید لایەنگیری دەكات. لە خوارەوەدا پوختەی ئەم سێ هەڵوێست و ئاڕاستەیە هەیە لە گوتاری ئیسلامیدا، هەروەك ئەبو زەید لە كتێبەكەیدا باسی كردووە (ڕەخنەگرتن لە گوتاری ئاینی، ١٩٩٢)، بەهۆی ئەمەوە تووشی دادگایی و بێ بەشبوون بووەوە لە نازناوی مامۆستا

لە زانکۆی قاهیرە لە بەشی زمانی عەرەبی، دواتر ناچاربوو میسر جێبهێڵێت و بچێتە هۆڵەندا بۆ خوێندن لە یەکێك لە زانکۆ کۆنەکان.

## گوتاری دامەزراوەی ئاینی فەرمی :

گوتاری ئاینی باو لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا، بەتایبەت عەرەبییەکان، بریتییە لە گوتاری دامەزراوە ئاینییە فەرمییەکان، کە هەندێك جار پشتی حکومەتەکان دەگرن، هەندێك جاریش دژیان دەبن، هەر دوو گوتارە پشتگیر و دژەکە هاوشێوەن لە دیدی ئەبو زەیددا، ئەوەش لەبەر ئەوەی شوێن هەمان ئەو ڕێوشوێنانەی گوتاردان و گۆشەنیگا هزرییەکان دەکەون.

<u>یەکەم</u>: ئامرازەکانی گوتاری دامەزراوەی ئاینی فەرمی: پێنج ڕێوشوێن و ئامرازن، لەگەڵ یەك پەیوەست و ئاڵۆزن بەشێوەیەکی مەزن، ناکرێ یەکێك لەوەی تر جیا بکرێتەوە بە هەر دۆخێك بێت، پێکهاتەیەکی کامڵ پێکدێنێت لە قۆرخکردن و توندگیری و دواکەوتن. لە خوارەوەدا بەشێوەیەکی پوخت ئەم پێنج ئامراز و ڕێوشوێنە خراونەتەڕوو:

١- ئامرازی یەکخستنی هزر و ئاین: ئاین بریتییە لە کۆمەڵە دەقێکی ئاینی (قورئان و فەرموودە)، هزری ئاینی: بریتییە لە ڕێگە یان شێوازی تێگەیشتن لەم دەقانە (کۆی ڕاڤە و شرۆڤەکان). جیاکاری کردن لە نێوانیان لە دیدی ئەبو زەیددا زۆر پێویستە، چونکە ڕێگە نادات بە چەقبەستنی دەق و کورت کردنەوەی لە یەك تێگەیشتندا، کە ڕاجیایی هەڵنەگرێت. ئاین

خوایيە، بەڵام هزری ئـاینی مرۆییـە، نـاکرێ بـۆ هـزری مرۆیـی تێگەیـستنی خوایی قۆرخ بکات، چونکە بێ هەڵە و تێکەڵ و پێکەڵکاری نییـە، جیاکـاری نـەکردن لـە نێـوان ئـەوەی خواییـە لەگـەڵ ئـەوەی مرۆییـە، یەکێکـە لـە ئامرازەکانی گوتاری ئاینی دامەزراوەی ئاینی فەرمی، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ بە بـەرداکردنی پیرۆزی بـە بـەر مرۆڤـدا، کـە ئـەمڕۆ خـۆی لـە پیـاوانی ئاینیدا دەبینێتەوە، لەوانەیە ئەم پیرۆزیە درابێتـە پـاڵ پیـاوانی ئـاینی، بـە دیدی ئەبو زەید، ئەو شتەبێ کە ڕاڤەی دوودڵی زۆرێك لە نووسەران دەکات لە بە هەڵەدانانی زۆرێـك لـە ڕاکـانی زانایـانی ئـاینی، بـەڵکو هەنـدێك جار پەردەپۆش کردنی ئەم ڕایانە و پاسـاو بـۆ هێنانـەومیان. شـایەنی باسـە ئـەم بابەتـە محەممـەد سـەعید عـەشماوی بـە شـێوەیەکی تێروتەسـەل دیـاری کردووە، کاتێك لێکۆڵینەوەی کردووە لەسەر جیاوازی نێـوان ئـایین و هـزری ئاینی.

٢- ڕێوشوێن و ئامرازی گێڕانەوەی دیاردەکـان بـۆ یـەك بنـەما: ئـەم ڕێوشـوێنە خۆی دەبینێتەوە لە کـورت کردنـەوەی گشت ئـەو پرسانەی گوتـاری ئـاینی چارەیان دەکات بە چەمکی بەرتەسك، ئامانج لێی هاندانی موسڵمانانە دژی ئەو بابـەت و هزرانـەی پیـاوانی ئـاینی ڕەتـی دەکەنـەوە، نـەوەك ئـایین. بـۆ نموونە عەلمانییەت کورت دەکرێتەوە بە گوزارشتی (جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵــەت)، مارکسـییەت کـورت دەکرێتــەوە بــەوەی (کـوفر و ئیلحــادە)، فرۆیدیەت کورت دەکرێتەوە بەوەی (زەلکاوی سێکسە)، داروینیـەت پوخـت دەکرێتـەوە بـە (ئازەڵایـەتی مـرۆڤ)، لیبراڵییـەت کـورت دەکرێتـەوە بـەوەی (خۆداماڵینە لە بەها و ڕەوشت)، جگـە لەمانـەش لـە کورتکردنـەوە پـیس و ئامانجدارەکان. پیاوانی ئاینی تەنها ئەومیان بە بەس نەزانیوە ئەو چەمکانە

کورت بکەنەوە کە لە دەرەوەی ئاینەوە هاتوون، بەڵکو شتەکەیان فراوان کردووە تا خودی ئاینیشی گرتۆتەوە بە گوزارشتی (بڕیار و بەرنامە تەنها بۆ خوایە)، تاوتوێی ئەمە دەکەین لە پرسی (فەرمانڕەوایی)دا، کە گوزارشت دەکات لە یەکێك لە گۆشەنیگاکانی ئاینی، هەروەها گێڕانەوەی گشت قەیرانێك لە قەیرانەکانی واقیع لە کۆمەڵگەی ئیسلامی، بەڵکو گشت قەیرانە مرۆییەکان، بۆ (دووربوون لە پەیڕەوی خوا)، لە تێڕوانینی ئەبو زەیددا لە حەقیقەتدا گوزارشت دەکات لە (دەستەوەسانبوون لە ئاست هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ڕاستییە مێژووییەکان، فڕێدانیان بۆ بازنەی ڕەها و جیهانی نادیار. دەرەنجامی ئەگۆڕی ئەم پەیڕەوە پاڵپشتی واقیع و قوڵکردنەوەی نامۆبوونی مرۆڤ تیایدا دەکات، هەروەها وەستان لە پاڵ دواکەوتوویی دژی گشت هێزێکی پێشکەوتن)، ئەمە پەیڕەوێکە ناگونجێ لەگەڵ ئەوەی پیاوانی ئاینی بانگەشەی بۆ دەکەن لە هەوڵدانیان بۆ چاکسازی و گەشەپێدان و پێشکەوتن و پەرەپێدان.

٣- ئامراز و ڕێوشوێنی پشتبەستن بە کەلەپور و پێشینان: ئەم ئامرازە ئامانجی ئەوەیە (وتەکانی پێشینان و کۆششەکانیان، بکاتە چەند دەقێك کە مشتومڕ هەڵنەگرن، یان دووبارە چاونەخشێنرێتەوە بە ڕامان و کۆششەکان) بەڵکو کردنی بە بەشێك لە ئایین. سەرباری ئەمە ئەوا ئەم ئامرازە پشت دەبەستێت بە ویست و سوودگەرایی لە وەرگرتنی کەلەپوری پێشیناندا، بەو مانایەی شت لە هەندێك لە پیاوانی پێشین وەردەگرێ و پیرۆزیان بە بەردا دەکات و لەوانی تر دادەپۆشێ و تۆمەتباریان دەکات بەوەی لە ئاینی ڕاستەقینە لایانداوە. ئەم ئاڕاستەیە لە گوتاری ئاینیدا هانی تاقمگەرایی و

مەزهەبیەت و توندڕەوی دەدات، چونکە حەق و ڕاستی کورت هەڵدێنێت لە دەستەیەکی دیاریکراودا و لە دەستەکانی تر قەدەغەی دەکات.

٤- ئامرازی دڵنیایی هۆشمەندی و یەکلاکردنەوەی هزری: ئەم ئامرازە پشت دەبەستێت بە بنەمای قۆرخکردنی حەقیقەت، کە پیاوانی ئاینی بۆ خۆیان بانگەشەی بۆ دەکەن، پێیان وایە هەردەم ڕاستی لەگەڵ ئەوانە و ئەوەی دژیان بێت گومڕا و نەفامە. (ئا بەم شێوەیە، گوتاری ئاینی کاتێك پێی وایە حەقیقەتی قۆرخ کردووە، ئەوا ڕاجیایی قبوڵ ناکەن تەنانەت لە وردەکاری و لق و پۆپەکانیشدا، لێرەوە لێبوردەیی و سینە فراوانیەکی مایەی سەرسوڕمانە، کە توندگیری و دەکارگیری لەخۆی دەگرێت. بەڵام ئەگەر ڕاجیایی ڕووکەشی بەزاند و ڕۆچوو بۆ قوڵایی و ڕەگ و ڕیشەکان، ئەوا گوتاری ئاینی خۆی دەپارێزێ بە بانگەشەی حەقیقەتی ڕەهای گشتگیر، کە گوزارشتی لێدەکات، پەنای بردۆتەبەر زمانی یەکلاکردنەوە و دڵنیایی و بڕاندنەوە، لێرەوە ئەو پەرە خەیاڵیە لادەچێ، کە هەندێکیان پێیان وایە جیاکاری دەکات لە نێوان میانڕەوی و توندڕەوی).

٥- ئامرازی و ڕێوشوێنی بەفیڕۆدانی ڕەهەندی مێژوویی: ئەم ئامرازە هەڵدەستێت بە یەکخستنی ڕابردوو و ئێستا، بەو مانایەی کار دەکات لەسەر ڕەتکردنەوە یان بەفیڕۆدانی ڕەهەندی کاتی و ئەو گۆڕانەی پێیەوە پەیوەستە، لە گۆڕانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و کەلتوری و جگە لەمانەش. ئەم ئامرازە دواتر سەردەکێشێ بۆ (ئەندێشەکردنی هاوئاهەنگی و گونجان لە نێوان کێشە و ئاواتەکانی ئێستا لەگەڵ کێشە و ئاواتەکانی ڕابردوو، گریمانەکردنی ئەوەی چارەسەرەکانی

ڕابــردوو گونجـاون بـۆ جێبـەجێكردن لەســەر دۆخـی ئێسـتا)، هـەروەك سەردەكێشێ بۆ تێنەگەیشتنی لە جوڵەی ئیسلام لە قۆنـاغی سـەرهەڵدان و گونجـانی لەگـەڵ واقیعـی كۆمەڵگـەی عـەرەبی لـەو سـەردەمدا، بـەمانای ڕەتكردنەوەی پەیوەندی مشتومڕ ئامێزی نێـوان ئیسلام و واقیـع، دابڕینـی ئیسلام لە واقیع و مێژوو.

دووەم: گۆشـەنیگاكانی گوتـاری دامـەزراوەی ئـاینی فـەرمی: ئـەبو زەیـد باسـی دوو گۆشـەنیگای سـەرەكی كـردووە، كـە گوتـاری ئـاینی فـەرمی پشتیان پێدەبەسـتێت، ئـەوانیش بـریتین لــە: فەرمانڕەوایــەتی و دەق، ئەمانــە بەشـێوەیەكی تۆكمــە پەیوەستن بـەو پێـنج ئامرازانـە لەسـەرەوە باسـكران، نـاكرێ بـە ئاسـانی جیاكاری بكرێ لە نێـوان ئـەوەی ئـەم دوو گۆشـەنیگایە بەرپرسـن لـە بـوونی ئـەم ئـامراز و ڕێوشـوێنانە یـان بـە پێچـەوانەوە ڕاسـتە، هـەر چییەك بێـت، ئـەوا ئـەم دوو گۆشەنیگایە گوزارشت دەكەن لـە كێشـەیەكی مـەزن لـە هـزر و گوتـاری ئـاینی. لە تێڕوانینــی ئــەبو زەیــددا هــەر دوو گۆشــەنیگای فەرمانڕەوایــەتی و دەق پشــت دەبەســتن بــە دوو بنچـینەی گـرنگ: یەكـەم، سـنووردار كردنـی ڕۆڵـی عـەقل و ڕەتكردنــەوە ڕاجیـایی و فرەیـی. دووەم، دۆخـی مرۆیـی بەرامبـەر بـە خـوایی و بەراوردێكی بەردەوام لە نێوان پەیڕەوی خوایی و پەیڕەوەكانی مرۆڤ.

١- فەرمانڕەوایی: ئیسلامییەكان لـە گشت بۆنەیەكدا باسـی فـەرمانڕەوایی خـوا دەكەن و ئەو دروشمەیان بەرز كردۆتەوە (بڕیار و فەرمان تەنها بـۆ خوایـە). فەرمانڕەوایی خوا دەمانبات بەرەو فـەرمانڕەوایی كتێبەكـەی (كـە قورئانـە). فـەرمانڕەوایی قورئـان دەمانبـات بـەرەو فـەرمانڕەوایی ڕافـەكارانی قورئـان، قورئان كۆمەڵێك سورەتە، ئەم سورەتانە لە كۆمەڵێك ئایەت پێكهاتوون، ئـەم

ئایەتانەش ڕاجیایی لەبارەی ڕاڤە و تێگەیشتن لێیان هەیە، بەڵام کۆمەڵێك لە پیاوانی ئاینی هەن تێگەیشتنی حەقیقی ڕاست بۆ قورئان دەدەنە پاڵ خۆیان. ئەمە کێشەی ڕاستەقینەیە، گوتەی (بڕیار و فەرمان تەنها بۆ خوایە) لە حەقیقەتەکەیدا ئاوایە (بڕیار تەنها بۆ پیاوانی ئاینیە)، دواتر لە حکومەتی مرۆڤەوە، کە دەتوانن بەهەڵەی دابنێین و ڕەخنەی لێبگرین و لە حکومەت دەریان بکەین، بچینە سەر حکومەتی پیاوانی ئاینی، پیرۆزی دەدەنە پاڵ خۆیان، دواتر ناکرێ بەرهەڵستیان بکرێت و ڕەخنەیان لێبگیرێت، ئەبو زەیدە گوزارشتی لەمە کردووە بەم وتەیەی: ((ئەگەر گوتاری ئاینی بە چەمکی فەرمانڕەوایی ئامانجیەتی دەستبگرێت بەسەر حوکمڕانی مرۆڤ و یەکتر کۆیلە کردن، ئەوا ئەم چەمکە کۆتایی دێت لەسەر ئاستی جێبەجێکردنی بۆ حوکم کردنی جۆرە کەسێکی تایبەت، وا بۆی دەچن ماف تێگەیشتن و ڕاڤە و لێکدانەوە و شرۆڤە بۆ ئەوان قۆرخ کراوە، تەنها ئەوان شت لە خواوە دەگوازنەوە. ئەگەر بتوانرێ بەرەنگاری حوکمڕانی مرۆڤ بکرێ یان تێکۆشان لە دژی ئەنجام بدرێ و بگۆڕدرێ بە شێوازەکانی خەباتی جیاوازی مرۆیی، گۆڕینی بە سیستەمی دادگەرتر، ئەوا تێکۆشان دژی حوکمڕانی شەرعناسان دەبێتە هۆی تۆمەتبارکران بە بێ باوەڕی و ئیلحاد، بەوپێیەی دەرچوونە دژی حوکمی خوا. بەمەش ئەم تێگەیشتنە دەبێتە چەکێکی مەترسیدار توانای ئەوە لە دەست مرۆڤ دەدات کە هەر گۆڕانکارییەك بکات بەسەر بارودۆخەکەیان، چونکە بواری ململانێ لە جەنگی نێوان مرۆڤ و مرۆڤەوە دەگوازێتەوە بۆ جەنگی نێوان مرۆڤ و خوا)).

٢- دەق: گوتاری ئاینی ئیسلامی بەهەمان شێوە لە گوتەی (کۆشش لەوەدا نییە کە دەقی لەسەر هاتووە) هەنگاودەنێ، مەبەست لە دەق قورئان و

فەرموودەیە، بە سروشتی حاڵ ملکەچی تێگەیشتنی مرۆڤن، ئەمەش لەبەر ئەوەی (دەقەکان لە دەربڕین و بێژەدا چەسپاون، لە مانادا گۆڕاو و جوڵاون).
لە کاتی لێکۆڵینەوە لە مانای دەقدا، ئەبو زەید ئەو مانایەی بۆ دەق پێشکەش کـردووە، وتویـەتی: ((پێشـینان بـە نـاوی دەقـەکان، ئاماژەیـان بـە قورئـان و فەرمووده نەکردووە، وەك چۆن ئێمە لە زمانی هاوچەرخدا وا دەکەین، بەڵکو ئەوان ئاماژەیان بە دەق دەکرد، مەبەستیان لێی بەشێکی کەم بوو لە سروش، یان بە دەربڕینێکی تر ئەوەی کەمترین فرەیی لـە مانـادا هـەڵناگرێت بـەپێی بنیاتە زمانەوانیەکەی. ئەمە ئەوەیە کە دابەزینەکەی پێویستی بە لێکدانەوە و ڕاڤە نییە، ئـەوەی وەسـفی ڕوونـی ئامـاژەیی لەسـەری جێبـەجێ نـەبێ، کـە لەگەڵیدا پێویستی بە ڕاڤە نییە، ئـەوا ئەمـە دەق نییـە، هـەر بۆیـە پێویسـتە هەڵهێنجان و بەڵگە هێنانەوە پـەیڕەو بکـرێ، سـەبارەت بـەوەی دەق نییـە لـە کتێبی خوادا))، زیـاتر دەڵێت: ((ئەگـەر دەقەکـە ماناکـەی لێبڕاوە بـوو، هـیچ ماوەیەك نەما بۆ هیچ پلەیەکی گریمانـەیی، ئـەوا دەقـەکان کـەم و دەگمـەنن، بەتایبەت لە بواری شەریعەتدا)).

ئەم تێگەیشتنە کە ئەبو زەید پێشکەشی کردووە بۆ دەق، لە ڕەگەوە گوتەی (کۆشش لەوەدا نییـە کـە دەقـی لەسـەر هـەبێ) ڕەت دەکاتـەوە، دەرگا دەخاتەسـەر پشت بۆ عەقڵ تا بچێتە گۆڕەپانی کۆشش بێ ترس و بیم. پێی وایە گوتاری ئاینی کاتێك ئەم گوتەیـە بـەرز دەکاتـەوە بـە ڕووی عـەقڵ و کۆششـدا، ئـەوا لـە ڕاسـتیدا هەڵدەسـتێت بـە کـرداری هەڵخەڵەتانـدنی هـزری فێڵبازانـە، لەوانـە ڕەتکردنـەوەی کۆشش، بوار واڵاکردن لەبەردەم ڕەتکردنەوەی فرەیی و چەسپاندنی واقیع بـەپێی ئەوەی پێشکەشی دەکات لە ڕا و کۆششەکان.

## گوتاری چەپڕەوی ئیسلامی :

چەپڕەوی ئیسلامی لە دیدی ئەبو زەید دەرکەوت لە سەرەتای هەشتاکان لە میسردا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ چەپڕەوی ئیسلامی بەر لەو کات نەبووە، بەڵام بەو شێوەیە دیار نەبووە وەك ئەوەی لە هەشتاکاندا هەبووە. چەپڕەوی ئیسلامی جیاواز نییە لە گوتاریدا لەگەڵ گوتاری دامەزراوەی ئاینی فەرمی، چونکە لە هەمان چەسپاوە زانستیەکانەوە هەنگاودەنێ، کە دەقە ئاینیەکان پێشکەشی دەکەن، بەڵام ئەوەی گوتاری چەپڕەوی ئیسلام جیا دەکاتەوە لە گوتاری دەمەزراوەی فەرمی، بریتییە لە زاڵبوونی هەندێك لە ئامرازەکانی گوتاری فەلسەفی بەسەر هەندێك لە تێزەکانی. سەبارەت بەلایەنی هزری و زانستی، ئەوا هەر دوو گوتاری فەرمی و چەپڕەو کۆکن لەسەر ئەوەی دەستگرتن بە کەلەپورەوە، ڕێگەی چاکسازی خوازراوە، لەم بارەوە ئەبو زەید دەڵێت: ((جیاوازی لە نێوان چەپڕەو و ڕاستڕەو وا دەردەکەوێ جیاوازیەکی ڕووکەشییە، سەبارەت بە ئاستی بنیاتی قوڵ، ئەوا هەر دووکیان کۆکن لە وێناکردنی چارەسەردا. چارەسەرکردنی کێشەکانی واقیعی ئێستا – خۆی لە کەلەپوردا – دەبینێتەوە، ئەگەر ڕاستڕەو ئێستا دروشمی (ئیسلام چارەسەرە) بەرز بکاتەوە، ئەوا دروشمی چەپڕەو بریتییە لە (نوێسازی کەلەپور چارەسە)، لەسەر ئەمە چەپڕەو و ڕاستڕەو بەیەکدەگەن لەوەی ڕابردوو بکەنە بنچینە و ئێستا بکەنە لق، ڕەوتی چەپڕەو سادەیی پێشنیازی ڕاستڕەوان دەبەزێنێ، کەلەپور دەکاتە خاڵی دەستپێك و کۆتایی، کۆگای چارەسەرەکانە، چونکە بەرپرسی قەیرانەکەیە)).

هەر بەم هۆیەوە ئەبو زەید هیچ جیاوازیەك نابینێ لە نێوان گوتاری چەپڕەو و ڕاستڕەوی ئیسلامی، جگە لەوە نەبێ گوتاری چەپڕەوی بانگەشەی

گونجاندن دەکات لـە نێـوان دامـەزراوەی ئـاینی فـەرمی لەگـەڵ گوتـاری ڕۆشـنگەرە عەلمانیـەکان، هەوڵـدان بـۆ گونجانـدنی ئەمـە سـەری کێشـاوە بـۆ ئـەوەی گوتـاری ئیسلامی گوتارێکی گونجێنراو بێ، ئەوەی ڕەوتی چەپڕەوی بانگەشـەی دەکـەن لـە دووبـارە بنیاتنانـەوە، تـەنها ڕووکـەش بۆیـاخ کردنـە، هـەر بۆیـە پـرۆژەی ڕەوتـی چەپڕەوی ئیسلامی زیانی بۆ چاکسازی زیاتر دەبێ لە گوتاری دامەزراوەی فەرمی.

## گوتاری عەلمانی :

یەکێك لە گرنگترین ئەو تۆمەتانەی ئەبو زەید ڕووبەڕووی بۆتەوە، بریتییە لە تۆمەتی عەلمانیەت، کە وا بە مێشکی بیسەردا دێنێت ئەمە هاومانای کوفر یـان ئیلحادە، هۆکـاری ئـەم تۆمەتـەش ئەوەیـە کـە ئـەبو زەیـد پێـی وایـە عەلمانیـەکان توانایان زیاترە لە تێگەیشتن لـە ئـایین و هەڵسوکەوت کـردن لەگـەڵی لـە کاروانی گەشە و ڕابووندا، کە کۆمەڵگە ئیسلامییەکان حەزیان لێیە، ئەبو زەید پێشی وایـە عەلمانیـەت لەگـەڵ ئـایین تێکنـاگیرێ، سـەبارەت بـەوەی دەوتـرێ لـەبارەی ئـەوەی عەلمانیەت کوفر یـان ئیلحـادە، ئەمـە تـەنها هـەوڵێکی پـیس و فێڵبازانـەی پیـاوانی دامـەزراوەی ئـاینی فەرمییـە بـۆ شـاردنەوەی ڕۆڵـی عەلمانیـەکان و کـەم کردنـەوە بایەخـەکانیان، دەڵێـت: ((عەلمانیـەت لـە ناوەڕۆکەکەیـدا، تـەنها بریتییـە لـە لێکدانەوەیـەکی ڕاسـتەقینە و تێگەیشـتنێکی زانسـتی بـۆ ئـایین، ئـەوەی بوچەڵکەرەوانی عەلمانیەت ڕەواجی پێدەدەن لەوەی ئیلحادە، ئایین لـە کۆمەڵگە و ژیان دادەبڕێ وا نییە))، عەلمانیەکان جیاوازی دەکەن لە نێوان جیاکردنەوەی ئایین لـە دەسـەڵاتی سیاسـی، لەگـەڵ جیاکردنـەوەی ئـایین لـە کۆمەڵگـە. جیاکردنـەوەی یەکەم گونجاوە و پێویسـتە، بـەڵام جیاکردنـەوەی دووەم وەهـم و خەیاڵە، چونکە

ئەبو زەيد بە نكۆڵی كردن لە بیرۆكەی جیاكردنەوەی ئایین لە كۆمەڵگە دەڵێت: ((كێ هێزی جیاكردنەوەی ئاینی لە كۆمەڵگە هەیە، ئایا چ هێزێك دەتوانێ بڕیارەكە جێبەجێ بكات، ئەگەر كرا دەربچێ؟)).

ئەبو زەید عەلمانیەت پێناسە دەكات بەوەی: ((دژی ماق بەدەستەوەگرتنی حەقیقەتی ڕەهایە، بۆ بەرگری كردن لە ڕێژەیی و و مێژوویی و فرەیی و ماق ڕاجیایی، بەڵكو ماق هەڵە))، پێشی وایە: ((ئیسلام ئاینی عەلمانیە بە پلە یەك، چونكە داننانێت بە دەسەڵاتی كەهەنوتی، گوزارشت دەكات لە سەرەتای ڕزگاركردنی عەقڵ، بۆ ڕامان لە جیهان و مرۆڤ واتە سروشت و كۆمەڵگە و دۆزینەوەی یاساكانی)). لەمەوە درك دەكەین بەوەی عەلمانیەت لە تێڕوانینی ئەبو زەیددا لەگەڵ ئایین تێكناگیرێ، بەڵكو لەگەڵ پیاوانی ئاینی تێكدەگیرێ، چونكە لە گوتارەكەیدا پشت نابەستێ بەو ڕێوشوێنانەی پیاوانی دامەزراوەی ئاینی فەرمی پشتی پێدەبەستن، كە بریتییە لە: ((یەكخستنی هزر و ئایین، گێڕانەوەی دیاردەكان بۆ یەك بنچینە، پشت بەستن بە دەسەڵاتی كەلەپور و پێشینان، دڵنیایی هۆشمەندی و یەكلاكردنەوەی هزری، بەفیڕۆدانی ڕەهەندی مێژوویی))، بەهەمان شێوە پشت نابەستێت بە گۆشەنیگا هزریەكان، كە بریتییە لە (فەرمانڕەوایی و دەق). عەلمانیەتی ئاینی، كە نەسر ئەبو زەید بانگەشەی بۆ دەكات، لەسەر سێ بنچینە دادەمەزرێ: عەقڵ و ئازادی و دادگەری كۆمەڵایەتی، دەكرێ بە مەبەستی سەرەكی تازەی پرۆژەی ئیسلامی دابنرێن، بەبێ ئەمانە ناكرێ كۆمەڵگەی مەدەنی بنیاتبنرێ، جا دەڵێت: ((عەلمانیەت بریتییە لە پاراستنی ڕاستەقینەی ئازادی ئایین و بیروباوەڕ و هزر و ئازادی داهێنان، ئەمە ئازادی ڕاستەقینەیە بۆ كۆمەڵگەی مەدەنی و بەبێ ئەمە بەرپا نابێ)).

ئەو رايەى ئەبو زەيد بـە بنـەماى دەكات، چەندين پشتيوانى هەيـە، بـەڵام هەردەم خۆيان دەپارێزن لە باسكردنى وشەى عەلمانيەت بەشـێوەيەكى ڕاشـكاو، لـە جيـاتى ئـەو (كۆمەڵگـەى مـەدەنى) بـەكاردەهێنن، بـەڵام ئـەبو زەيـد سـورە لەسـەر بەكارهێنانى وشەى عەلمانيەت، چونكە پێى وايە وشـەيەكى گونجـاو و وردە و پێـى وايە هەڵاتن لە بەكارهێنانى جۆرێكە لە هەستيارى ئاينى، كە عەلمانيەكان ملكەچى دەكـرێن، لـە ترسـى ئـەوەى تۆمـەتبار بكـرێن بـە كـوفر و ئيلحـاد، سـورە لەسـەر گەياندنى پەيامى عەلمانيەت بۆ ئيسلامييەكان و جەماوەرى بێدەنگ، پێشى وايـە عەلمانيـەت نەگەيشـتۆتە ئيسـلامييەكان، ((گـرنگ ئەوەيـە بگاتـە جـەماوەرى بـێ دەنگى سەرگەردان لە نێوان ئيسلام و عەلمانيەت، كـە بێـدەنگى هەڵبـژاردووە، ئـەم بێدەنگيەش سەردەكێشێ بۆ ئەم دۆخەى ئێستا هەيە)).

پوختەى گوتارى ئاينى عەلمانى، خۆى دەبينێتەوە لە دووبارە خوێندنـەوەى دەقە ئاينى و كەلەپوريەكان، بەشێوەيەكى عەقڵى و هێواش، لەگـەڵ ڕەچاوكردنى بـارودۆخى مێـژوويى، كـە دەقەكـەى تيـادا دەرچـووە، ئەمـەش سەردەكێشـێ بـۆ جياوازى كـردن لـە نێوان هـزرى ئـاينى و ئـايين، ڕەتكردنـەوەى پيرۆزى ئەوانـەى تێگەيشتنى دەقيان قۆرخ كردووە، ڕزگاركردنى فەتوا و كۆشش لە دەسەڵاتى دەق و زاڵكردنى دەسەڵاتى واقيع و بەرژەوەندى.

## گوتـارى ئاينى و ئاينده:

ئـەوەى نەسـر حامـد ئـەبو زەيـد پێشكەشـى كـردووە لـە بـوارى گوتـارى ئيسلاميدا، لە شرۆڤەكردنى ئامراز و گۆشە نيگاكانى، بە كارێكى جياواز دادەنـرێ،

بەشێوەیەك بەشداربووە لە وێنەکێشانی سیماکانی ئیسلامی تازە، کە ژمارەیەك لە توێژەرانی ئەکادیمی لە دەرەوەی دامەزراوەی فەرمی کار لەسەر پێکهێنانی دەکەن. لەوانەیە گونجاوبێ بوترێ، دیاری کردنی ڕێوشوێنەکانی و گۆشەنیگاکانی هەر گوتارێکی ئاینی یان نا ئاینی، بە چاودێری کردنی ئایندە دادەنرێ، کە ئەم گوتارە حەز لە دەستەبەرکردنی دەکات، هەر بۆیە توێژینەوەی گوتاری ئاینی، وێنەیەکمان لەبارەی ئایندە پێدەدات، کە چاوەڕوانی کۆمەڵگە موسڵمانەکان دەکات، لە دۆخی زاڵبوونی ئەم گوتارەدا، شتێکی ڕوونە لە ڕێی شیکردنەوەکانی ئەبو زەید ئایندەی چاوەڕوانکراو، لە دۆخی سەروەری گوتاری ئاینی فەرمی یان چەپڕەو، خەسڵەتی توونـدڕەوی و دواکـەوتوویی و قۆرخکـاری تێـدا بەدیـدێت، ئەمـە لەگـەڵ داخوازیەکانی سەردەم ناگونجێ، دواتر موسڵمانان لە گۆڕەپانی ژیان دەردەچن و دەچنە مەیدانی مۆزەخانەی مێژووی ئیسلامی.

# عەلی وەردی و پەیوەندی ئایین بە کۆمەڵگەوە

## زانستی کۆمەڵناسی و ئایین:

عـەلی وەردی (١٩١٣ — ١٩٩٥) بڕوانامـەی ماسـتەر و دکتـۆرای لـە زانسـتی کۆمەڵناسـی، لـە زانکۆی تەکساسـی ئـەمریکی، لـە ساڵی (١٩٥٠) بەدەستهێنا. عـەلی وەردی زانستەکانی کۆمەڵایەتی بەکارهێنا لە توێژینەوەی پەیوەندی کۆمەڵگە بـە ئاینەوە، چۆن کار لە یەکتر دەکەن. لەوانەیە گشت دانراوەکانی دکتۆر عەلی وەردی تاوتوێی ئەم پەیوەندیەی کردووە بە شێوەیەکی زیاتر یان کەمتر، بەڵام ناودارترین دانراوەکانی، کە بەرەو ڕووی ئەم پەیوەندییە بوومتە بەشێوەیەکی ورد و ڕاشکاو، بریتین لە هەر دوو کتێبی (واعیزەکانی سوڵتان، ١٩٥٤) و (گاڵتەجاری عەقڵی مرۆڤ، ١٩٥٥)، شایەنی باسە، نووسەری مەزن سەلامەت موسا لەبارەی کتێبەکانی عەلی وەردی لـە کتێبەکەیدا (خـود ڕۆشـنبیر کـردن) نووسـیویەتی: ((چـاکترین شـت ئامۆژگار بکەین بۆ ئەوەی دەستی پێوە بگیرێ، لـە توێژینـەوەی ئـەدەبی عـەرەبی کۆن، بریتین لە دوو کتێبی دکتۆر عەلی وەردی. یەکەمیان (واعیزەکانی سوڵتان). دووەمیان (ئەفسانەی ئەدەبی باڵا). ئەم دوو کتێبە عەقڵەکان دەکاتەوە و چاوەکان واڵـا دەکـات بـە یەکـەوە، لەسـەر حەقیقەتـەکان، کـە زۆرێـك ڕاهـاتوون لەسـەر شاردنەوەیان. ناکرێ تێگەیشتن لە ئەدەبی عەرەبی فەراهەم ببێ بەبێ ئەمانـە)). ئەم وشانە لە نووسەرێکی مەزنی وەك سەلامەت موسا، مانا و مەبەستی فراوانی هەیە، ئاگادارمان دەکاتەوە سەبارەت بەوەی نووسینەکانی دکتۆر عەلی وەردی ئەوە دەگرێتەوە کە ئەوانی تر ناوێرن لەسـەری بدوێن، ئەمـە هـەمان ئـەو شـتەیە کـە پاڵمان دەنێت بۆ ئاڕاستەکردنی خوێنەر بۆ گشت دانراوەکانی عەلی وەردی.

یەکێك لەو فرە بابەتانەی عەلی وەردی لە دانراوەکانیدا تاوتوێی کردووە، دەمانەوێ دوو بابەت بیر خوێنەر بێنینەوە، ئەویش: کرچ و کاڵییەکانی ئامۆژگاری ئاینی، کێشەی پێشینە چاکەکانە.

## کرچ و کاڵییەکانی ئامۆژگاری ئاینی :

لە کتێبەکەیدا (واعیزەکانی سوڵتان)، عەلی وەردی قسەی کردووە لەبارەی ڕۆڵی نەریتی وتار و ئامۆژگاری ئاینی باو، لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا کە بەشێوەیەکی سەرەکی پیاوانی ئاینی بە بنەمای دەکەن، پێیان وایە ڕێگەی سەرکەوتووە بۆ چاککردنی کۆمەڵگەکان و دوورخستنەوەی لە کەندەڵانەکانی تاوان و لاساری و سەرپێچی، بەگوێرەی دەربڕینی ئەوان. عەلی وەردی پێی وایە شێوازی پەیڕەوکراوی ئامۆژگاری و وتاردانی ئاینی کار دەکات لەسەر دروستکردنی ناکۆکی دەروونی، کە دەبێتە هۆی دووڕوویی کەسایەتی، ئامۆژگاری ئەو ڕۆڵە گرنگەی نییە لە چاکسازیدا، دەڵێت: ((ئامۆژگاری و ڕێنمایی زیانی زۆر دەبێ لە پێکهێنانی کەسایەتی مرۆییدا، ئەگەر ئومێدی چەند ئامانجێکی پێچەوانەی بەهاکانی نەریتی کۆمەڵایەتی بوو)). بەمەش لە پاڵ نەریتی کۆمەڵایەتی ناوەستێ و پێی وابێ ڕاستی تێدایە، بەڵکو پێی وایە عەقڵی هۆشیار وەڵامی ئامۆژگاری دەداتەوە، لە کاتێکدا عەقڵی شاراوە هیچ شتێك تێناگات لە ئامۆژگاری و ڕێنماییەکان، چونکە سەرقاڵە بەوەی نەریتی کۆمەڵایەتی دەیبەخشێ لە داب و نەریت و پێگە، دواتر دەکەوێتە نێوانی دوو دژیەك، سەردەکێشن بۆ دروستکردنی کەسایەتیەکی دوو سەرە، ئەمە وای لە عەلی وەردی کردووە بڵێت: ((دوای لێکۆڵینەوەیەکی درێژ تێبینی ئەوەم کردووە عەرەب دووچاری نەخۆشی دووڕوویی بوونەتەوە لە

کەسایەتیدا زیاتر لە گەلانی تر. لەوانەیە هۆکاری ئەمەش لەوەوە بێ کە کەوتوونەتە ژێر دوو هۆکار، لە میانەی گەشەی شارستانیاندا، ئەوانیش بریتین لە: دەشتەکی بوون و ئیسلام. لە سەرەتای ژیانیان لە بیابان گوزەراندوویانە، دواتر ئیسلام لە دوای ئەمە هات، ڕێنمایی پێچەوانەی بەهاکانی دەشتەکیایەتی کۆنی پێبوو)).

ئەوەی وا دەکات ئامۆژگاری بێ سوود بێ، لە دیدی عەلی وەردیدا، بریتیە لەوەی ئامۆژگاریکاران ڕەچاوی بارودۆخی خەڵك و واقیعەکەیان ناکەن، بەوەی ئامۆژگاریان بکەن بەوەی لە توانایاندایە، بەڵکو نموونەی باڵایان بۆ دێننەوە، کە ناتوانن پێی بگەن، دواتر وازی لێدێنن، ئایا نرخی ئەو نموونە باڵایە چییە، کە سوودی بۆ خەڵك نییە لە ژیانیاندا؟ لەبەر ئەمە دەبینین دەڵێت: ((ئەوەی شایەنی ئامۆژگاری کردنە لەبارەیەوە، ئەوەیە ئامانجی ڕەوشتی دابنرێتە بەردەم زۆرێك لە خەڵك، بۆ ئەوەی بەمە هانیان بدەن بۆ هەوڵدان و کێبڕکێ کردن بۆ گەیشتن پێی)). ئەوان هەردەم داوا لە خەڵك دەکەن واز لە داب و نەریت و هەڵسوکەوتێك بهێنن، کە بوونەتە بەشێك لە کۆمەڵگە. نموونەی ڕوون لەم بوارە لە واقیعی کۆمەڵایەتی عێراق بۆتان دەگوازینەوە. یەکێك لە پیاوانی ئاینی شیعە کتێبێکی دەرکرد بە ناونیشانی (وریابە لەماڵەکەتدا شەیتانێك هەیە)، مەبەستی لەو شەیتانە ئامێری تەلەفزیۆن بوو. داوای لە خەڵك کرد ئامێری تەلەفزیۆن بەکارنەهێنن، چونکە سەرچاوەی تاوان و گوناه و سەرپێکردنی خوایە. پیاوی ئاینی ئامۆژگاریکار ئەوەی بیرچۆتەوە، وازهێنانی خەڵك لە ئامێری تەلەفزیۆن چیتر ناکرێ ببێ، ئەگەر دەتەوێت بە قسەت بکرێ، ئەوا پێویستە لەسەرت فەرمان بەشتێك بکەیت کە لە توانادا بێ، وا گونجاوە پیاوانی ئاینی و جگە لەوانیش لە

چـاکخوازان، کـار بکـەن لەسـەر ڕۆشـنبیرکردن و ڕێنـوێنی کردنـی خـەڵك بـۆ بەکارهێنانی تەلـەفزیۆن بەشێوەیەکی دروسـت، دیاریکردنی بەرنامـەی گونجـاو و سوودبەخش، جگە لەمانەش، سەبارەت بەوەی بە خـەڵك بڵێن واز لـە تەلـەفزیۆن بهێنن ئەوا ناچێتە عەقڵەوە.

عەلی وەردی دژی ئامۆژگارییە، ئەمە لە پیاوانی ئاینیەوە یان لە بیرمەنـدان و مامۆستایانەوە سەرچاوە بگرێ، پێی وایە ڕێگەی ئامۆژگاریکردن کە ئەو کەسانە قسەی پێدەکـەن کـە فێرخـواز و کاریگـەرن بـە هزرەکـانی خۆرئـاوا، جیـاواز نییـە لەوەی پیاوانی ئاینی پێی هەڵدەسـتن، چونکە هـەر دووکیـان بەشـتێك ئامۆژگـاری ناکـەن کـە بگـونجێ لەگـەڵ واقیعـی کۆمەڵایـەتی و دەروونـی خـەڵك، دەڵێـت: ((ئامۆژگاریکارە کاریگەرەکان بە فەرەنسییەکان، کەمترین لە جامانـە بەسـەرەکان، لە ئالودەبوونیان بە ئامۆژگاری بۆش و بەتاڵ... جامانە لەسەرەکان شانازی دەکەن بە ڕەوشتی پێشینە چاکەکان، کاریگەرەکان بە فەرەنسـیەکان شـانازی بـە ڕەوشـتی خۆرئاواییەکان دەکەن. هەر دووکیان دەیانەوێ ئامانجێك لە پێش خەڵکدابنێن، کە بە ڕێگەی ترساندن بەدەست نایەت)).

## کێشەی پێشینە چاکەکان :

چـەند ئامۆژگاریکارێـك دەرکـەوتن، بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کـە دەیانـەوێ کۆمەڵگە و خەڵك چاك بکەن، ڕێگەی ئەوان بۆ ئەمـە، ئەوەیـە کۆمەڵگـە و خـەڵك بگێڕنەوە بۆ دواوە و هەمان ئەو شتانە بکەن کە پێشینـە چاکەکان کردوویانـە، لـە گشت شتێکدا لاساییان بکەنەوە، لە گوفتار و ڕەفتار و تەنانەت لـە جل و بـەرگ و گوزەرانیشیاندا، بەڵگەشیان لەمەدا ئەوەیـە پێشـینە چاکەکان سـەرکەوتوو بوونـە،

ئەگەر سەرکەوتنمان بوێ دەبێ شوێن پێیان هەڵبگرین!! دکتۆر عەلی وەردی بەرپەرچی ئەم ئامۆژگاریکارو چاکخوازانە دەداتەوە، بەوەی دەڵێت: ((ئەمە لۆژیکێکی گاڵتەجارانەیە. موسڵمانە بەراییەکان سەرکەوتوون و دوار شکستیان هێنا. تەنها ئەوەمان بۆ هەیە لێکۆڵینەوە بکەین لە هۆکاری سەرکەوتن و شکستیان، بۆ ئەوەی پەندی لێوەربگرین)).

ئەگەر پیاوانی ئاینی پێیان وابێ پێشینە چاکەکان، خەڵکی چاکەکار و پارێزکار و پشتیوانانی خێر و دادگەرین، لە تێڕوانینی هەندێك کەسدا لە هەڵە و خلیسکان پارێزراون، ئەمە لە تێڕوانینی عەلی وەردیدا ڕەتکراوەیە، جا دەڵێت: ((ئەوەی لە ژیانی پێشینە چاکەکان بکۆڵێتەوە بەشێوەیەکی بابەتیانە، دەبینێ ئەوان وەك گشت خەڵك هەڵە دەکەن، ئیرەیی دەبەن، داوای ناوبانگ دەکەون... ئەوان وەك ئێمە مرۆڤ بووینە و دەیانخوارد و لە بازارەکاندا هاموشۆیان دەکرد، بەڵام ئامۆژگاریکاران وایان لەوان کردووە لە قەبارەی فریشتەکاندا بن، تا خەڵك هان بدەن لەسەر شوێن پێ هەڵگرتنی ئەوان لە ژیاندا)).

دکتۆر عەلی وەردی پێی وایە ئەگەر بمانەوێ سوود ببینین لە مێژوو، بەو پیاو و ڕووداوانەی تیایدان، ئەوا یەکەم جار پێویستە لەسەرمان هەڵسوکەوت پیاو و کەسەکانی بکەین، بەوەی کەسانی ئاساین و پارێزراو نین و لە فریشتەکان نین، تا ئەوەمان بۆ دەرەخسێ سوود و کەڵك لە ئەزموونەکەیان وەربگرین، چونکە ئەگەر ئەوان ڕاجیابن سەبارەت بەوەی ئێمە لەسەرینە لە سروشتی مرۆیی، ئەوا شوێن پێ هەڵگرتنیان و فێربوون لێیان دەبێتە جۆرێك لە خەیاڵ و شتی ئەستەم. بەم مانایە دەڵێت: ((ئێمە مێژوو دەتوێژینەوە بۆ ئەوەی سوود ببینین لەو پەندانەی تیایدان، کە ڕێگەی ئێستامان بۆ ڕوون دەکاتەوە. هێشتا ئێمە پێمان وایە

**هاوەڵان پاساكانی كۆمەڵگەی مرۆيـی لەسـەريان جێبـەجێ نـابن، هـەروەك چۆن لەسەر خەڵكی تر جگە لەوان جێبەجێ دەبێ، مێژووی ئەوان لە تێڕوانينی ئەواندا بوەتە پارچەيەك لە ڕووناكی و نوور و سەرنجەكان ڕادەكێشن. ئەگەر بيانكەين بە پێشەنگی خۆمان لەم سەردەمەماندا، ئەوا وامان لێدێت بەدوای ئامانجێكدا بـڕۆين ناگرێ پێی بگەين، بەمەش بەدوای تراويلكەدا دەڕۆيشن و هيچی تر نا)).**

## كاراكردنی ڕا و بۆچوونەكانی عەلی وەردی :

**لـەم دۆخانـەی ئێسـتادا، كـە كۆمەڵگـە عـەرەبی و ئيسـلاميیەكان پێيـدا دەگـوزەرێن، پێمـان وايـە گونجـاوە بـەڵكو پێويسـتە تێگەيشـتنەكانی دكتـۆر عـەلی وەردی و ڕا و بۆچـوونەكانی لـە نێـوان خەڵكـدا بڵاوببێتـەوە، چـونكە يارمـەتيان دەدات لەسەر تێگەيشتن لە ئايين و كەلەپور و پياوانی ئاينی خۆيـان، بەشـێوەيەك كە نەيانكات بە شوێنكەوتوو و لاساييكەرەوە، بەڵكو كەسانی هۆشيار سـەبارەت بـە ڕابـردوو و ئێسـتا و داهاتوويـان. ئـەركی ڕەواجـدان بـە هزرەكـانی عـەلی وەردی ئەركێكی ئاسان نييە، پياوانی ئاينی و جگە لەوانيش لە ئامۆژگاريكاران ڕازی نابن هزرەكانی عەلی وەردی بڵاوببنەوە، چونكە تێكدەگيرێ لەگەڵ بەرژەوەندييـەكانيان و پێگەكـەيان نـزم دەكەنـەوە، باشـترين بەڵگە لەسـەر ئـەوەی دەيڵێن، دەرچـوونی پێنـج كتێبە لە بەرپەرچی كتێبی (واعيزەكـانی سـوڵتان)، دوای ماوەيـەكی كـەم لـە نووسينی ئەم كتێبە، زۆربەيان لەلايەن پياوانی ئاينی نەريتيەوە بوونە.**

# چەند كۆسپێكى سەر ڕێگەى ئیسلامى نوێ

## چەند كۆسپێكى سەر ڕێگاكە:

لەسەر ئیسلامى تازە ئاسان نییە لە نێو خەڵكدا بڵاو ببێتەوە، لە سایەى دۆخى هەنووكە، كە بەشێوەیەكى مەزن بەوە تایبەتمەندە كە هزرى پەیڕەوى و ڕەخنەیى و داهێنانى نا ئامادە و ونە. ئیسلامى نوێ لەسەر بنەماى ڕزگار كردنى عەقڵ و ڕێزگرتن لە ڕاى جیاواز دەوەستێت، دواتر ڕەتكردنەوەى توندوتیژى و هەوڵدان بۆ دەستەبەركردنى لێبوردەیى مرۆیى و فرەیى ئاینى، ئەمانە چەند بنەما و بەهایەكن، ناگونجێن لەگەڵ عەقڵى تاكڕەوى قۆرخكەرى حەقیقەت، كە زاڵە بەسەر بیركردنەوە و گوتارى ئاینى نەریتیدا. ئەم ئامادەنەبوونە لە هزرى پەیڕەوى و ڕەخنەیى و داهێنانیدا، بەدیدى ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هۆكار، لەوانەیە گرنگترینیان بریتى بێ لە: لاوازى یان دواكەوتوویى دامەزراوەى فێركارى فەرمى بە قۆناغە جیاوازەكانیەوە، لە خوێندنى سەرەتاییەوە تا خوێندنى باڵا (ماستەر و دكتۆرا) لە بەرامبەر زاڵبوونى دامەزراوەى ئاینى نەریتى و گەورە بوونى ڕۆڵى پیاوەكانى.

## مرۆڤى بیرمەند:

دامەزراوە فێركاریەكانمان، لە قوتابخانە و زانكۆكان، كار دەكەن لەسەر دەرچوواندنى فێرخوازان نەوەك بیرمەند. جیاوازى نێوانیان گەلێك زۆرە، فێرخواز كۆمەڵێك لە زانیارى لە مێشكیدا لەبەر دەكات، بەڵام بیرمەند ئەم زانیاریانە دەگۆڕێت بۆ كەرستەى خاو بۆ داهێنان، ئەمەش لە میانەى ڕەخنە

لێگرتنی و جیاکردنـەوەی ڕاست لـە هەڵە، دواتـر بەیـەکتر بەستنەوەی ئەوانـەی ڕاستن بۆ داهێنانی زانیاری تازە. بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ بیرمەنـد بـێ، دەبـێ سـێ شێوە بیرکردنەوە فێر ببێ، ئەمانەن: بیرکردنەوەی پەیڕەوی و بیرکردنەوەی ڕەخنەیی و بیرکردنەوەی داهێنانی، دواتر دەتوانرێ بەرەنگاری هزری لادراو بکرێ بـە هێـز و چەسپاویەوە. کێشە ئەوەیە فێرخواز و ڕۆشنبیرەکانمان لـە مـاوەی دوور و درێـژی خوێندنیاندا، کە دەگاتە شازدە ساڵ، لە قوتابخانە و زانکۆ بەسەری دەبەن، ناتوانن ئەم سێ شێوازەی بیرکردنەوە فێر ببن، هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خوێندنی فـەرمی بـە ڕێگـەی پێگۆتنـەوەی دزێـو ئـەنجام دەدرێ، کـە قوتـابی دەکاتـە تـەنها ئامێرێك بۆ لەبەرکردنی زانیاری و کۆکردنەوەیان، دواتر گێڕانـەوەی زانیاریـەکان لە ڕۆژی تاقیکردنەوە، تەنها بە مەبەستی سەرکەوتن.

مرۆڤی فێرخواز کە بیرکردنەوەیەکی پەیڕەوی ڕەخنـەیی داهێنـەری نییـە، لە حەقیقەتی شتەکەدا نێچیرێکە بە ئاسانی دەکەوێتـە نـاو تـۆڕی پیـاوانی ئـاینی توندڕەو و قۆرخکار. ئامادەیە بۆ قبوڵکردنی هەر بیرۆکەیـەك و هـەر زانیاریـەك بێ ئەوەی توانای ئەوەی هەبێ ڕاست و هەڵەکەی بزانێ، یان ئەوەی سوودی تێدایە جیـای بکاتـەوە لـەوەی زیـانی تێدایـە. ئەمـە هەڵسوکەوت دەکـات لەگـەڵ ئـەوەی دەبیستێ و دەبینێ بەرێگەی وەرگر نەوەك ئەوەی تێدەگات و ڕەخنەگرە.

## دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی :

دەرەنجـامی چـاوەڕوانکراوی ئامـادە نـەبوونی مرۆڤـی بیرمەنـد لـە هـەر کۆمەڵگەیەکدا، بریتییە لە پاشکۆیەتی و لاساییکردنەوەی کوێرانەی گشت ئەوانەی جڵـەوی کاروبارەکـانی ژیـان دەگـرن. بـەهۆی کەمبوونـەوە و پاشەکشـەی ڕۆڵـی

ڕۆشنبیران لە کۆمەڵگەدا، لەگەڵ کەمی ژمارەکەیان، ژمارەیـەك لـە پیـاوانی ئـاینی دەرکەوتوون، کە دەسـتیان بەسـەر خەڵکدا گرتـووە و عەقڵەکانیان پڕکـردووە لـە هـزری ئـاینی توونـد و دواکـەوتوو، دواتـر دروسـتکردنی بـارودۆخی دەروونـی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری شڵەژاو، هەروەك لە وتارەکانی ڕابردوودا ڕوونمان کردەوە.

ئەو مرۆڤـەی ڕاهـاتووە هـەموو ئـەو شـتانە قبـوڵ بکـات، کـە پێـی دەوتـرێ، ناتوانێ بەرەنگاری هزری خوار و خێچ ببێتەوە، بەتایبەت ئەگەر لەلایەن پیـاوانی ئاینـەوە سەرچاوەی گـرتبێ، لەوانەیـە لەسـەر چـەمکی پـیرۆز پـەروەردە بـبێ، کە پێویستە گوێڕایەڵی بکرێ و ڕێزی بگیرێ، ئەمەش لەبەر ئەوەی (دەقی بیروباوەڕی و بنەمای شەرعی دەچێتە ناو کرۆکی هەست و لە کرۆکی هزرەکاندا جێگیر دەبێ، بەمەش عەقڵ لە تێگەیشتن پەکدەخات، دواتر هێزی پشکنینەکەی لـەکار دەخـات، بەمەش ملکەچی زۆربەی ئەو شـتانە دەبـێ کـە بیروباوەڕەکـە پێـی پـام یـان ڕوون نییە) ئەمەش بەپێی وتەی محەممەد سەعید عەشماوی.

## ڕزگارکردنی دامەزراوەی خوێندن و فێرکردن :

بێگومـان ڕزگـارکردنی دامــەزراوەی خوێنــدن و فێرکـردن، کــە دەنــاڵێنێ بەدەست تێکشکان و دواکەوتن، ئەمە هەنگاوی هەرە گرنگە، لە ڕزگارکردنی مـرۆڤ لە دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی توندڕەو و دواکەوتوو و فۆرخکەران. ئەم ڕزگارکردنە بـە وەرچـەرخاندنی دامـەزراوەی خوێنـدن و فێرکـردن دەبـێ لـە دامەزراوەیـەکی پێگۆتن بـۆ دامەزراوەیـەکی هزریـەوە. بـەو مانایـەی لـە پێگـۆتنی زانیاریـەکان بـە فێرخوازان وەربچەرخێ بۆ دامەزراوەیەك، فێرخوازەکانی مەشق پێ بکات لەسـەر

شێوازەکانی بیرکردنەوەی پەیڕەوی و ڕەخنەیی و داهێنانی. بەمەش تەنها دەتوانین تەنها مرۆڤێك بنیات بنێین، کە دەتوانێ ڕووبەڕووی دواکەوتن و توندڕەوی و فۆرخکردن ببێتەوە... مرۆڤێك توانای جیاکاری هەبێ لە نێوان ئایین و هزری ئاینی، ئایین و پیاوانی ئاینە... مرۆڤێك بتوانێ مانای ڕاستەقینەی وشەی شەریعەت بزانێت.. مرۆڤێك جیاوازی بکات لە نێوان حکومەتی خوایی و حکومەتی مرۆیی... جگە لەمانەش لە چەمکە وردە پەیوەستەکان بە ئاینەوە، کە بەبێ ئەم چەمکانە ئایین دەبێتە چەکێك بە دەستی کەمینەیەکی کەم، فۆرخکردنی ئایین دەداتە پاڵ خۆی و بەکاری دەهێنێ بۆ زاڵبوون بەسەر ئەوانی تردا.

پیاوانی ئاینی فۆرخکار و توندڕەو و دواکەوتوو توانیویانە زاڵ بن بەسەر کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا، کاتیك خوێندن و فێرکردن پاشکەوت لەوەتەی سەرەتای چارێکی کۆتایی سەدەی بیستەم. خوێندن توانی سەرکردەکانی ئەدەب و فەلسەفە و هونەر و زانست لە پۆلی یەکەم لە سەدەی بیستەم پێبگەیەنێ و ڕۆشنبیران بکات، دواتر پاشەکشەی کرد و وایلێهات تەنها کەسانی توندڕەو و تووتی ئاسای پێگەیاند، کە لەگەڵ گشت ڕەوتێك دەڕۆن، لەگەڵ هەر بایەك هەڵدەکەن، عەقڵ جڵەوگیریان ناکات، سۆز نایانپارێزێ لە کەوتنە ناو پیس و پۆخڵییەکانی توندڕەوی و بیرکردنەوە و تاوانی بیروباوەڕی.

لەوانەیە ئەگەر نەتوانین قوتابخانە و زانکۆکان ڕزگار بکەین، لە دەسەڵاتی فێرکردن بە پێکۆتن، ئەوا ناتوانین ڕزگارمان ببێ لە دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی. لەوانەیە ئەو خوێندنەی بیرمەندان بەرهەم دێنێت، تاکە ڕێگە بێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی فۆرخکەرانی حەقیقەت و سەرکردەکانی توندوتیژی. لەوانەیە

زیادەرەوی نەکەم ئەگەر بڵێم هەر حکومەتێك یان دامەزراوەیەك یاخود کۆمەڵەیەك بانگەشەی چاکسازی بکات، پێویستە سەرەتا بایەخ بە خوێند و فێرکردن بدات، بەپێچەوانەی ئەمە، هەر کارێك هەر چەندە مەزن بێ، ئەوەی لێ بەدەست نایەت کە هیوای پێدەخوازرێ. لە دیدی مندا چارەسەر بریتییە لە بایەخدان بە خوێندن و دانانی لە پێشەنگی گرنگی پێدانەکانمان، گوێزرانەوە پێی لە ئاستی پێگوتن بۆ ئاستی بیرکردنەوە. ئەم قسەیە پشتگیری دەکرێ لەلایەن لێکۆڵەر و توێژەرانی کاروباری وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی، بە گشت پسپۆریەکانی، چ پەروەردەیی یان کۆمەڵایەتی یاخود ئابووری یان سیاسی، ئەمە ئەو شتەیە کە نزیکەی گشت لێکۆڵەران لەسەر کۆکن.

# کۆتایی

خەریکە پیاوانی گشت ئاینێك بانگەشەی ئەوە دەکەن، ئەوان شایستەترن بە بەهەشتی خوا، ئەوانی تر تەنها دۆزەخیان بۆ هەیە. کەسی جولەکە پێی وایە خوا ئەوی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی ببێتە گەورەی خەڵك و خوا ویستوویەتی بەهەشت تەنها بەشی ئەو بێ. کەسی مەسیحی بڕوای وایە بڕوابوون بە عیسای مەسیح تاکە ڕێگەی ڕزگاربوونە، مرۆڤ هەر چەند کاری چاك بکات، ئەوا لێخۆشبوون بەدەست ناخات، بێ بڕوابوون بە ڕزگاری عیسا. موسڵمانیش پێی وایە ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئیسلامە، ئەوە بڕوای بە ئیسلام نەبێ، هەرگیز بۆنی بەهەشت ناکات.

لەوانەیە قۆرخکردنی بەهەشت، یەکێك بێ لە درێوترین وێنەکانی قۆرخکردنی حەقیقەت، کە پیاوانی ئاینی پیادەی دەکەن بە ناوی ئاینەوە. ئەوان تەنها ئاینی و بەهەشت قۆرخ ناکەن، بەڵکو خۆشەویستی خواش قۆرخ دەکەن. ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن ئەوان حەقیقەت و بەهەشت و دانایی و چاکە و ڕەوشت و خۆویستی خوا و بەهەشتەکەی ئەویان قۆرخ کردووە، ئەوان بەرپرسیاری یەکەمن لە پەکخستنی کاروانی مرۆیی بەرەو کامڵبوونی مرۆیی و گەیشتن بە ئاشتی جیهانی.

ئەوانەی بانگەشەی قۆرخکردنی حەقیقەت دەکەن، چ پیاوانی ئاینی یان سیاسی یاخود جگە لەوان، تەنها کاروانی ئێستا پەك ناخەن، بەڵکو ئەندێشەکانی مرۆڤیش پەکدەخەن بۆ دادگەری و کامڵبوون، کە مرۆڤایەتی هەوڵی بۆ دەدات، لەوەتەی لەسەر زەوی هەیە. پێیان وایە دادگەری تەنها خۆشەویستی و لێبوردەیی و دانپێدانان بە دژەڕاکە ناهێنێ، بەڵکو زاڵبوون بەسەریدا و شاردنەوەی لە جیهانی بووندا ئەمە دادگەری دەهێنێ. ئەندێشەی ئەوە ناکەن خەڵك بە ئاشتیانە بژین سەرباری ڕاجیابوونیان، هەر بۆیە وێنەیەك دەکێشێن لەبارە کامڵی و دادگەری،

سەرچاوەكەى ئەومبێ ئاينێك سەربكەوێ بەسەر ئـەوانى تـردا، لەبـەر ئـەوەى ئـەم ئەركە سەختە و بەڵكو ئەستەمە بە گەواهيدانى واقيع، هيچيان لەبەردەم خۆياندا نەبينى تەنها ئەوەنەبێ كەسێك بەم ئەركە هەڵسێ دەرئاسا و بەرزتر بێ لە ئاستى مرۆڤى ئاسايى، ناويان لەو كەسە نا (ڕزگاركەر)، كە زەوى پڕ دەكات لە دادگەرى و يەكسـانى، دواى ئـەوەى پـڕ ببـوو لـە سـتەم و زۆردراى. جولەكـە و مەسـيحى و موسڵمان قسە دەكەن لەبارەى دەرچوونى ڕزگاركەرێك، كە دادگەرى بەرپا دەكات و زاڵ دەبێت بەسەر سـتەم، ئـەم ڕزگاركـەرە مسـيا يـان مەسـيح يـاخود مەهـدى بـێ، هەمووان پێيان وايە ئـەم دادگەريـە تـەنها لـە دواى جـەنگێكى كارەسـاتبار دێ، كـە گيانەكان تيايدا دەكێشرێن بە ڕێژەيەكى زۆر و ڕووبارى خوێند دەڕژێن، ئەمـە چ دادگەريەكـە كـە دابمـەزرێ لەسـەر بنچينەى توونـدوتيـژى و كوشـتن و قـڕ كـردن، لەسەر ڕووبارەكانى خوێن و مليۆنان گيان؟!

نـاكرێ بـە ئاشـتيانە لەگـەڵ يـەكتر بـژين، بـە ئاشـتيانە و خۆشەويسـتى و ڕێزەوە، مادەم خاوەنى هەر ئاينێك پێى وابێ ئەو ڕاستى ڕەهاى قۆرخ كردووە، كـە هيچ كرچ و كاڵيەكى تێدا نييە، ئەوەى دژەرايـەتى لـە ئـايين و بيروبـاوەڕ و ئيمـان تـەنها گـومڕايى ڕەهـاى هەيـە، كـە هـيچ خێـر و ڕاسـتيەكى تێـدا نييـە. بيرۆكـەى قۆرخكردنى هەر ئاينێك بۆ حەقيقەت بەدەر لە ئاينەكانى تر، بيرۆكەيەكە تـەنها كاوڵكارى بۆ مرۆڤايەتى دەهێنێت، ئەمە هەرگيز تێكناگيرێ لەگەڵ بيرۆكەى ئەوەى حەقيقەتى لەلايە، كـە ئيمـانى لەسـەر بنيـات دەنـرێ، قـۆرخ كـردن جيايـە لـەوەى لەلات بێت، بڕوابوون بەوەى حەقيقەت لايە ڕێگر نابێ لەوەى بڕوات وابێ جگە لە تۆش حەقيقەتى لايە، بەڵام قۆرخكارى ڕێگە بەمە نادات، ئەمەش كێشەكەيە.

بە كورتى، مەبەستمان لـەم كتێبـە ئەوەيـە بڵێين قـۆرخ كردنـى حەقيقـەت بريتييە لە بيروباوەڕێكى هەڵە و زيانبەخش و پوچەڵ، تەنها كاوڵبوون و كارەسات

بۆ مرۆڤايەتی دەهێنێت، ئەمە بیروباوەڕێکە لەلای زۆربەی خەڵك بڵاوە، جا چ پیاوانی ئاینی یان سیاسی یاخود جگە لەمانە بن، بەڕای ئێمە ئەوەی لە هەمووان کاریگەرتر و زیانبەخش و ترسناکترە بەتایبەت لەم کاتەی ئێستاد بریتییە لە پیاوانی ئاینی و شوێنکەوتووانیان، چونکە ئەوان مەبەستیان لە قۆرخ کردنی حەقیقەت، قۆرخکردنی خوا و بەهەشت و میهرەبانی و لێخۆشبوون و خۆشویستنیەتی. زۆر بە سادەیی ویستمان بڵێین بە پیاوانی ئاینی، ئێوە حەقیقەت قۆرخ ناکەن، نە ئێوە و نە هیچ کەسێکی تر لەسەر ڕووی ئەم زەمینە.

واسق غازی
٢٠٠٧/١٢/٦

**ئەسڵی ئایین (هەموو ئایینەکان) بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی هاتوون، خودی ئایین (پەیام) پێویستی بە خزمەتی مرۆڤ نیە، خۆی گەورەیە، تەواوە، موتلەقە، لەوەوە بنەمای تۆبزی نیە لە ئایین ئەگەر تۆبزی هەبوو ئەوا ئایین پێوستی بە مرۆڤە..؟؟؟**

چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر